# جواهر سنن ابن ماجە

## بەکوردی

ئامادەکردنی: سیروان کاکە أحمد
وەرگێڕانی: ستافی پیت
هەڵەچن و ڕێنووس: بڕیار هێرۆیی
دیزاینی ناوەوە: بڕیار هێرۆیی
دیزاینی بەرگ: إخلاص دیزاین
چاپـی یەکـەم: ١٤٤٥ك - ٢٠٢٤ز
٤٩٩ لاپـــــەڕە
٢٤ × ١٧ ســـم
بابـەت: ئـاینی

لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان - هەرێمی کوردستان
ژمارە سپاردنی (٢٩٦)ی ساڵی (٢٠٢٤)ی پێ دراوە

جواهر كتب الستة بەكوردی (٤)

# جواهر سنن ابن ماجه

## بەكوردی

ئامادەكردنی

**سیروان كاكە أحمد**

وەرگێڕانی

**ستافی پیت**

# سیفەتەکانی و شکۆ و گەورەیی ﷺ

ئەگەر هەر یەکێک لە ئێمە بەهۆی سیفەتێک یاخود دوو سیفەت و ڕەوشتی جوان ڕێز و پێگەیەک لە دڵی خەڵک پەیدا بکات، ئەو یەک دوو سیفەتە ڕێزداری بکات، ئایا بۆچوونت چۆن دەبێت بەرانبەر ڕێز و پێگە و گەورەیی پێغەمبەری خوا ﷺ، کە هەرچی سیفەتی شکۆ و مەزنی و گەورەیی هەیە، لە زاتی ئەودا کۆ بۆتەوە، وەک:

پلەوپایەی پەیام و پەیامبەری، خوللەت و مەحەببەت، پاڵفتەیی، شەوڕۆیی، مەقامی قوڕب، شەفاعەت، وەسیلە و فەزیلە، مەقامی مەحموود، بوڕاق، بەرزبوونەوە بۆ ئاسمان، ڕەوانەکرانی بۆ تەواوی مرۆڤایەتی، بەرنوێژیکردنی بۆ پێغەمبەران، شایەتی بۆ درانی لەلایەن پێغەمبەران و ئوممەتانیان، گەورەی هەموو وەچەی ئادەم، هەڵگری ئاڵای حەمد، ڕەوانەکرانی بەڕەحمەت بۆ هەموو جیهانییان، ڕازیکرانی لە قیامەت لەلایەن خواوە، حەوزی کەوسەر، نیعمەت و بەخشش بۆ تەواوکرانی[١]، چاوپۆشی لێکران و لێخۆشبوونی لەوەی پێشتر کردوویەتی و ئەوەیشی لە داهاتوودا دەیکات[٢]، سینە فراوانکرانی[٣]، ناو بەرزکرانەوە و شۆرەت پەیداکرانی، پشتیوانی لێکرانی بە فریشتەکان، حیکمەت و شەریعەت و فاتیحە و قوڕئان پێدرانی، صەڵاوات لەسەر درانی لەلایەن خوا و فریشتەکان، سوێندخواردن بە تەمەنی موبارەکی،

...................

١- ئامازەیە بۆ ئایەتی: {وَيُتِمُّ نِعْمَتَهُ عَلَيْكَ} یوسف: ٦.

٢- ئامازەیە بۆ ئایەتی: {لِّيَغْفِرَ لَكَ اللَّهُ مَا تَقَدَّمَ مِن ذَنبِكَ وَمَا تَأَخَّرَ} الفتح: ٢.

٣- ئامازەیە بۆ سوورەتی (إنشراح).

وەڵامدرانەوەی داواکانی، قسەکردنی لەگەڵ بێگیان و گیانداران، هەڵقوڵینی ئاو لە نێوان کەلێنی پەنجەکانی، مانگ بۆ شەق کرانی، سەرخرانی بەترس خرانە نێو دڵی دوژمنانی، سێبەر بۆ کرانی لەلایەن هەورەکانەوە، تەسبیحاتکردنی چەو و وردەبەرد لەنێو لەپی دەستە موبارەکەکانی، پاراستنی لە زیانپێگەیاندنی لەلایەن خەڵکەوە ... شکۆ و مەزنی و گەورەییەکەی لە ئاستێکە هیچ کەسێک ناتوانێت وەک ئەوەی شایستەیە ئامازەیان پێ بکا و یەک لەدوای یەک باسیان بکات. بەدەر لەو خوایە تاکوو تەنهایەی پێی بەخشیوە و فەزڵی لەگەڵ کردووە، هیچ مرۆڤێک ناتوانێت پەی بە خەسڵەتە مەزنەکانی ببات و بەئاسانی درکیان بکات.

# چەند ڕێنماییەکی پێویست بۆ خوێنەری خۆشەویست

خوێنەری بەڕێز:

١. کاتێك فەرموودەکانی نێو ئەم پەرتووکە دەخوێنیتەوە بەخێرایی بەسەریدا گوزەر مەکە و بچیە سەر خوێندنەوەی فەرموودەیەکی دیکە، وە بیر لە مانای فەرموودەکان بکەوە و لە کاتی تێنەگەیشتن یان ناڕوونییەك بگەڕێوە بۆ سەرچاوەکانی ڕوونکردنەوەی فەرموودە، چونکە فەرموودە هەیە مانای ناڕوونە لە شوێنی دیکە ڕوون کراوەتەوە، فەرموودە هەیە بەکورت و پوختی هاتووە لە شوێنێکی دیکە تەفصیلی پێ دراوە، کە ئەم کتێبەت خوێندەوە بەجوانی لەو قسانە تێدەگەیت.

٢. پاشان بزانە فەرموودەکان بەزۆری وەك شیفا و چارەسەر وان بۆ نەخۆش یان بۆ هەر کەسێك پێویستی بەو دەرمان و چارەسەرانە هەیە، بێگومان چارەسەریش دەبێت کەسێکی پسپۆڕ لەو بوارەدا بۆ کەسی پێویست دیاری بکات، ئەگەرنا بەکارهێنانی فەرموودەکان بەبێ ئاگاداربوون لە زانستە شەرعییەکان، یان بەبێ پرس و ڕاوبۆچوونی کەسانی شارەزا، لەوانەیە خاوەنەکەی تووشی هەڵە بکات و سەرەنجام تووشی پەشیمانی ببێتەوە لە هەندێك کردار و گوفتار کە ئەنجامی داون بەهۆی هەڵە تێگەیشتن لە فەرموودەکان.

٣. تکایە بە هیچ جۆرێك فەتوا و بۆچوونی خۆت لەسەر ڕواڵەتی فەرموودەکان دەرمەبڕە، چونکە دڵنیات دەکەینەوە، بەبێ هەبوونی بنچینەکی تۆکمە لە زانستی شەرعی و گەڕانەوە بۆ زانایانی فەرموودە تووشی هەڵەی گەورە دەبیت.

لەگەڵ ڕێزدا

ستافی پیت

# پێشەكی

بێگومان سوننەت وەك سەرچاوەی دووەمی شەریعەتی ئیسلام زۆر جێگای بایەخ و گرینگپێدانی موسوڵمانە، گەیشتن بە سەرچاوەكانی سوننەتیش كە لە سەرچاوە سەرەكییەكانی كتێبەكانی فەرموودە بەرجەستەیە، كارێكی ئاسان نییە، لە سۆنگەی هەستكردن بە بەرپرسیارییەتی و گرتنبەری ڕێگایەكی ئاسان بۆئەوەی موسوڵمانان لە هەر شوێنێكی دونیا بتوانن بەسانایی دەستیان بگات بە فەرموووەكانی خۆشەویستمان  و سوودی لێ وەربگرن و لە ژیانی ڕۆژانەیان كاری پێ بكەن، هەڵسام بە خوێندنەوە و كورتكردنەوەی هەر شەش كتێبی شەش زانا ناودارەكانی فەرموودە، بەڕێزان و پێشەوایانمان:

پێشەوا بوخاری و پێشەوا موسلیم و پێشەوا ئەبو داود و پێشەوا تیرمیزی و پێشەوا نەسائی و پێشەوا ئیبن ماجە (ڕەحمەتی خوای میهرەبانیان لەسەر بێت).

لەسەرخۆم كردە مەرج جگە لە فەرموودەی (صحيح) نەهێنم و تەنانەت خۆم پاراست لە فەرموودەی (حسن)یش، كە بێگومان لەلای زانایان كاری پێ دەكرێت (مقبولە)، بەڵام خۆپاراستنم بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە نەكەومە نێو كێشە و ڕاجیایی زانایان لەسەر حوكمی زانایانی فەرموودەناس بۆ پلەی فەرموودەكە.

پاشان ناوم لێ نا (جواهر)، واتە: گەوهەرەكان، بۆ ئەوەی بواری ڕەخنە كەمتر ببێتەوە لە بەندە و لە كارەكەی، ئێمە بانگەشەی ئەوە ناكەین خوێندنەوەی هەر یەكێك لەو كتێبانە جێگرەوەی كتێبە بنەڕەتییەكە بێت، بەڵام دەتوانین بڵێین زۆرترین فەرموودەی (صحيح)ـی ناو ئەو كتێبانە دەرهێنراون بە شێوەیەك ئاسان بێت بۆ خوێندنەوە و لەبەركردن و ئاسانكردنی دەستاودەست پێكردنی كتێبەكان لەنێو خەڵكدا.

ئەوەی توانراوە هەوڵ دراوە و کراوە، ئەوەی نەکراوە داواکارم بە پشتیوانی خوا لە چاپەکانی داهاتوو بە پێشنیاری دڵسۆزانەی موسوڵمانان بتوانین پڕۆژەکە باشتر و جوانتر بکەین و بەرەو پێشتری ببەین، کارێك بکەین شایستە بێت بە بێژە و پیت و وشە و ڕستانێك کە تێکهەڵکێشی هەناسەکانی ئەم زاتە پاکە موبارەکەن ﷺ.

لە کۆتاییدا دەمەوێت لە ناخی دڵمەوە سوپاس و پێزانینی خۆم ئاڕاستەی ستافی پڕۆژەی (پیت) بکەم بۆ ئەو هەوڵ و کۆششە بەردەوامەیان لە خزمەتکردن و سەرخستنی ئەم پڕۆژە موبارەکە و لە ناخەوە سوپاسی ئەو (محسن) و چاکەکار و سەربازە ونانەش دەکەم هاوکارمان بوون بۆ بەچاپگەیاندنی ئەم کتێبە ناوازانە و خوا بەباشترین شێوە پاداشتی هەمووومان بداتەوە و هەر خۆی وەرگری کردەوە چاکەکانە و پاداشتیش دەداتەوە، چونکە دڵنیاین کردەوەی باشی چاکەکاران زایە ناکات.

سیروان کاکە أحمد

هەولێر

٢٠٢٤\٢\٢ ز

# بەرنامەی کارکردنمان لەم پڕۆژەیە:

١. بۆ دەرهێنانی دەقی فەرموودەکان و ناونیشانەکان پشتمان بەستووە بە باشترین ئەو چاپ و نوسخانەی لەبەر دەست بوون.

٢. لە هەر شەش کتێب دەستکاری (کتاب) نەکراوە نە بە دەستکاریکردن و نە بە لابردن (حذف)، هەر پێشەوایەك لە نووسراوەکەی چەند (کتاب)ی وەك عینوان هێناوە دامانناوەتەوە وەك خۆی.

٣. سەرجەم فەرمووده (ضعیف) و (حسن)ەکانمان لابردوون، سەرباری لابردنی کۆی فەرموودە دووبارەکانی نێو کتێبەکان.

٤. هەر فەرموودەیەك (سبب ورود)ی لەگەڵ بووبێت هێناومانە، ئەمەش لەپێناو باشتر تێگەیشتن لە فەرموودەکە و زووتر گەیشتن بە مەبەستی گوترانەکەی یان ئەنجامدرانەکەی، جا فەرموودەکە (مرسل) بووبێت، یان (موقوف) بووبێت، یان (مرفوع).

٥. بۆ وەرگێڕانی کوردییەکە سوودمان بینیوە لە کۆی کتێبەکانی پڕۆژەی پیت، بەڵام بەهۆی دەستکاریکردنی زۆری وەرگێڕانەکەوە نەمانتوانی ناوی هیچ وەرگێڕێك بنووسین، بۆیە لێرەوە زۆر سوپاس و پێزانینیان ئاڕاستە دەکەین و ئەوانیش خاوەنی ئەم پاداشتە نەبڕاوەن (إن شاء الله).

٦. لە دەقی عەرەبیدا هەر فەرمایشتێکی پێغەمبەر ﷺ بە ڕەنگی سوور نووسراوە و خراوەتە نێو دوو جووت کەوانەی بچووکەوە - « » -، بەهەمان شێوە لە واتا کوردییەکەشیدا خراوەتە نێو دوو جووت کەوانەوە و هەر بە ڕەنگی ڕەش نووسراوە.

٧. لەنێو وەرگێڕانە کوردییەکەدا لە هەر شوێنێك پێویست بە ڕوونکردنەوەی کورتی وەرگێڕ بووبێت، لەنێو دوو کەوانەی - ( ) - ڕەشدا ڕوونکردنەوە و شەرح نووسراوە.

٨. لە هەندێك شوێن ڕوونكردنەوەی زیاتر پێویست بووە نووسراوە (تێبینی:) و لە خوارەوە ڕوونكردنەوەكەی نووسراوە.

# پوختەی ژیانی ئیمام ئیبن ماجه رحمه الله

**ناسنامه:**

ناوی تەواوی: ناوی تەواوی ئەو شاخە بەرزەی زانست بریتییە لە موحەممەدی کوڕی یەزیدی قەزوینی ئیبن ماجەی ڕیبعی.

کونیەکەی: (ئەبو عەبدوڵڵا)یە.

بەناوبانگە بە: ئیبن ماجە.

ئیمام فەیرۆز ئابادی گوتوویەتی: (ماجە) نازناوی باوکی موحەممەدی کوڕی یەزیدی قەزوینییە کە خاوەنی سونەنە، نەک ناوی باپیری بێت.

ڕافیعیش بە هەمان شێوە دەڵێت: (ماجە) نازناوی یەزیدە، ناوێکی فارسییە، هەندێکیش دەڵێن: موحەممەدی کوڕی یەزیدی کوڕی ماجە، (واتە: ماجە دەکەن بە ناوی باپیری نەک نازناو بۆ باوکی)، بەڵام یەکەمیان ڕاسترە.

وە بۆچوونێکی دیکەش هەیە دەڵێت: ماجە ناوی دایکیەتی.

نیسبەتەکەی: (قەزوینی)یە، کە ناوچەیەکی بەناوبانگە لە ئەصفەهان.

ساڵی لەدایکبوونی: ئیمام ئیبن ماجە لە ساڵی (٢٠٩)ـی کۆچی لەدایک بووە.

گەشتە زانستییەکانی: ئیمام ئیبن ماجە وەک هەر زانایێکی باڵا، خۆرئاسا بەدەوری جیهاندا سووڕاوەتەوە، بۆ ئەوەی تیشکی زانستەکەی گشت سنوورێک ببڕێت، بۆ ئەو مەبەستەش چۆتە عێراق (بەسرە و کوفە و بەغدا) و مەککە و شام و میسر و حیجاز و ڕەی، بۆ فێربوون و نووسینەوەی فەرموودەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ.

**مامۆستاکانی:**

بەدڵنیایی هیچ کەسێک نییە زانستی ڕەسەن و تۆکمە بەدەست بێنێت حەتمەن دەبێت لە خزمەت زانایانی دەریائاسا چۆک دابدات و کەشتی زانستەکەی لەنگەر نەدات تا گشت ئەو مروارییانەی بوونیان هەیە لەو دەریایە بێبنانە دەریدەکات و دەیخاتە بەر چاوی کڕیارانی ئەو زانستە، جا ئیمامی ئیبن ماجەش یەکێک لەو زانایانە بووە کە لە خزمەتی چەندەها زانای شارەزا و عاریف خوێندوویەتی، وەک ئەمانەی خوارەوە:

١. علي بن محمد الطنافسي.
٢. جبارة بن المغلس.
٣. مصعب بن عبد الله الزبيري.
٤. سويد بن سعيد.
٥. عبد الله بن معاوية الجمحي.
٦. محمد بن رمح.
٧. إبراهيم بن المنذر الحزامي.
٨. محمد بن عبد الله بن نمير.
٩. أبو بكر بن أبي شيبة.
١٠. هشام بن عمار.
١١. يزيد بن عبد الله اليمامي.
١٢. أبو مصعب الزهري.
١٣. بشر بن معاذ العقدي.
١٤. حميد بن مسعدة.
١٥. أبو حذافه السهمي.
١٦. داود بن رشيد.
١٧. أبو خيثمة.
١٨. عبد الله بن ذكوان المقرئ.
١٩. عبد الله بن عامر بن برّاد.
٢٠. أبو سعيد الأشج.
٢١. عبد الرحمن بن إبراهيم دحيم.
٢٢. عبد السلام بن عاصم الهسنجاني.

٢٣. عثمان بن أبي شيبة.

**قوتابییەکانی:**

ئیمام ئیبن ماجه ﷺ دوای ئەوەی ئەو هەموو دەریایەی زانستی ڕژاندە نێو دەریاکەی خۆی، بوو بە زەریایەک هەموو فێرخوازێک خەونی بوو بگات بە دیداری، چ جای ئەوەی ببێتە قوتابی و چۆک دابدات لە خزمەتی، بۆیە لە گشت لایەک فێرخوازان و قوتابییانی فەرمووده دەشت و کێویان دەبڕی بۆ گەیشتن بە زانستەکەی، کە ئەمانە بەشێکن لە قوتابییەکانی:

١. إبراهيم بن دينار الحوشبي الهمذاني.
٢. أحمد بن إبراهيم القزويني.
٣. أبو الطيب أحمد بن روح البغدادي الشعراني.
٤. أبو عمرو أحمد بن محمد بن حكيم المديني الأصبهاني.
٥. إسحاق بن محمد القزويني.
٦. جعفر بن إدريس.
٧. الحسين بن علي بن يزدانيار.
٨. سليمان بن يزيد القزويني.
٩. أبو الحسن علي بن إبراهيم بن سلمة القزويني القطان.
١٠. علي بن سعيد بن عبد الله العسكري.
١١. محمد بن عيسى الصفار.

زۆرێکی دیکەش ...

**پەرتووکەکانی:**

١. سنن ابن ماجه.
٢. التفسير، کە زۆر گەورە بووە، بەڵام بەداخەوە نەماوە.
٣. التأريخ، کە پەرتووکێکی مێژوویی زۆر چاک بووە مێژووی نووسیوەتەوە لە سەردەمی هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ تا سەردەمی خۆی، بەڵام بەداخەوە نەماوە.

**دەربارەی پەرتووکەکەی (سونەنی ئیبن ماجە):**

سونەنی ئیبن ماجە لە پلەی شەشەم دێت دوای: صەحیحی بوخاری و صەحیحی موسلیم و سونەنی نەسائی و سونەنی تیرمیزی و سونەنی ئەبو داود، ئەوەش لەبەر بەهێزی و چاکی و ڕێکی و جوان داڕشتنی پەرتووکەکەیە، بە بەراورد لەگەڵ پەرتووکەکانی دیکەی فەرموودە، کە ژمارەیان ئێجگار زۆرە، ئەوەش فەزڵێکی گەورەی خوای پەروەردگارە کە پەرتووکەکەی بە یەکێک لە پەرتووکە هەرە گرینگەکانی ئیسلام ئەژمار کراوە، بۆیە پێویستە موسوڵمانان زۆر گرینگیی پێ بدەن.

**وتەی زانایان دەربارەی ئیمام ئیبن ماجە ﷺ:**

ئیمام ئیبن کەسیر دەڵێت: موحەممەدی کوڕی یەزیدی کوڕی ماجە خاوەنی پەرتووکی سونەنی بەناوبانگە، کە بەڵگەیە لەسەر کردار و زانست و ڕۆچوون لە دەریای زانست و ئاگاداربوونی لە زانست و شوێنکەوتەیی بۆ سوننەت و ڕێبازی پێغەمبەری خوا ﷺ لە ئوصوڵ و فرۆعدا، کە سی و دوو پەرتووکی لەخۆ گرتووە، وە هەروەها هەزار و پێنج سەد بابەت و چوار هەزار فەرموودە لەخۆی دەگرێت، هەمووی فەرموودەی چاکن تەنها کەمێکیان نەبێت.

ئیمام ئیبن خەلەکان دەڵێت: ئیمامە لە فەرموودە و شارەزایە بە زانستەکانی و گشت ئەوەی پەیوەستە پێیەوە.

ئیمام زەهەبی دەڵێت: ئیبن ماجە حافیز و ڕەخنەگر و ڕاستگۆ بوو، زانست فراوان بوو ...).

ئیبن ناصرالدین دەڵێت: موحەممەدی کوڕی یەزیدی کوڕی ماجە یەکێکە لە پێشەوایە بەناوبانگ و دیارەکان، خاوەنی سونەنە، کە یەکێکە لە پەرتووکەکانی ئیسلام، حافیزێکی جێی متمانەی گەورەیە.

وە ئەبو یەعلا خەلیلی کوڕی عەبدوڵڵای خەلیلی قەزوینی دەڵێت: ئیبن ماجە زانایەکی جێی متمانەی گەورەیە، کۆدەنگیی لەسەرە، بەڵگەی پێ دەهێندرێتەوە،

خاوەنی شارەزایی و حیفزە، زانایە لە بواری فەرموودە، خاوەنی چەندین پەرتووکە.

**کۆچی دواییکردنی:**

ئەو خۆرە مەزنە دوای جێهێشتنی پەرتووکە مانگئاساکەی لە ساڵی (٢٧٣)ـی کۆچی لە ڕەمەزاندا کە هەشت ڕۆژی مابوو تەواو ببێت لە ڕۆژی دووشەممە کۆچی دوایی کرد و ڕۆژی سێشەممە نێژرا.

جا موحەممەدی کوڕی ئەسوەدی قەزوینی لەتاوان بەم شیعرە پیایدا هەڵگوت:

لقد أوهى دعائم عرش علم وضعضع ركنه فقد ابن ماجه

واتە: کورسی زانست پێچکەکانی لاواز بوون و پایەکانی کەوتن بە لەدەستدانی ئیبن ماجە.

هەزاران هەزار ڕەحمەت لەو زانایە خواناس و لێوانلێو لە زانستە کە پڕشنگی ڕوناکییەکەی ئەوەتا دەکەوێتە هەموو ماڵێکی شەرعدۆست، خوای پەروەردگار پاداشتی بێ بڕانەوەی پێ ببەخشێت - آمين يا مجيب السائلين -.

خوای گەورە بە باشترین شێوە پاداشتی بداتەوە بۆ ئەو خزمەتەی کە پێشکەشی ئیسلام و موسوڵمانانی کرد.

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

وَصَلَّى اللهُ عَلَى سَيِّدنَا مُحَمَّد وآلِهِ وَصَحْبِهِ وَمُحِبِّيهِ

# كِتَابُ المُقَدِّمَة

# پەرتووکی پێشەکی



## بَابُ اتِّبَاعِ سُنَّةِ رَسُولِ اللَّه ﷺ

### باسی هاندان لەسەر شوێنکەوتنی پێغەمبەر ﷺ

١. عَنْ أَبِي هرَيْرَةَ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه ﷺ: «مَا أَمَرْتُكُمْ بِه فَخُذُوه، وَمَا نَهيْتُكُمْ عَنْه فَانْتَهوا».

ئەبو هورەیرە ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «فەرمانم بە هەر شتێک پێ کردن (بەپێی توانا) جێبەجێی بکەن، وە هەر شتێکیشم لێ قەدەغە کردن، وازی لێ بهێنن».

٢. عَنْ أَبِي هرَيْرَةَ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه ﷺ: «مَنْ أَطَاعَنِي فَقَدْ أَطَاعَ اللَّه، وَمَنْ عَصَانِي فَقَدْ عَصَى اللَّه».

ئەبو هورەیرە ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «هەر کەسێک گوێڕایەڵی

(ی فەرمانەکانم) بکات، ئەوە فەرمانبەرداریی خوای کردووە، وە هەر کەسێکیش سەرپێچی (ی فەرمانەکانم) بکات، ئەوە سەرپێچیی خوای کردووە».

٣. عَنْ أَبِي جَعْفَرٍ ﵁ قَالَ: كَانَ ابْنُ عُمَرَ ﵄ إِذَا سَمِعَ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ حَدِيثًا لَمْ يَعْدُه، وَلَمْ يُقَصِّرْ دُونَه.

ئەبو جەعفەر ﵁ دەڵێت: کاتێک ئیبن عومەر ﵄ فەرموودەیەکی دەبیست لە پێغەمبەری خوا ﷺ هیچ زیاد و کەمی بە فەرموودەکە نەدەکرد (وەک خۆی دەیگێڕایەوە و کاری پێ دەکرد).

٤. عَنْ مُعَاوِيَةَ بْنِ قُرَّةَ، عَنْ أَبِيه ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه ﷺ: «لَا تَزَالُ طَائِفَةٌ مِنْ أُمَّتِي مَنْصُورِينَ، لَا يَضُرُّهمْ مَنْ خَذَلَهمْ حَتَّى تَقُومَ السَّاعَةُ».

موعاویەی کوڕی قوڕڕە لە باوکیەوە ﵁ دەگێڕێتەوە، گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «بەردەوام (تا کۆتایی دونیا) کۆمەڵە کەسانێک لە ئوممەتی من بەسەرکەوتوویی دەمێننەوە (لەسەر هەق)، ئەوانەی کە یارمەتییان نادەن (یان دژایەتییان دەکەن) ناتوانن هیچ زەرەرێکیان پێ بگەیەنن، تا هاتنی ڕۆژی دوایی».

٥. عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّه ﵄ قَالَ: كُنَّا عِنْدَ النَّبِيِّ ﷺ فَخَطَّ خَطًّا، وَخَطَّ خَطَّيْنِ عَنْ يَمِينِه، وَخَطَّ خَطَّيْنِ عَنْ يَسَارِه، ثُمَّ وَضَعَ يَدَه فِي الْخَطِّ الْأَوْسَطِ، فَقَالَ: «هذَا سَبِيلُ اللَّه»، ثُمَّ تَلَا هذِه الْآيَةَ: «{وَأَنَّ هـٰذَا صِرَاطِي مُسْتَقِيماً فَاتَّبِعُوه وَلَا تَتَّبِعُوا السُّبُلَ فَتَفَرَّقَ بِكُمْ عَن سَبِيلِه} الأنعام: ١٥٣».

جابیری کوڕی عەبدوڵڵا ﵄ دەڵێت: لە خزمەت پێغەمبەر ﷺ بووین، ڕاستەهێڵێکی کێشا، دوو ڕاستەهێڵی دیکەی کێشا لەلای ڕاستی (ڕاستەهێڵەکە)، دوو ڕاستەهێڵی دیکەی کێشا لەلای چەپی (ڕاستەهێڵەکە)، پاشان دەستی لەسەر ڕاستەهێڵەکەی نێوەڕاست دانا و فەرمووی: «ئەوە ڕاستەڕێی خوایە»، پاشان ئەو ئایەتەی خوێندەوە «{وَأَنَّ هـٰذَا صِرَاطِي مُسْتَقِيماً فَاتَّبِعُوه وَلَا تَتَّبِعُوا السُّبُلَ فَتَفَرَّقَ بِكُمْ عَن

سَبِيلِه}، واته: (فەرمانی داوە کە) بێگومان ئەمە ڕێگای ڕاستی منە کە ڕاست و دروستە، کەواتە شوێنی بکەون و شوێنی ڕێچکەکانی دیکە مەکەون، چونکە دوورتان دەخەنەوە و لاتان دەدەن لە ڕێگەی خوا».

## بَابُ تَعْظِيمِ حَدِيثِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، وَالتَّغْلِيظِ عَلَى مَنْ عَارَضَه

## باسی بەگەورەدانانی فەرمموودەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ و هەڕەشەی توند لەسەر بەرهەڵستکارانی

٦. عَنِ الْمِقْدَامِ بْنِ معْدِ يكَرِبَ الْكِنْدِيِّ ﷺ: أَنَّ رَسُولَ اللَّه ﷺ قَالَ: «يُوشِكُ الرَّجُلُ مُتَّكِئًا عَلَى أَرِيكَتِه، يُحَدَّثُ بِحَدِيثٍ مِنْ حَدِيثِي، فَيَقُولُ: بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمْ كِتَابُ اللَّه ﷻ، فَمَا وَجَدْنَا فِيه مِنْ حَلَالٍ اسْتَحْلَلْنَاه، وَمَا وَجَدْنَا فِيه مِنْ حَرَامٍ حَرَّمْنَاه، أَلَا وَإِنَّ مَا حَرَّمَ رَسُولُ اللَّه ﷺ مِثْلُ مَا حَرَّمَ اللَّه».

میقدامی کوڕی مەعدی یەکریبی کیندیی ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «نزیکە (ڕۆژێک بێت) کە پیاوێک پاڵ بکەوێت لەسەر جێگەکەی خۆی، فەرموودەیەکی بۆ باس بکرێت لە فەرموودەکانی من، پاشان (وەک ڕەتکردنەوەی فەرموودەکە) بڵێت: لە نێوان ئێمە و ئێوەدا قورئانی خوا ﷻ هەیە، هەر شتێکمان بینی لە قورئاندا حەڵاڵ کرابوو، ئێمەش بە حەڵاڵی دەزانین، هەر شتێکمان بینی لە قورئاندا حەرام و قەدەغە کرابوو، بە حەرامی دادەنێین، (پێغەمبەر ﷺ فەرمووی:) ئاگادار بن! هەر شتێک پێغەمبەری خوا ﷺ حەرامی کردبێت، وەک ئەوە وایە کە خوا حەرامی کردبێت»».

٧. عَنْ عُبَيْدِ اللَّه بْنِ أَبِي رَافِعٍ، عَنْ أَبِيه ﷺ: أَنَّ رَسُولَ اللَّه ﷺ قَالَ: «لَا أُلْفِيَنَّ أَحَدَكُمْ مُتَّكِئًا عَلَى أَرِيكَتِه، يَأْتِيه الْأَمْرُ مِمَّا أَمَرْتُ بِه، أَوْ نَهَيْتُ عَنْه، فَيَقُولُ: لَا أَدْرِي، مَا وَجَدْنَا فِي كِتَابِ اللَّه اتَّبَعْنَاه».

عوبەیدوڵڵای کوڕی ئەبو ڕافیع لە باوکیەوە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «هیچ یەکێک لە ئێوە نەبینم لەسەر جێگاکەی خۆی پاڵ بکەوێت و فەرمانێک لە فەرمانەکانی منی پێ بگات، یان قەدەغەکراوێک لەو شتانەی کە من لێم قەدەغە کردووە، پاشان بڵێت: نازانم و ئاگام لێ نییە، (بۆ نکووڵیکردنی فەرموودەکە و بڵێت: تەنها) ئەوەی کە بینیومانە لە قورئانی خوادا هەیە شوێنی دەکەوین».

٨. عَنْ عَائِشَةَ ﵂: أَنَّ رَسُولَ اللّٰه ﷺ قَالَ: «مَنْ أَحْدَثَ فِي أَمْرِنَا هذَا مَا لَيْسَ مِنْه فَهوَ رَدٌّ».

عائیشە ﵂ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «هەر کەسێک شتێکی نەبوو زیاد بکات لەو دینەدا و هیچ بەڵگەیەکی لەسەر نەبێت، ئەوە ڕەت دەکرێتەوە».

٩. عَنْ عَبْدِ اللّٰه بْنِ الزُّبَيْرِ ﵁: أَنَّ رَجُلاً مِنَ الْأَنْصَارِ خَاصَمَ الزُّبَيْرَ عِنْدَ رَسُولِ اللّٰه ﷺ، فِي شِرَاجِ الْحَرَّةِ الَّتِي يَسْقُونَ بِها النَّخْلَ، فَقَالَ الْأَنْصَارِيُّ: سَرِّحِ الْمَاءَ يَمُرُّ، فَأَبَى عَلَيْه، فَاخْتَصَمَا عِنْدَ رَسُولِ اللّٰه ﷺ فَقَالَ: رَسُولُ اللّٰه ﷺ: «اسْقِ يَا زُبَيْرُ، ثُمَّ أَرْسِلِ الْمَاءَ إِلَى جَارِكَ»، فَغَضِبَ الْأَنْصَارِيُّ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللّٰه، أَنْ كَانَ ابْنَ عَمَّتِكَ؟ فَتَلَوَّنَ وَجه رَسُولِ اللّٰه ﷺ، ثُمَّ قَالَ: «يَا زُبَيْرُ، اسْقِ، ثُمَّ احْبِسِ الْمَاءَ حَتَّى يَرْجِعَ إِلَى الْجَدْرِ»، قَالَ: فَقَالَ الزُّبَيْرُ: وَاللّٰه، إِنِّي لَأَحْسِبُ هذِه الْآيَةَ، نَزَلَتْ فِي ذَلِكَ: {فَلَا وَرَبِّكَ لَا يُؤْمِنُونَ حَتَّىٰ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ ثُمَّ لَا يَجِدُوا فِي أَنفُسِهِمْ حَرَجًا مِّمَّا قَضَيْتَ وَيُسَلِّمُوا تَسْلِيمًا} النساء: ٦٥.

عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیر ﵁ دەگێڕێتەوە: پیاوێک لە ئەنصارِ لەگەڵ زوبەیر لێیان بوو بە کێشە لە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەر ئاوەڕۆ (جۆگا)ی ئاوداشتنی باغی خورما، ئەنصارییەکە گوتی: (لێ بگەڕێ) با ئاوەکە بڕوات، (زوبەیریش ﵁) ڕازی نەبوو، بۆیە کێشەکەیان بردە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: «ئەی زوبەیر ئاوداشتنەکەت تەواو بکە و دواتر ئاوەکە بەردەوە بۆ

دراوسێیەکەت (لێی بگەڕێ و ڕایبەستە و بەری پێ مەگرە))، ئەنصارییەکە (بەو بڕیارە) تووڕە بوو، گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، چونکە کوڕی پوورتە ئاوا بڕیارت دا؟ (پێی وا بووە دژی بەرژەوەندیی ئەو بڕیاری داوە!! نەیزانی کە بڕیارەکەی پێغەمبەر ﷺ زیاتر لە بەرژەوەندیی ئەودایە، نەک زوبەیر)، بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ ڕەنگی گۆڕا (لە تووڕەییدا)، پاشان فەرمووی: «ئەی زوبەیر ئاوداشتنەکەت بکە، پاشان ئاوەکە گل بدەوە، تاوەکوو بگەڕێتەوە بۆ ڕەگی درەختەکان (یان تاوەکوو دەگەڕێتەوە بۆ ئەو شوورە و بەربەستەی کە لە باغەکەدایە، چونکە ئەوە هەقی زوبەیر بوو، بڕیاری یەکەم جار بە چاوپۆشی و لێبووردەیی بوو، بەڵام ئەنصارییەکە ڕازی نەبوو!))، (ڕاوی) دەڵێت: زوبەیر گوتی: سوێند بە خوا من وا دەزانم کە ئەو ئایەتە لە بەر ئەو هۆکارە دابەزی: {فَلَا وَرَبِّكَ لَا يُؤْمِنُونَ حَتَّى يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ ثُمَّ لَا يَجِدُوا فِي أَنْفُسِهِمْ حَرَجًا مِمَّا قَضَيْتَ وَيُسَلِّمُوا تَسْلِيمًا}، واتە: نەخێر (وا نییە کە خۆیان بە بڕوادار نیشان دەدەن)، سوێند بە پەروەردگارت بڕوادار نین تا تۆ نەکەنە دادوەر لە هەر ئاژاوە و دووبەرەکییەکی نێوانیاندا، پاشان هەست نەکەن لە دەروونیاندا بە هیچ بێزارییەک لەو بڕیارەی تۆ داوتە و ملکەچ نەبن بە ملکەچییەکی تەواو.

١٠. عَنِ ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «لَا تَمْنَعُوا إِمَاءَ اللَّهِ أَنْ يُصَلِّينَ فِي الْمَسْجِدِ»، فَقَالَ ابْنٌ لَه: إِنَّا لَنَمْنَعُهنَّ، فَقَالَ: فَغَضِبَ غَضَبًا شَدِيدًا، وَقَالَ: أُحَدِّثُكَ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ وتقولُ: إِنَّا لَنَمْنَعُهنَّ؟

ئیبن عومەر رضي الله عنهما دەگێڕێتەوە: کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «ڕێ لە ئافرەتان مەگرن بۆ ئەوەی نوێژ لە مزگەوت بکەن»، (لەو کاتەدا) یەکێك لە کوڕەکانی (ئیبن عومەر رضي الله عنهما) گوتی: ئێمە ڕێیان لێ دەگرین (بۆ مزگەوت)، عەبدوڵڵا زۆر بەتوندی تووڕە بوو (بەو قسەیە) و گوتی: من لە پێغەمبەری خواوە ﷺ فەرموودەت بۆ دەگێڕمەوە، کەچی تۆ دەڵێیت: ئێمە ڕێگایان پێ نادەین؟

١١. عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مُغَفَّلٍ رضي الله عنه: أَنَّه كَانَ جَالِسًا إِلَى جَنْبِه ابْنُ أَخٍ لَه، فَخَذَفَ،

فَنَهاه، وَقَالَ: إِنَّ رَسُولَ اللَّه ﷺ نَهى عَنْها وَقَالَ: «إِنَّها لَا تَصِيدُ صَيْدًا، وَلَا تَنْكِي عَدُوًّا، وَإِنَّها تَكْسِرُ السِّنَّ، وَتَفْقَأُ الْعَيْنَ» قَالَ: فَعَادَ ابْنُ أَخِيه يخذف فَقَالَ: أُحَدِّثُكَ أَنَّ رَسُولَ اللَّه ﷺ نَهى عَنْها، ثُمَّ عُدْتَ تَخْذِفُ، لَا أُكَلِّمُكَ أَبَدًا.

عەبدوڵڵای كوڕی موغەففەل ﷺ دەگێڕێتەوە: كە برازاكەی لە تەنیشتی دانیشتبوو، بە پەنجەكانی (پەنجەی شایەتمان لە دەستی ڕاست و هەمان پەنجەی بەرانبەری لە دەستی چەپی) بەردی دەخستە نێویان و بەردەكەی دەهاویشت، عەبدوڵڵا ڕێگریی لێ كرد و گوتی: پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی كردووە و فەرموویەتی: «(ئەو جۆرە بەرد هاویشتنە) هیچ نێچیرێك ڕاو ناكات و ئازاریش بە دوژمن ناگەیەنێت، (بەڵكوو) ئەو كارە دەبێتە هۆی شكاندنی ددان و كوێركردنی چاو»، (سەعید) دەڵێت: دوای ئەوە جارێكی دیكە برازاكەی هەمان ڕەفتاری ئەنجام دایەوە! عەبدوڵڵاش پێی گوت: من دەڵێم پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو كارەی قەدەغە كردووە، كەچی تۆ دووبارەت كردەوە؟ كەواتە هەرگیز قسەت لەگەڵدا ناكەمەوە.



## بَابُ التَّوَقِّي فِي الْحَدِيثِ عَنْ رَسُولِ اللَّه ﷺ

### باسی پارێزكردن لە گێڕانەوەی فەرمووده لە پێغەمبەری خواوە ﷺ

١٢. عَنْ عَمْرِو بْنِ مَيْمُونٍ ﷺ قَالَ: مَا أَخْطَأَنِي ابْنُ مَسْعُودٍ ﷺ عَشِيَّةَ خَمِيسٍ إِلَّا أَتَيْتُه فِيه، قَالَ: فَمَا سَمِعْتُه يَقُولُ لِشَيْءٍ قَطُّ قَالَ رَسُولُ اللَّه ﷺ، فَلَمَّا كَانَ ذَاتَ عَشِيَّةٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه ﷺ، قَالَ: فَنَكَسَ، قَالَ: فَنَظَرْتُ إِلَيْه، فَهوَ قَائِمٌ مُحَلَّلَةً، أَزْرَارُ قَمِيصِه، قَدْ اغْرَوْرَقَتْ عَيْنَاه، وَانْتَفَخَتْ أَوْدَاجُه قَالَ: أَوْ دُونَ ذَلِكَ، أَوْ فَوْقَ ذَلِكَ، أَوْ قَرِيبًا مِنْ ذَلِكَ، أَوْ شَبِيها بِذَلِكَ!!

عەمری كوڕی مەیموونە ﷺ دەڵێت: هیچ ئێوارەیەكی پێنجشەممە نەبووە (بەسەرمدا تێنەپەڕیوە)، كە نەچووبمە لای ئیبن مەسعوود ﷺ، دەڵێت: هەرگیز گوێم لێی نەبووە بۆ شتێك (كە باسی كردبێت) بڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ وای فەرمووە، بەڵام

ئێوارەیەک گوتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی (واتە: فەرموودەیەکی لە پێغەمبەر ﷺ گێڕایەوە)، عەمڕ دەڵێت: (ئیبن مەسعوود) سەری داخستبوو، دەڵێت: تەماشام کرد بەپێوە بوو، قردێلە (قۆپچە)ـی کراسەکەی کرابوویەوە، چاوەکانی پڕ بووبوون لە فرمێسک و دەمارەکانی ملی گرژ بووبوون، (بۆ ئەوەی پارێز بکات لە فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ)، ئیبن مسعوود گوتی: پێغەمبەر ﷺ (ئاوای فەرموو) یان غەیری ئەوە، یان لە سەرووی ئەوە، یان نزیک لەوە، یان لە وێنەی ئەوە.

تێبینی:

واتە: ڕاستەوخۆ فەرموودەکەی نەدایە پاڵ پێغەمبەر ﷺ، نەبادا وشەیەکی لەبیر کردبێت، یان هەڵەی کردبێت، ئەوەش ئەوپەڕی ڕێزگرتنە لە پێغەمبەر ﷺ و فەرمایشتەکانی.

١٣. عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ سِيرِينَ ﵁ قَالَ: كَانَ أَنَسُ بْنُ مَالِكٍ ﵁، إِذَا حَدَّثَ عَنْ رَسُولِ اللَّه ﷺ حَدِيثًا فَفَرَغَ مِنْه قَالَ: أَوْ كَمَا قَالَ رَسُولُ اللَّه ﷺ.

موحەممەدی کوڕی سیرین ﵁ دەڵێت: ئەنەسی کوڕی مالیک ﵁ هەر کاتێک فەرموودەیەکی لە پێغەمبەری خواوە ﷺ دەگێڕایەوە و تەواو دەبوو، دەیگوت: (ئاوای فەرموو) یان بەو جۆرەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی. (ئەوەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە دەگونجێت فەرموودەکەی بە مانا گێڕابێتەوە، واتە: نەوەک وەکوو دەق).

١٤. عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي لَيْلَى ﵁ قَالَ: قُلْنَا لِزَيْدِ بْنِ أَرْقَمَ: حَدِّثْنَا عَنْ رَسُولِ اللَّه ﷺ، قَالَ: كَبِرْنَا وَنَسِينَا، وَالْحَدِيثُ عَنْ رَسُولِ اللَّه ﷺ شَدِيدٌ.

عەبدوڕڕەحمانی کوڕی ئەبو لەیلا ﵁ دەڵێت: بە زەیدی کوڕی ئەرقەممان گوت: لە پێغەمبەری خواوە ﷺ فەرموودەمان بۆ بگێڕەوە، ئەویش گوتی: بەتەمەندا چووین و شتمان بیر دەچێتەوە، گێڕانەوەی فەرموودەش لە پێغەمبەری خوا ﷺ کارێکی قورس و گرانە.

## بَابُ التَّغْلِيظِ فِي تَعَمُّدِ الْكَذِبِ عَلَى رَسُولِ اللَّه ﷺ

### باسی هەڕەشەی توند لەسەر بەئەنقەست درۆ هەڵبەستن بەدەم پێغەمبەری خواوە ﷺ

١٥. عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَبْدِ اللَّه بْنِ مَسْعُودٍ، عَنْ أَبِيه رضي الله عنه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه ﷺ: «مَنْ كَذَبَ عَلَيَّ مُتَعَمِّدًا، فَلْيَتَبَوَّأْ مَقْعَدَه مِنَ النَّارِ».

عەبدوڕڕەحمانی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود لە باوکیەوە رضي الله عنه دەگێڕێتەوە، گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «هەر کەسێک بەئەنقەست (بە هەر مەبەستێک) بە زمانی منەوە درۆ هەڵبەستێت، با شوێنی خۆی دیاری بکات لە ئاگردا».

## بَابُ مَنْ حَدَّثَ عَنْ رَسُولِ اللَّه ﷺ حَدِيثًا وَهوَ يَرَى أَنَّه كَذِبٌ

### باسی ئەو کەسەی بەدەم پێغەمبەرەوە ﷺ فەرموودە بگێڕێتەوە و بشزانێت کە درۆیە

١٦. عَنْ سَمُرَةَ بْنِ جُنْدَبٍ رضي الله عنه عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «مَنْ حَدَّثَ عَنِّي حَدِيثًا وَهوَ يَرَى أَنَّه كَذِبٌ، فَهوَ أَحَدُ الْكَاذِبِيْنِ».

سەمورەی کوڕی جوندەب رضي الله عنه دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: «هەر کەسێک فەرموودەیەک لە منەوە بگێڕێتەوە، بزانێت کە درۆیە (من نەمگوتووە)، ئەوە ئەو کەسەش یەکێکە لە دوو درۆزنەکە».

## بَابُ اتِّبَاعِ سُنَّةِ الْخُلَفَاءِ الرَّاشِدِينَ الْمَهدِيِّينَ

### باسی شوێنکەوتنی جێنشینە سەرڕاست و شارەزاکان

١٧. عَنِ الْعِرْبَاضِ بْنِ سَارِيَةَ رضي الله عنه يَقُولُ: قَامَ فِينَا رَسُولُ اللَّه ﷺ ذَاتَ يَوْمٍ، فَوَعَظَنَا

مَوْعِظَةً بَلِيغَةً، وَجِلَتْ مِنْها الْقُلُوبُ، وَذَرَفَتْ مِنْها الْعُيُونُ، فَقِيلَ يَا رَسُولَ اللَّه: وَعَظْتَنا مَوْعِظَةَ مُوَدِّعٍ، فَاعْهَدْ إِلَيْنَا بِعَهْدٍ، فَقَالَ: «عَلَيْكُم بِتَقْوَى اللَّه، وَالسَّمْعِ وَالطَّاعَةِ، وَإِنْ عَبْدًا حَبَشِيًّا، وَسَتَرَوْنَ مِنْ بَعْدِي اخْتِلَافًا شَدِيدًا، فَعَلَيْكُمْ بِسُنَّتِي، وَسُنَّةِ الْخُلَفَاءِ الرَّاشِدِينَ الْمَهْدِيِّينَ، عَضُّوا عَلَيْها بِالنَّوَاجِذِ، وَإِيَّاكُمْ وَالْأُمُورَ الْمُحْدَثَاتِ، فَإِنَّ كُلَّ بِدْعَةٍ ضَلَالَةٌ».

عیربازی کوڕی ساریه ﵁ دەڵێت: ڕۆژێک پێغەمبەری خوا ﷺ لەنێوماندا هەستا و ئامۆژگاریی کردین بە ئامۆژگارییەکی بەهێز و لەجێ، کە دڵەکانی دەلەرزاند و چاوەکان فرمێسکیان لێ دەهات، پێیان گوت: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بە جۆرێک ئامۆژگاریت کردین، وەک ئەوەی شتێکمان پێ بسپێری بۆ دوای خۆت، (فەرموو) وەسییەتەکەتمان پێ بگەیەنە، (پێغەمبەریش ﷺ) فەرمووی: «تەقوای خوا بکەن و لەسەر گوێڕایەڵی و فەرمانبەرداری بن، با ئەو کەسەی فەرمانتان پێ دەکات بەندەیەکی حەبەشیش بێ (مادام هەڵبژێردراوی خۆتانە) و لەدوای من ڕاجیاییەکی زۆر دەبینن (جیاوازی لە تێگەشتن بۆ دین و لێکدانەوەی دەقەکان)، بۆیە لەو کاتەدا دەست بگرن بە سوننەت و ڕێگا (ڕاستەکە)ـی من و جێنشینە سەرڕاست و شارەزاکانم، (ئەو ڕێباز و سوننەتە) بە ددانەکانتان بگرن و خۆتان بەدوور بگرن لە شتی داهێنراو و زیادە، چونکە بێگومان هەموو داهێنراوێکی (بێبنەما) لە ئاییندا گومڕاییە».

## بَابُ اجْتِنَابِ الْبِدَعِ وَالْجَدَلِ

### باسی دوورکەتنەوە لە داهێنران لە ئایین و دوورکەوتنەوە لە شەڕەقسە

١٨. عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّه ﵄ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّه ﷺ: إِذَا خَطَبَ احْمَرَّتْ عَيْنَاه، وَعَلَا صَوْتُه، وَاشْتَدَّ غَضَبُه، كَأَنَّه مُنْذِرُ جَيْشٍ يَقُولُ: «صَبَّحَكُمْ مَسَّاكُمْ»، وَيَقُولُ: «بُعِثْتُ أَنَا وَالسَّاعَةَ كَهاتَيْنِ»، وَيَقْرِنُ بَيْنَ إِصْبَعَيْه السَّبَّابَةِ وَالْوُسْطَى، ثُمَّ يَقُولُ: «أَمَّا بَعْدُ، فَإِنَّ خَيْرَ الْأُمُورِ كِتَابُ اللَّه، وَخَيْرُ الْهدْيِ هدْيُ مُحَمَّدٍ، وَشَرُّ

الْأُمُورِ مُحْدَثَاتُها، وَكُلُّ بِدْعَةٍ ضَلَالَةٌ»، وَكَانَ يَقُولُ: «مَنْ تَرَكَ مَالاً فَلِأَهْلِهِ، وَمَنْ تَرَكَ دَيْنًا أَوْ ضَيَاعًا، فَعَلَيَّ وَإِلَيَّ».

جابیری کوڕی عەبدوڵلا ﵄ دەڵێت: کاتێک کە پێغەمبەری خوا ﷺ وتاری دەدا چاوەکانی سوور دەبوونەوە و دەنگی بەرز دەکردەوە، توڕەییەکەی توند دەبوو، وەک ئەوەی کە سوپایەک ئاگادار بکات و بفەرمووێت: «بەیانی یان ئێوارە (دوژمن بەسەرتاندا دەدات)» و دەیفەرموو: «هاتنی من و ڕۆژی دوایی وەک ئەو دووانە وایە»، پەنجەی شایەتمان و نێوەڕاستی هێنانە لای یەکدی، پاشان فەرمووی: «لەدوای ئەوە باشترین شتێک (کە لەنێوتاندایە و باشترینە بۆ کارپێکردن) کتێبەکەی خوایە (قورئان)، باشترین ڕێگاش ڕێگا ڕاست و دروستەکەی موحەممەدە، خراپترین شتیش زیادکراوەکانن، هەموو داهێنراوێک گومڕاییە»، وە دەیفەرموو: «هەر کەسێک ماڵ و سامانێکی بەجێ هێشت، ئەوە (لەدوای خۆی) بۆ ماڵ و منداڵەکەیەتی، وە هەر کەسێك قەرزی لەدوا بەجێ ما، یان ماڵ و منداڵی نەدار بوون، ئەوە قەرزەکەی لەسەر منە (بۆی دەدەمەوە)، بژێوی ماڵ و منداڵیشی لەسەر منە».

١٩. عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: تَلَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ هذِهِ الْآيَةَ: «{هُوَ الَّذِي أَنْزَلَ عَلَيْكَ الْكِتَابَ مِنْهُ آيَاتٌ مُحْكَمَاتٌ هُنَّ أُمُّ الْكِتَابِ وَأُخَرُ مُتَشَابِهَاتٌ} آل عمران: ٧»، إِلَى قَوْلِهِ: «{وَمَا يَذَّكَّرُ إِلَّا أُولُو الْأَلْبَابِ}»، فَقَالَ: «يَا عَائِشَةُ، إِذَا رَأَيْتُمُ الَّذِينَ يُجَادِلُونَ فِيهِ، فَهُمُ الَّذِينَ عَنَاهُمُ اللَّهُ، فَاحْذَرُوهُمْ».

عائیشە ﵂ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو ئایەتەی خوێندەوە: «{هُوَ الَّذِي أَنْزَلَ عَلَيْكَ الْكِتَابَ مِنْهُ آيَاتٌ مُحْكَمَاتٌ هُنَّ أُمُّ الْكِتَابِ وَأُخَرُ مُتَشَابِهَاتٌ} آل عمران: ٧، واتە: ئەو خوایە ناردوویەتیە خوارەوە بۆت قورئان هەندێک لە ئایەتەکانی (مەبەستەکانیان) ڕۆشنن، ئەو ئایەتانە بنەڕەتی قورئانن، ئەوانی دیکە (کۆمەڵە ئایەتێکن کە مەبەستەکانیان) ڕۆشن نین، هەتا گەیشتە: {وَمَا يَذَّكَّرُ إِلَّا أُولُو الْأَلْبَابِ}، واتە: تەنها خاوەنانی ژیری و بیر و هۆش نەبێت»، پاشان فەرمووی: «ئەی عائیشە! ئەگەر لەو جۆرە کەسانەت بینی کە دەمەدەمێ و موناقەشە دەکەن دەربارەی

ئەم ئایەتانە، ئەوە بزانە کە مەبەست پێی ئەو جۆرە کەسانەن، بۆیە وریا بە لێیان».

## بَابُ اجْتِنَابِ الرَّأْيِ وَالْقِيَاسِ

### باسی خۆدوورگرتن لە (فەتوادان) بە بۆچوون و قیاس (ی بێبنەما)

٢٠. عَنْ عَبْدِ اللَّه بْنِ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ ﵄: أَنَّ رَسُولَ اللَّه ﷺ قَالَ: «إِنَّ اللَّه لَا يَقْبِضُ الْعِلْمَ انْتِزَاعًا يَنْتَزِعُه مِنَ النَّاسِ، وَلَكِنْ يَقْبِضُ الْعِلْمُ بِقَبْضِ الْعُلَمَاءِ، فَإِذَا لَمْ يُبْقِ عَالِمًا اتَّخَذَ النَّاسُ رُءُوسًا جُهالاً، فَسُئِلُوا فَأَفْتَوْا بِغَيْرِ عِلْمٍ، فَضَلُّوا وَأَضَلُّوا».

عەبدوڵڵای کوڕی عەمڕی کوڕی عاص ﵄ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «خوا زانست داناڕنێت بە جۆرێک کە لەنێو (دڵ و عەقڵی) خەڵک دەریبهێنێت، بەڵکوو بە جۆرێک زانست ناهێڵێت و هەڵیدەگرێتەوە کە کەسە زاناکان نامێنن، کاتێکیش هیچ زانایەک نەما (خەڵک شوێنی بکەوێت)، ئەوە خەڵک کەسانێک دەکەن بە سەرکردە کە هیچ لە ئایین نازانن و نەزانن، ئەو کاتیش ئەو سەرکردە نەزانانە پرسیاریان لێ دەکرێت، ئەوانیش بە نەزانی فەتوا دەدەن، ئەو کاتیش خۆیان و خەڵکیش گومڕا دەکەن».

## بَابٌ فِي الْإِيمَانِ

### باسێك دەربارەی بڕوا (ئیمان)

٢١. عَنْ أَبِي هرَيْرَةَ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه ﷺ: «الْإِيمَانُ بِضْعٌ وَسِتُّونَ أَوْ سَبْعُونَ بَابًا، أَدْنَاها إِمَاطَةُ الْأَذَى عَنِ الطَّرِيقِ، وَأَرْفَعُها قَوْلُ لَا إِلَه إِلَّا اللَّه، وَالْحَيَاءُ شُعْبَةٌ مِنَ الْإِيمَانِ».

ئەبو هورەیرە ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «ئیمان بریتییە لە شەست و ئەوەندە، یان حەفتا و ئەوەندە بەشە، کەمترین (پلەی ئیمان) بریتییە لە لابردنی

هەر ئازارێک لەسەر ڕێگا، بەرزترین (پلەش) بریتییە لە وشەی: هیچ پەرستراوێکی بەهەق نییە جگە لە خوا، شەرم و حەیا بەشێکە لە ئیمان».

٢٢. عَنْ عَبْدِ اللَّهِ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا يَدْخُلُ الْجَنَّةَ مَنْ كَانَ فِي قَلْبِهِ مِثْقَالُ ذَرَّةٍ مِنْ خَرْدَلٍ مِنْ كِبْرٍ، وَلَا يَدْخُلُ النَّارَ مَنْ كَانَ فِي قَلْبِهِ مِثْقَالُ حَبَّةٍ مِنْ خَرْدَلٍ مِنْ إِيمَانٍ».

عەبدوڵلا رضي الله عنه دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «هەر کەسێک بەئەندازەی دەنکە خەردەلێک خۆبەگەورەزانینی لە دڵدا هەبێت، ناچێتە بەهەشت، هەر کەسێکیش بەئەندازەی دەنکە خەردەلێک ئیمان لە دڵیدا هەبێت، ناچێتە ئاگرەوە».

٢٣. عَنْ جُنْدُبِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ رضي الله عنه قَالَ: كُنَّا مَعَ النَّبِيِّ ﷺ وَنَحْنُ فِتْيَانٌ حَزَاوِرَةٌ: فَتَعَلَّمْنَا الْإِيمَانَ قَبْلَ أَنْ نَتَعَلَّمَ الْقُرْآنَ، ثُمَّ تَعَلَّمْنَا الْقُرْآنَ فَازْدَدْنَا بِهِ إِيمَانًا.

جوندوبی کوڕی عەبدوڵلا رضي الله عنه گوتوویەتی: ئێمە لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ بووین، لەو کاتەی کە گەنجی تازەپێگەیشتوو (نەوجەوان) بووین، ئێمە خۆمان فێری ئیمان دەکرد، پێش ئەوەی خۆمان فێری قوڕئان بکەین، پاشان خۆمان فێری قوڕئان دەکرد، جا (بە فێربوونی قوڕئان) ئیمانمان زیادی دەکرد (دامەزراوتر دەبووین).

## بَابٌ فِي الْقَدَرِ

## باسێك دەربارەی قەدەر

٢٤. عَنِ ابْنِ الدَّيْلَمِيِّ رضي الله عنه قَالَ: وَقَعَ فِي نَفْسِي شَيْءٌ مِنْ هذَا الْقَدَرِ، خَشِيتُ أَنْ يُفْسِدَ عَلَيَّ دِينِي وَأَمْرِي، فَأَتَيْتُ أُبَيَّ بْنَ كَعْبٍ، فَقُلْتُ: أَبَا الْمُنْذِرِ، إِنَّه قَدْ وَقَعَ فِي نَفْسِي شَيْءٌ مِنْ هذَا الْقَدَرِ، فَخَشِيتُ عَلَى دِينِي وَأَمْرِي، فَحَدِّثْنِي مِنْ ذَلِكَ بِشَيْءٍ، لَعَلَّ اللهَ أَنْ يَنْفَعَنِي بِهِ، فَقَالَ: لَوْ أَنَّ اللهَ عَذَّبَ أَهلَ سَمَاوَاتِه وَأَهلَ أَرْضِه، لَعَذَّبَهمْ وَهوَ غَيْرُ

ظَالِمٍ لَهمْ، وَلَوْ رَحِمَهمْ لَكَانَتْ رَحْمَتُه خَيْرًا لَهمْ مِنْ أَعْمَالِهمْ، وَلَوْ كَانَ لَكَ مِثْلُ جَبَلِ أُحُدٍ ذَهبًا، أَوْ مِثْلُ جَبَلِ أُحُدٍ تُنْفِقُه فِي سَبِيلِ اللّه، مَا قُبِلَ مِنْكَ حَتَّى تُؤْمِنَ بِالْقَدَرِ، فَتَعْلَمَ أَنَّ مَا أَصَابَكَ لَمْ يَكُنْ لِيُخْطِئَكَ، وَأَنَّ مَا أَخْطَأَكَ لَمْ يَكُنْ لِيُصِيبَكَ، وَأَنَّكَ إِنْ مُتَّ عَلَى غَيْرِ هذَا دَخَلْتَ النَّارَ. وَلَا عَلَيْكَ أَنْ تَأْتِيَ أَخِي عَبْدَ اللّه بْنَ مَسْعُودٍ، فَتَسْأَلَه، فَأَتَيْتُ عَبْدَ اللّه، فَسَأَلْتُه، فَذَكَرَ مِثْلَ مَا قَالَ أُبَيٌّ وَقَالَ لِي: وَلَا عَلَيْكَ أَنْ تَأْتِيَ حُذَيْفَةَ، فَأَتَيْتُ حُذَيْفَةَ، فَسَأَلْتُه، فَقَالَ مِثْلَ مَا قَالَا، وَقَالَ: ائْتِ زَيْدَ بْنَ ثَابتٍ، فَاسْأَلْه، فَأَتَيْتُ زَيْدَ بْنَ ثَابتٍ، فَسَأَلْتُه، فَقَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللّه ﷺ يَقُولُ: «لَوْ أَنَّ اللّه عَذَّبَ أَهلَ سَمَاوَاتِه وأَهلَ أَرْضِه، لَعَذَّبَهمْ وَهوَ غَيْرُ ظَالِمٍ لَهمْ، وَلَوْ رَحِمَهمْ لَكَانَتْ رَحْمَتُه خَيْرًا لَهمْ مِنْ أَعْمَالِهمْ، وَلَوْ كَانَ لَكَ مِثْلُ أُحُدٍ ذَهبًا، أَوْ مِثْلُ جَبَلِ أُحُدٍ ذَهبًا تُنْفِقُه فِي سَبِيلِ اللّه، مَا قَبِلَه مِنْكَ حَتَّى تُؤْمِنَ بِالْقَدَرِ كُلِّه، فَتَعْلَمَ أَنَّ مَا أَصَابَكَ لَمْ يَكُنْ لِيُخْطِئَكَ، وَمَا أَخْطَأَكَ لَمْ يَكُنْ لِيُصِيبَكَ، وَأَنَّكَ إِنْ مُتَّ عَلَى غَيْرِ هذَا دَخَلْتَ النَّارَ».

ئیبن دەیلەمی رضي الله عنه دەڵێت: شتێک لە دڵم دروست بوو دەربارەی قەدەر (واتە: بڕوابوون بە قەدەر)، ترسام کە ئایین و دونیام تێک بدات، بۆیە چووم بۆ لای ئوبەی کوڕی کەعب رضي الله عنه گوتم: ئەبو مونزیر، بەڕاستی شتێک لە دڵمدا دروست بووە دەربارەی قەدەر، ترسام ئایین و دونیام تێک بدات، بۆیە دەربارەی ئەوە شتێکم پێ بڵێ، بەڵکوو خوا بەهۆیەوە سوودم پێ بگەیەنێت، ئەویش گوتی: ئەگەر خوا خەڵکی ئاسمانەکان و زەوی سزا بدات، ئەوە سزایان دەدات و بە هیچ جۆرێک ستەمی لێ نەکردوون، ئەگەر بەزەیی پێیاندا بێتەوە (سزایان لەسەر لابدات) ئەوە سۆز و بەزەییەکەی باشتر و چاکترە بۆیان لە کردەوەکانیان، ئەگەر بە وێنەی چیای ئوحود زێرت هەبێت، یاخود بە وێنەی چیای ئوحود ببەخشیت لەپێناوی خوادا، هیچیت لێ وەرناگیرێت تاوەکوو بڕوات بە قەدەر نەبێت، بشزانە ئەو شتەی کە دێتە ڕێت، نەدەبوو لابدرایە و نەهاتایەتە ڕێت، ئەو شتەش کە نایەتە ڕێت هەرگیز نابێت بێتە ڕێت، بێگومان ئەگەر تۆ لەسەر غەیری ئەم بیروبڕوایە بمریت، ئەوە دەچیە دۆزەخەوە، هیچ زیانیشی نییە ئەگەر بچی بۆ لای براکەم عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود و لەویش بپرسیت، منیش چووم بۆ لای عەبدوڵڵا و پرسیارم لێ کرد، هەمان ئەو شتەی بۆ باس کردم کە ئوبەی بۆی

باس کردبووم، پێی گوتم: هیچ زەرەرێک ناکەیت ئەگەر بچیت بۆ لای حوزەیفە، منیش چووم بۆ لای حوزەیفە و پرسیارم لێ کرد، هەمان ئەو شتەی پێ گوتم (کە ئوبەی و عەبدوڵلا پێیان گوتبووم)، گوتی: برۆ بۆ لای زەیدی کوڕی سابیت و پرسیار لەویش بکە، منیش چووم بۆ لای زەیدی کوڕی سابیت و پرسیارم لێ کرد، ئەویش گوتی: گوێم لێ بوو پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: «ئەگەر خوا خەڵکی ئاسمانەکان و زەوی سزا بدات، ئەوە سزایان دەدات و بە هیچ جۆرێک ستەمی لێ نەکردوون، ئەگەر بەزەیی پێیاندا بێتەوە (سزایان لەسەر لابدات) ئەوە سۆز و بەزەییەکەی باشتر و چاکترە بۆیان لە کردەوەکانیان، ئەگەر بە وێنەی چیای ئوحود زێڕت هەبێت، یاخود بە وێنەی چیای ئوحود ببەخشیت لەپێناوی خوادا، هیچیت لێ وەرناگیرێت تاوەکوو بڕوات بە قەدەر نەبێت، بزانە ئەو شتەی کە دێتە ڕێت، نەدەبوو لابدرایە و نەهاتایەتە ڕێت، ئەو شتەش کە نایەتە ڕێت هەرگیز نابێت بێتە ڕێت، بێگومان ئەگەر تۆ لەسەر غەیری ئەم بیروبڕوایە بمریت، ئەوە دەچیە نێو دۆزەخەوە».

٢٥. عَنْ عَلِيٍّ ﵁ قَالَ: كُنَّا جُلُوسًا عِنْدَ النَّبِيِّ ﷺ وَبِيَدِهِ عُودٌ، فَنَكَتَ فِي الْأَرْضِ، ثُمَّ رَفَعَ رَأْسَهُ، فَقَالَ: «مَا مِنْكُمْ مِنْ أَحَدٍ إِلَّا وَقَدْ كُتِبَ مَقْعَدُهُ مِنَ الْجَنَّةِ، وَمَقْعَدُهُ مِنَ النَّارِ»، قِيلَ: يَا رَسُولَ اللهِ، أَفَلَا نَتَّكِلُ؟ قَالَ: «لَا، اعْمَلُوا وَلَا تَتَّكِلُوا، فَكُلٌّ مُيَسَّرٌ لِمَا خُلِقَ لَهُ»، ثُمَّ قَرَأَ: «{ فَأَمَّا مَنْ أَعْطَى وَاتَّقَى (٥) وَصَدَّقَ بِالْحُسْنَى (٦) فَسَنُيَسِّرُهُ لِلْيُسْرَى (٧) وَأَمَّا مَنْ بَخِلَ وَاسْتَغْنَى (٨) وَكَذَّبَ بِالْحُسْنَى (٩) فَسَنُيَسِّرُهُ لِلْعُسْرَى(١٠)} الليل».

عەلی ﵁ دەڵێت: ئێمە دانیشتبووین لە خزمەت پێغەمبەر ﷺ، چیلکەدارێکی بەدەستەوە بوو، لە زەویدا چەقاندی، پاشان سەری بەرز کردەوە و فەرمووی: «بێگومان هەر یەکێک لە ئێوە شوێنەکەی لە بەهەشت نووسراوە (دیاری کراوە)، یان شوێنەکەی لە دۆزەخ نووسراوە»، گوترا: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، ئایا پشت بەوە نەبەستین؟ فەرمووی: «نەخێر، کار و کردەوە بکەن و پشت بەوە مەبەستن، چونکە هەر کەسێک ئاسانکاریی بۆ دەکرێت بۆ ئەوەی کە بۆی دروست کراوە». پاشان ئەمەی خوێندەوە: «{فَأَمَّا مَنْ أَعْطَى وَاتَّقَى (٥) وَصَدَّقَ بِالْحُسْنَى (٦) فَسَنُيَسِّرُهُ

لِلْيُسْرَى (٧) وَأَمَّا مَنْ بَخِلَ وَاسْتَغْنَى (٨) وَكَذَّبَ بِالْحُسْنَى (٩) فَسَنُيَسِّرُه لِلْعُسْرَى(١٠)} الليل، واته: ئەمجا ئەو کەسەی (ماڵ) ببەخشێت و له خوا بترسێت و پارێزكار بێت (٥) وە بڕوای ببێت بەوەی زۆر چاكە (بە -لا إله إلا الله- یان بە بەهەشت) (٦) ئەوە بێگومان یارمەتی دەدەین بۆ ڕێی ئاسان (کە چاكەیە) (٧) وە ئەو کەسەی ڕژدیی بكات (لە بەخشینی ماڵ) و خۆی بە بێنیاز بزانێت (لە پاداشتی پەروەردگاری) (٨) وە بڕوای نەبێت بە چاكە (کە -لا إله إلا الله- یان بەهەشتە) (٩) ئەوە بێگومان ڕێی سەختی بۆ ئاسان دەكەین (١٠)».

٢٦. عَنْ عَلِيٍّ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه ﷺ: «لَا يُؤْمِنُ عَبْدٌ حَتَّى يُؤْمِنَ بِأَرْبَعٍ: بِاللَّه وَحْدَه لَا شَرِيكَ لَه، وَأَنِّي رَسُولُ اللَّه، وَبِالْبَعْثِ بَعْدَ الْمَوْتِ، وَالْقَدَرِ».

عەلی ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «هیچ بەندەیەک نابێتە بڕواداری تەواو هەتا بڕوا بە چوار شت نەهێنێت: بە تەنیایی خوا کە هیچ هاوبەشی نییە، بە من کە نێردراوی خوام، بە زیندووبونەوەی دوای مردن، بە قەزا و قەدەر».

٢٧. عَنْ أَبِي مُوسَى الْأَشْعَرِيِّ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه ﷺ: «مَثَلُ الْقَلْبِ مَثَلُ الرِّيشَةِ تُقَلِّبُها الرِّيَاحُ بِفَلَاةٍ».

ئەبو مووسای ئەشعەری ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «نموونەی دڵ وەکوو پەڕی باڵندەیە، با ئەمدیو ئەودیوی پێ دەکات لە شوێنێکی چۆڵدا (کە ئاوەدانی نەبێت)».

٢٨. عَنْ جَابِرٍ ﷺ قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ مِنَ الْأَنْصَارِ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّه، إِنَّ لِي جَارِيَةً، أَعْزِلُ عَنْها؟ قَالَ: «سَيَأْتِيها مَا قُدِّرَ لَها»، فَأَتَاه بَعْدَ ذَلِكَ، فَقَالَ: قَدْ حَمَلَتِ الْجَارِيَةُ فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «مَا قُدِّرَ لِنَفْسٍ شَيْءٌ إِلَّا هِيَ كَائِنَةٌ».

جابیر ﷺ دەڵێت: پیاوێک لە ئەنصارییەکان هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا، کەنیزەکێکم هەیە، ئایا دەکرێت ڕێگری بکەم منداڵی ببێت؟

فەرمووی: «لە قەدەردا چ شتێکی بۆ نووسراوە هەر ئەوەی بۆ دێتە پێش»، پاش ماوەیەک کابرایەکە هاتەوە خزمەت پێغەمبەر ﷺ گوتی: کەنیزەکەکە دووگیان بووە، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: «هەر نەفسێک هەر شتێکی بۆ نووسرابێت بێگومان هەر دێتە جێ».

## بَابٌ فِي فَضَائِلِ أَصَحَابِ رَسُولِ اللهِ ﷺ

## باسێك دەربارەی پێگە و گەورەیی هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ

## فَضْلُ أَبِي بَكْرٍ الصِّدِّيقِ رضي الله عنه

## پێگە و گەورەیی ئەبو بەکری صدیق رضي الله عنه

٢٩. عَنْ عَبْدِ اللَّهِ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَلَا إِنِّي أَبْرَأُ إِلَى كُلِّ خَلِيلٍ مِنْ خُلَّتِهِ، وَلَوْ كُنْتُ مُتَّخِذًا خَلِيلاً، لَاتَّخَذْتُ أَبَا بَكْرٍ خَلِيلاً، إِنَّ صَاحِبَكُمْ خَلِيلُ اللَّهِ». قَالَ وَكِيعٌ: يَعْنِي نَفْسَهُ.

عەبدوڵلا رضي الله عنه دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «من بەریئم لە هەر هاوڕێیەک کە پێی وا بێت کردوومە بە هاوڕێی خۆم، خۆ ئەگەر ئەو کارەم بکردبا ئەوە ئەبو بەکرم دەکرد بە هاوڕێی گیانی بەگیانیم، چونکە بێگومان هاوڕێکەتان (واتە: خۆی) خۆشەویستی خوایە». وەکیع دەڵێت: مەبەستی پێغەمبەر ﷺ لە (صاحبکم) خودی خۆیەتی.

٣٠. عَنْ أَبِي هرَيْرَةَ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَا نَفَعَنِي مَالٌ قَطُّ، مَا نَفَعَنِي مَالُ أَبِي بَكْرٍ»، قَالَ: فَبَكَى أَبُو بَكْرٍ، وَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، هلْ أَنَا وَمَالِي إِلَّا لَكَ يَا رَسُولَ اللهِ.

ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «هەرگیز هیچ ماڵ و سامانێک سوودی پێ نەگەیاندووم، بەئەندازەی ئەوەی کە ماڵ و سامانی ئەبو بەکر سوودی پێ گەیاندووم»، گوتی: ئینجا ئەبو بەکر گریا و گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا، ئایا خۆم و ماڵ و سامانەکەم هەر بەتەنیا بۆ تۆ نین ئەی پێغەمبەری خوا.

٣١. عَنْ عَلِيٍّ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه ﷺ: «أَبُو بَكْرٍ وَعُمَرُ سَيِّدَا كُهولِ أَهلِ الْجَنَّةِ مِنَ الْأَوَّلِينَ وَالْآخِرِينَ، إِلَّا النَّبِيِّينَ وَالْمُرْسَلِينَ، لَا تُخْبِرْهمَا يَا عَلِيُّ مَا دَامَا حَيَّيْنِ».

عەلی ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: «ئەبو بەکر و عومەر سەروەر و سەرداری بەتەمەنەکانی بەهەشتن لەوانەی سەرەتا و کۆتاییش، تەنها پێغەمبەران و نێردراوان نەبێت، ئەی عەلی ئەو هەواڵەیان پێ مەدە تاوەکوو ئەوان زیندوو بن (واتە: هەرگیز پێیان مەڵێ، ئەگەرنا دوای مردن ناتوانرێت هەواڵیان پێ بدرێت)».

تێبینی:

(کهول، کهل): واتە: ئەوانەی لە تەمەنی (٣٠ بۆ٤٠)ساڵیدان، لێرەدا مەبەست سەرەتا و چوونە نێو تەمەنی پیرییە، بەڵام مەبەست لە فەرموودەکەدا بە مانای ئەوەیە: سەروەر و سەرداری ئەوانەن کە لە تەمەنی پیریدا مردوون، چونکە لە بەهەشتدا پیری نییە.

٣٢. عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه ﷺ: «إِنَّ أَهلَ الدَّرَجَاتِ الْعُلَى يَرَاهمْ مَنْ أَسْفَلَ مِنْهمْ كَمَا يُرَى الْكَوْكَبُ الطَّالِعُ فِي الْأُفُقِ مِنْ آفَاقِ السَّمَاءِ، وَإِنَّ أَبَا بَكْرٍ وَعُمَرَ مِنْهمْ وَأَنْعَمَا».

ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «بێگومان ئەوانەی خاوەن پلەی بەرزن (لە بەهەشتدا) ئەوانەی خوار خۆیان بە جۆرێک تەماشایان دەکەن و دەیانبینن هەروەک چۆن (لەلایەن خەڵکی سەر زەوییەوە) ئەستێرەیەکی درەوشاوە لە بەرزاییەکانی ئاسمان دەبینرێت، بێگومان ئەبو بەکر و عومەر لەو خاوەن پلە و پایانەن و زیاتریش».

٣٣. عَنْ حُذَيْفَةَ بْنِ الْيَمَانِ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنِّي لَا أَدْرِي مَا قَدْرُ بَقَائِي فِيكُمْ، فَاقْتَدُوا بِاللَّذَيْنِ مِنْ بَعْدِي»، وَأَشَارَ إِلَى أَبِي بَكْرٍ وَعُمَرَ.

حوزەیفەی کوڕی یەمان ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «من نازانم تاکوو کەی (زۆر یان کەم) لەنێوتاندا دەمێنمەوە، بۆیە لەدوای من شوێنی ئەو دووانە بکەون»، ئاماژەی کرد بۆ ئەبو بەکر و عومەر.

تێبینی:

ئەم فەرموودەیە ئاماژەیەکی تێدایە لەسەر جێنشینایەتی ئەم دوو پێشەوا بەڕێزە لەدوای پێغەمبەر ﷺ.

٣٤. عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄ يَقُولُ: لَمَّا وُضِعَ عُمَرُ عَلَى سَرِيرِهِ، اكْتَنَفَهُ النَّاسُ يَدْعُونَ وَيُصَلُّونَ -أَوْ قَالَ يُثْنُونَ وَيُصَلُّونَ- عَلَيْهِ قَبْلَ أَنْ يُرْفَعَ، وَأَنَا فِيهِمْ، فَلَمْ يَرُعْنِي إِلَّا رَجُلٌ قَدْ زَحَمَنِي، وَأَخَذَ بِمَنْكِبِي، فَالْتَفَتُّ فَإِذَا عَلِيُّ بْنُ أَبِي طَالِبٍ، فَتَرَحَّمَ عَلَى عُمَرَ، ثُمَّ قَالَ: مَا خَلَّفْتَ أَحَدًا أَحَبَّ إِلَيَّ أَنْ أَلْقَى اللَّهَ بِمِثْلِ عَمَلِهِ مِنْكَ، وَايْمُ اللَّهِ، إِنْ كُنْتُ لَأَظُنُّ لَيَجْعَلَنَّكَ اللَّهُ ﷻ مَعَ صَاحِبَيْكَ، وَذَلِكَ أَنِّي كُنْتُ أَكْثَرُ أَنْ أَسْمَعَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «ذَهَبْتُ أَنَا وَأَبُو بَكْرٍ وَعُمَرُ، وَدَخَلْتُ أَنَا وَأَبُو بَكْرٍ وَعُمَرُ، وَخَرَجْتُ أَنَا وَأَبُو بَكْرٍ وَعُمَرُ»، فَكُنْتُ أَظُنُّ لَيَجْعَلَنَّكَ اللَّهُ مَعَ صَاحِبَيْكَ.

ئیبن عەبباس ﵄ دەڵێت: کاتێک کە عومەر لەسەر جێگاکەی دانرا، خەڵک دەورەیان دا و دوعایان بۆ دەکرد، یان گوتی: ستاییشیان دەکرد و دوعایان بۆی دەکرد پێش ئەوەی هەڵیبگرن، منیش لەنێویاندا بووم، لەناکاو پیاوێک هاتە سەر سەرم شانی گرتم، منیش ئاوڕم دایەوە بینیم عەلی کوڕی ئەبو تالیبە، ئینجا ڕەحمەتی بۆ عومەر نارد، پاشان گوتی: هیچ کەسێکت دوای خۆت بەجێ نەهێشتووە کە من پێمخۆش بێت بە کردەوەیەک وەک کردەوەی ئەو بە خوا بگەم، جگە لە خۆت، سوێند بە خوا من گومان دەبەم کە خوا لەگەڵ دوو هاوڕێیەکەت بخات (پێغەمبەر ﷺ و ئەبو بەکر)، ئەوەش بەوەی کە زۆر جار لە پێغەمبەری خوا ﷺ دەمبیست کە

دەیفەرموو: «(لە ژیانی دونیادا) ڕۆیشتم لەگەڵ ئەبو بەکر و عومەر، من و ئەبو بەکر و عومەر چووینە ژوورەوە، دەرچووین من و ئەبو بەکر و عومەر»، جا من گومان دەبەم کە خوا بتخاتە گەڵ دوو هاوڕێکەت.

## فَضْلُ عُمَر رضي الله عنه

### ڕێز و گەورەیی عومەر رضي الله عنه

٣٥. عَنْ عَبْدِ اللَّه بْنِ شَقِيقٍ رضي الله عنه قَالَ: قُلْتُ لِعَائِشَةَ رضي الله عنها: أَيُّ أَصْحَابِه كَانَ أَحَبَّ إِلَيْه؟ قَالَتْ: أَبُو بَكْرٍ، قُلْتُ: ثُمَّ أَيُّهمْ؟ قَالَتْ: عُمَرُ قُلْتُ: ثُمَّ أَيُّهمْ؟ قَالَتْ: أَبُو عُبَيْدَةَ.

عەبدوڵلای کوڕی شەقیق رضي الله عنه دەڵێت: بە دایکی ئیمانداران عائیشەم رضي الله عنها گوت: کام لە هاوەڵەکانی لەلای (پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم) خۆشەویستتر بوو، گوتی: ئەبو بەکر، گوتم: ئەی دوای ئەو؟ گوتی: عومەر، گوتم: ئەی دوای ئەو؟ گوتی: ئەبو عوبەیدە.

٣٦. عَنْ أَبِي هرَيْرَةَ رضي الله عنه قَالَ: كُنَّا جُلُوسًا عِنْدَ النَّبِيِّ صلى الله عليه وسلم قَالَ: «بَيْنَا أَنَا نَائِمٌ، رَأَيْتُنِي فِي الْجَنَّةِ، فَإِذَا أَنَا بِامْرَأَةٍ تَتَوَضَّأُ إِلَى جَنْبِ قَصْرٍ، فَقُلْتُ: لِمَنْ هذَا الْقَصْرُ؟»، فَقَالَتْ: لِعُمَرَ، «فَذَكَرْتُ غَيْرَتَه، فَوَلَّيْتُ مُدْبِرًا»، قَالَ أَبُو هرَيْرَةَ: فَبَكَى عُمَرُ، فَقَالَ: أَعَلَيْكَ، بِأَبِي وَأُمِّي، يَا رَسُولَ اللَّه أَغَارُ؟

ئەبو هوڕەیرە رضي الله عنه دەڵێت: ئێمە لە خزمەت پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم دانیشتبووین، ئەویش فەرمووی: «کاتێک من خەوتبووم، خۆمم بینی لەنێو بەهەشتم، جا ئافرەتێکم بینی لە تەنیشت کۆشکێکدا دەستنوێژی دەگرت، گوتم: ئەو کۆشکە بۆ کێیە؟ (ئافرەتەکە) گوتی: بۆ عومەرە، منیش غیرەی عومەرم بیر کەوتەوە، بۆیە گەڕامەوە و پشتم تێ کرد». ئەبو هوڕەیرە رضي الله عنه دەڵێت: ئینجا عومەر گریا و گوتی: بە دایک و باوکمەوە بەقوربانت بم ئەی پێغەمبەری خوا، ئایا من غیرە لە تۆ دەکەم؟

٣٧. عَنْ أَبِي ذَرٍّ ﵁ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «إِنَّ اللَّهَ وَضَعَ الْحَقَّ عَلَى لِسَانِ عُمَرَ يَقُولُ بِهِ».

ئەبو زەڕ ﵁ دەڵێت: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: «بێگومان خوا هەقی خستۆتە سەر زمانی عومەر، ئەویش دەریدەبڕێت».

## فَضْلُ عُثْمَانَ ﵁

## پێگە و گەورەیی عوسمان ﵁

٣٨. عَنْ أَبِي هرَيْرَةَ ﵁: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «لِكُلِّ نَبِيٍّ رَفِيقٌ فِي الْجَنَّةِ، وَرَفِيقِي فِيها عُثْمَانُ بْنُ عَفَّانَ».

ئەبو هورەیرە ﵁ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «هەموو پێغەمبەرێک هاوڕێیەکی هەیە لە بەهەشتدا، هاوڕێی منیش لە بەهەشتدا عوسمانی کوڕی عەففانە».

٣٩. عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «يَا عُثْمَانُ، إِنْ وَلَّاكَ اللَّهُ هذَا الْأَمْرَ يَوْمًا، فَأَرَادَكَ الْمُنَافِقُونَ أَنْ تَخْلَعَ قَمِيصَكَ الَّذِي قَمَّصَكَ اللَّهُ، فَلَا تَخْلَعْه»، يَقُولُ: ذٰلِكَ ثَلَاثَ مَرَّاتٍ. قَالَ النُّعْمَانُ: فَقُلْتُ لِعَائِشَةَ: مَا مَنَعَكِ أَنْ تُعْلِمِي النَّاسَ بِهذَا؟ قَالَتْ: أُنْسِيتُه.

عائیشە ﵂ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «ئەی عوسمان، ئەگەر ڕۆژێک خوا کاروباری خستە ژێر دەستی تۆ، دووڕووەکانیش ویستیان ئەو کراسە (ی دەسەڵاتت) لەبەر دابڕنن کە خوا بەبەریدا کردوویت، ئەوە دایمەڕنە»، سێ جار ئەوەی فەرموو. نوعمان (ڕاوی فەرموودەکە) دەڵێت: بە عائیشەم گوت: چ شتێک ڕێگری لێ کردیت کە ئەو هەواڵە بە خەڵکی بڵێیت؟ گوتی: لەبیرم چووبۆوە.

# فَضْلُ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ ﵁

## پێگە و گەورەیی عەلی کوڕی ئەبو تالیب ﵁

٤٠. عَنْ عَلِيٍّ ﵁ قَالَ: عَهِدَ إِلَيَّ النَّبِيُّ الْأُمِّيُّ ﷺ: أَنَّه لَا يُحِبُّنِي إِلَّا مُؤْمِنٌ، وَلَا يُبْغِضُنِي إِلَّا مُنَافِقٌ.

عەلی ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری نەخوێندەوار ﷺ پەیمانی پێ دام و فەرمووی: هیچ کەسێك منی خۆش ناوێت جگە لە بڕوادار، هیچ کەسێکیش ڕقی لە من نابێتەوە جگە لە دووڕوو.

٤١. عَنْ سَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ ﵁ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّه قَالَ لِعَلِيٍّ: «أَلَا تَرْضَى أَنْ تَكُونَ مِنِّي بِمَنْزِلَةِ هَارُونَ مِنْ مُوسَى».

سەعدی کوڕی ئەبو وەققاص ﵁ لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕاویەتیەوە کە بە عەلی فەرمووە: «ئایا ڕازی نیت بەوەی کە تۆ بۆ من لە جێگە و پێگەی هاڕوون بیت بۆ مووسا».

٤٢. عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﵄ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه ﷺ: «الْحَسَنُ وَالْحُسَيْنُ سَيِّدَا شَبَابِ أَهلِ الْجَنَّةِ، وَأَبُوهمَا خَيْرٌ مِنْهمَا».

ئیبن عومەر ﵄ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: «حەسەن و حوسەین گەورە و سەرداری گەنجانی خەڵکی بەهەشتن، باوکیشیان لە خۆیان باشترە».

٤٣. عَنْ سَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ ﵁ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّه ﷺ يَقُولُ: «مَنْ كُنْتُ مَوْلَاه فَعَلِيٌّ مَوْلَاه»، وَسَمِعْتُه يَقُولُ: «أَنْتَ مِنِّي بِمَنْزِلَةِ هَارُونَ مِنْ مُوسَى، إِلَّا أَنَّه لَا نَبِيَّ بَعْدِي»، وَسَمِعْتُه يَقُولُ: «لَأُعْطِيَنَّ الرَّايَةَ الْيَوْمَ رَجُلًا يُحِبُّ اللَّه وَرَسُولَه».

سەعدی کوڕی ئەبو وەققاص ﵁ دەڵێت: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو

دەیفەرموو: «هەر کەسێك من بە خۆشەویست و پشتیوانی خۆی بزانێت عەلی بە هەمان شێوە خۆشەویستیەتی»، گوێم لێی بوو دەیفەرموو: «تۆ (عەلی) بۆ من لە شوێن هارِوون وای بۆ مووسا، تەنها ئەوە هەیە کە لەدوای من پێغەمبەرێکی دیکە نایەت»، گوێم لێبوو دەیفەرموو: «ئەمرِۆ (لە فەتحی خەیبەردا) ئاڵاکە دەدەمە دەست پیاوێک کە خوا و پێغەمبەرەکەی خۆش دەوێت».

## فَضْلُ الزُّبَيْرِ رضي الله عنه

### پێگە و گەورەیی زوبەیر رضي الله عنه

٤٤. عَنْ جَابِرٍ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَوْمَ قُرَيْظَةَ «مَنْ يَأْتِينَا بِخَبَرِ الْقَوْمِ؟»، فَقَالَ الزُّبَيْرُ: أَنَا، فَقَالَ: «مَنْ يَأْتِينَا بِخَبَرِ الْقَوْمِ؟»، قَالَ الزُّبَيْرُ: أَنَا ثَلَاثًا، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «لِكُلِّ نَبِيٍّ حَوَارِيٌّ، وَإِنَّ حَوَارِيَّ الزُّبَيْرُ».

جابیر رضي الله عنه دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ لە رِۆژی قورەیزەدا فەرمووی: «کێ هەواڵی ئەو کۆمەڵەیەمان بۆ دێنێت؟»، جا زوبەیر گوتی: من، (دووبارە پێغەمبەر ﷺ) فەرمووی: «کێ هەواڵی ئەو کۆمەڵەیەمان بۆ دێنێت؟»، زوبەیریش سێ جار گوتی: من، ئینجا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: «هەموو پێغەمبەرێک دڵسۆز و پشتیوان و خەڵکی تایبەتی خۆی هەبووە، بێگومان دڵسۆز و پشتیوانی منیش زوبەیرە».

## فَضْلُ طَلْحَةَ بْنِ عُبَيْدِ اللَّهِ رضي الله عنه

### پێگە و گەورەیی تەلحەی کورِی عوبەیدوڵلا رضي الله عنه

٤٥. عَنْ جَابِرٍ رضي الله عنه: أَنَّ طَلْحَةَ مَرَّ عَلَى النَّبِيِّ ﷺ فَقَالَ: «شَهِيدٌ يَمْشِي عَلَى وَجْهِ الْأَرْضِ».

جابیر رضي الله عنه دەگێڕێتەوە: تەلحە بە لای پێغەمبەردا ﷺ تێپەڕیی، (پێغەمبەریش ﷺ) فەرمووی: «(تەلحە) شەهیدێکە بەسەر زەویدا دەڕوات».

٤٦. عَنْ قَيْسٍ رضي الله عنه قَالَ: رَأَيْتُ يَدَ طَلْحَةَ شَلَّاءَ، وَقَى بِهَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَوْمَ أُحُدٍ.

قەیس رضي الله عنه دەڵێت: لە ڕۆژی جەنگی ئوحوددا بینیم دەستی تەلحە وشک (ڕەق) بووبوو، پێغەمبەری خوای ﷺ پێ دەپاراست.

## فَضْلُ سَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ رضي الله عنه

### پێگە و گەورەیی سەعدی کوڕی ئەبو وەققاص رضي الله عنه

٤٧. عَنْ سَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ رضي الله عنه يَقُولُ: لَقَدْ جَمَعَ لِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَوْمَ أُحُدٍ أَبَوَيْهِ، فَقَالَ: «ارْمِ سَعْدُ، فِدَاكَ أَبِي وَأُمِّي».

سەعدی کوڕی ئەبو وەققاص رضي الله عنه دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕۆژی ئوحوددا ناوی دایک و باوکی بۆ من کۆ کردنەوە و فەرمووی: «(تیر) بهاوێژە ئەی سەعد، باوک و دایکم فیدات بن».

## فَضَائِلُ الْعَشَرَةِ رضي الله عنهم

### پێگە و گەورەیی دە (مژدەپێدراوەکان) رضي الله عنهم

٤٨. عَنْ سَعِيدِ بْنِ زَيْدِ بْنِ عَمْرِو بْنِ نُفَيْلٍ رضي الله عنه يَقُولُ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَاشِرَ عَشَرَةٍ، فَقَالَ: أَبُو بَكْرٍ فِي الْجَنَّةِ، وَعُمَرُ فِي الْجَنَّةِ، وَعُثْمَانُ فِي الْجَنَّةِ، وَعَلِيٌّ فِي الْجَنَّةِ، وَطَلْحَةُ فِي الْجَنَّةِ، وَالزُّبَيْرُ فِي الْجَنَّةِ، وَسَعْدٌ فِي الْجَنَّةِ، وَعَبْدُ الرَّحْمَنِ فِي الْجَنَّةِ فَقِيلَ لَهُ: مَنِ التَّاسِعُ؟ قَالَ: أَنَا.

سەعیدی کوڕی زەیدی کوڕی عەمڕی کوڕی نوفەیل ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەیەمی یەکەمەکان بوو، فەرمووی: «ئەبو بەکر لە بەهەشتە، عومەر لە بەهەشتە، عوسمان لە بەهەشتە، عەلی لە بەهەشتە، تەلحە لە بەهەشتە، زوبەیر لە بەهەشتە، سەعد لە بەهەشتە، عەبدوڕڕەحمان لە بەهەشتە، بە سەعید گوترا: کێ نۆیەم بوو؟ گوتی: من».

## فَضْلُ أَبِي عُبَيْدَةَ بْنِ الْجَرَّاحِ ﵁

### پێگە و گەورەیی ئەبو عوبەیدەی کوڕی جەڕڕاح ﵁

٤٩. عَنْ حُذَيْفَةَ ﵁: أَنَّ رَسُولَ اللَّه ﷺ قَالَ لِأَهْلِ نَجْرَانَ: «سَأَبْعَثُ مَعَكُمْ رَجُلًا أَمِينًا حَقَّ أَمِينٍ»، قَالَ: فَتَشَرَّفَ لَه النَّاسُ، فَبَعَثَ أَبَا عُبَيْدَةَ بْنَ الْجَرَّاحِ.

حوزەیفە ﵁ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ بە ئەهلی نەجرانی فەرموو: «پیاوێکی ئەمینتان لەگەڵدا دەنێرم کە لەوپەڕی دەستپاکی و ئەمینداریدایە»، گوتی: خەڵکی ئامادەبوو هەموو چاوەڕێی ئەوە بوون بزانن ئەو کەسە کێیە (خاوەنی ئەو سیفەتە بەرزەیە)، (پێغەمبەر ﷺ) ئەبو عوبەیدەی کوڕی جەڕڕاحی لەگەڵدا ناردن.

## فَضْلُ عَبْدِ اللَّه بْنِ مَسْعُودٍ ﵁

### پێگە و گەورەیی عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود ﵁

٥٠. عَنْ عَبْدِ اللَّه بْنِ مَسْعُودٍ ﵁: أَنَّ أَبَا بَكْرٍ وَعُمَرَ ﵄ بَشَّرَاه أَنَّ رَسُولَ اللَّه ﷺ قَالَ: «مَنْ أَحَبَّ أَنْ يَقْرَأَ الْقُرْآنَ غَضًّا كَمَا أُنْزِلَ، فَلْيَقْرَأْه عَلَى قِرَاءَةِ ابْنِ أُمِّ عَبْدٍ».

عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود ﵁ دەگێڕێتەوە: ئەبو بەکر و عومەر ﵄ مژدەیان پێ داوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «هەر کەسێک پێیخۆشە قورئان

بەجوانترین شێوە و وەک ئەوەی دابەزیوە بخوێنێت، با بە خوێندنەوەی کوڕی ئوم عەبد بیخوێنێتەوە».

## فَضْلُ الْحَسَنِ وَالْحُسَيْنِ ابْنَيْ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ ﵃

### پێگە و گەورەیی حەسەن و حوسەین کوڕەکانی عەلی کوڕی ئەبو تالیب ﵃

٥١. عَنْ أَبِي هرَيْرَةَ ﵁: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ لِلْحَسَنِ: «اللَّهمَّ إِنِّي أُحِبُّه فَأَحِبَّه، وَأَحِبَّ مَنْ يُحِبُّه»، قَالَ: وَضَمَّه إِلَى صَدْرِه.

ئەبو هورەیرە ﵁ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ بە حەسەنی ﵁ فەرمووە: «خودایە من حەسەنم خۆش دەوێت تۆش خۆشت بوێت، ئەوەی ئەویشی خۆش دەوێت خۆشت بوێت»، (ئەبو هورەیرە ﵁) دەڵێت: جا پێغەمبەر ﷺ حەسەنی گوشی بە سنگی خۆیەوە.

## فَضْلُ عَمَّارِ بْنِ يَاسِرٍ ﵁

### پێگە و گەورەیی عەمماری کوڕی یاسیر ﵁

٥٢. عَنْ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ ﵁ قَالَ: كُنْتُ جَالِسًا عِنْدَ النَّبِيِّ ﷺ: فَاسْتَأْذَنَ عَمَّارُ بْنُ يَاسِرٍ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «ائْذَنُوا لَه، مَرْحَبًا بِالطَّيِّبِ الْمُطَيَّبِ».

عەلی کوڕی ئەبو تالیب ﵁ دەڵێت: لە خزمەت پێغەمبەر ﷺ دانیشتبووم لەو کاتەدا عەمماری کوڕی یاسیر مۆڵەتی هاتنەژووری خواست، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: «ڕێگای پێ بدەن، بەخێر بێی ئەی پاکی پاکەوەبوو».

✎ تێبینی:

مەبەست لەم ستایشکردنە ئەوەیە: کە لە زاتی خۆیدا پاکە و بە کردەوە و خۆڕاگریش پاکتر و باشتر بووە.

٥٣. عَنْ هانِئِ بْنِ هانِئٍ ﵁ قَالَ: دَخَلَ عَمَّارٌ عَلَى عَلِيٍّ، فَقَالَ: مَرْحَبًا بِالطَّيِّبِ الْمُطَيَّبِ، سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّه ﷺ يَقُولُ: «مُلِئَ عَمَّارٌ إِيمَانًا إِلَى مُشَاشِه».

هانیئی کوڕی هانیئ ﵁ دەڵێت: عەممار ﵁ هاتە لای عەلی ﵁ ئەویش گوتی: بەخێر بێی پاکی پاکەوەبوو، گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بووە کە دەیفەرموو: «عەممار تا سەر ئێسقانی پڕ بووە لە ئیمان».

تێبینی:

(مشاش): واتە: سەری ئێسقان، وەکوو ئانیشک و شان.

٥٤. عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّه ﷺ: «عَمَّارٌ مَا عُرِضَ عَلَيْه أَمْرَانِ إِلَّا اخْتَارَ الْأَرْشَدَ مِنْهمَا».

عائیشە ﵂ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «هیچ کات نەبووە دوو فەرمان (یان دوو شت) خرابێتە بەردەم عەممار، ئەوە بێگومان ڕاسترینەکەیانی هەڵبژاردووە».

## فَضَائِلُ خَبَّابٍ ﵁

### پێگە و گەورەیی خەبباب ﵁

٥٥. عَنْ أَبِي لَيْلَى الْكِنْدِيِّ ﵁ قَالَ: جَاءَ خَبَّابٌ ﵁ إِلَى عُمَرَ ﵁ فَقَالَ: ادْنُ، فَمَا أَحَدٌ أَحَقَّ بِهذَا الْمَجْلِسِ مِنْكَ إِلَّا عَمَّارٌ، فَجَعَلَ خَبَّابٌ يُرِيه آثَارًا بِظَهرِه مِمَّا عَذَّبَه الْمُشْرِكُونَ.

ئەبو لەیلای کیندی ﵁ دەڵێت: خەبباب ﵁ هات بۆ لای عومەر ﵁، عومەریش ﵁ گوتی: نزیک بەرەوە، هیچ کەسێک لە تۆ شایستەتر نییە بەو کۆڕ و مەجلیسە جگە لە عەممار، خەببابیش شوێنەواری ئەشکەنجەدانی هاوبەشدانەرانی نیشان

دەدا کە بە پشتیەوە بوون.

## فَضَائِلُ زَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ رضي الله عنه

### پێگە و گەورەیی زەیدی کوڕی سابیت رضي الله عنه

٥٦. عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رضي الله عنه: أَنَّ رَسُولَ اللَّه ﷺ قَالَ: «أَرْحَمُ أُمَّتِي بِأُمَّتِي أَبُو بَكْرٍ، وَأَشَدُّهم فِي دِينِ اللَّه عُمَرُ، وَأَصْدَقُهم حَيَاءً عُثْمَانُ، وَأَقْضَاهم عَلِيُّ بْنُ أَبِي طَالِبٍ، وَأَقْرَؤُهم لِكِتَابِ اللَّه أُبَيُّ بْنُ كَعْبٍ، وَأَعْلَمُهم بِالْحَلَالِ وَالْحَرَامِ مُعَاذُ بْنُ جَبَلٍ، وَأَفْرَضُهم زَيْدُ بْنُ ثَابِتٍ، أَلَا وَإِنَّ لِكُلِّ أُمَّةٍ أَمِينًا، وَأَمِينُ هذِه الْأُمَّةِ أَبُو عُبَيْدَةَ بْنُ الْجَرَّاحِ».

ئەنەسی کوڕی مالیک رضي الله عنه دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «بەبەزەییترین کەس لە ئوممەتەکەم بۆ ئوممەتەکەم ئەبو بەکرە، توندترین کەس بۆ ئایینی خوا (بۆ پاراستنی سنوورەکانی) عومەرە، ڕاستگۆترینیان لە حەیا و شەرمدا عوسمانە، سەرڕاسترینیان لە حوکم و قەزادا عەلی کوڕی ئەبو تالیبە، شارەزاترینیان لە خوێندنەوەی قورئان ئوبەی کوڕی کەعبە، زاناترینیان لە حەڵاڵ و حەرامدا موعازی کوڕی جەبەلە، شارەزاترینیان لە میراتدا زەیدی کوڕی سابیتە، ئاگادار بن بەڕاستی هەموو ئوممەتێک ئەمینداریێکی هەیە، ئەمینداری ئەو ئوممەتە ئەبو عوبەیدەی کوڕی جەڕڕاحە».

## فَضْلُ أَبِي ذَرّ رضي الله عنه

### پێگە و گەورەیی ئەبو زەڕ رضي الله عنه

٥٧. عَنْ عَبْدِ اللَّه بْنِ عَمْرٍو رضي الله عنهما قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّه ﷺ يَقُولُ: «مَا أَقَلَّتِ الْغَبْرَاءُ، وَلَا أَظَلَّتِ الْخَضْرَاءُ، مِنْ رَجُلٍ أَصْدَقَ لَهجَةً مِنْ أَبِي ذَرٍّ».

عەبدوڵڵای کوڕی عەمر ﵄ دەڵێت: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: «زەوی هیچ کەسێکی هەڵنەگرتووە و ئاسمانیش سێبەری لە هیچ کەسێك نەکردووە، ڕاستگۆتر بێت لە ئەبو زەڕ».

## فَضْلُ سَعْدِ بْنِ مُعَاذٍ ﵁

### پێگە و گەورەیی سەعدی کوڕی مەعاز ﵁

٥٨. عَنِ الْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ ﵁ قَالَ: أُهدِيَ لِرَسُولِ اللَّه ﷺ سَرَقَةٌ مِنْ حَرِيرٍ، فَجَعَلَ الْقَوْمُ يَتَدَاوَلُونَها بيْنَهمْ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّه ﷺ: «أَتَعْجبُونَ مِنْ هذَا؟»، فَقَالُوا لَه: نَعَمْ يَا رَسُولَ اللَّه، فَقَالَ: «وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِه، لَمَنَادِيلُ سَعْدِ بْنِ مُعَاذٍ فِي الْجَنَّةِ خَيْرٌ مِنْ هذَا».

بەڕائی کوڕی عازیب ﵁ دەڵێت: پارچە قوماشێکی ئاوریشم بە دیاری هێنرا بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ، خەڵکیش لە نێوان خۆیاندا دەستاودەستیان پێ دەکرد (و تەماشایان دەکرد)، ئینجا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: «ئایا سەرسام بوون بەمە (بە جوانی ئەو پارچە قوماشە)؟»، ئەوانیش گوتیان: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: «سوێند بەو کەسەی کە گیانی منی بەدەستە، ئەم مەندیلەی سەعدی کوڕی مەعاز لە بەهەشتدا باشترە لەو پارچە قوماشە».

٥٩. عَنْ جَابِرٍ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه ﷺ: «اهتَزَّ عَرْشُ الرَّحْمَنِ لِمَوْتِ سَعْدِ بْنِ مُعَاذٍ».

جابیر ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «عەڕشی خوای بەبەزەیی بۆ مردنی سەعدی کوڕی موعاز هەژا و لەرزیی».

## فَضْلُ جَرِيرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ الْبَجَلِيِّ ﷺ

### پێگە و گەورەیی جەریری کوڕی عەبدوڵڵای بەجەلی ﷺ

٦٠. عَنْ جَرِيرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ الْبَجَلِيِّ ﷺ قَالَ: مَا حَجَبَنِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مُنْذُ أَسْلَمْتُ، وَلَا رَآنِي إِلَّا تَبَسَّمَ فِي وَجْهِي، وَلَقَدْ شَكَوْتُ إِلَيْه أَنِّي لَا أَثْبُتُ عَلَى الْخَيْلِ، فَضَرَبَ بِيَدِه فِي صَدْرِي، فَقَالَ: «اللَّهمَّ ثَبِّتْه وَاجْعَلْه هادِيًا مَهدِيًّا».

جەریری کوڕی عەبدوڵڵای بەجەلی ﷺ دەڵێت: لەو کاتەوەی موسوڵمان بووم، هیچ کاتێک پێغەمبەری خوا ﷺ دەستی بە ڕووەوە نەناوم (هیچ داواکارییەکی ڕەت نەکردوومەوە)، هیچ جارێک منی نەبینیوە، مەگەر بە ڕوومدا زەردەخەنەی کردووە، من سکاڵای ئەوەم لەلا کرد کە ناتوانم لەسەر ئەسپ خۆم ڕابگرم، ئەویش بە دەستی خۆی دای بەسەر سنگمدا و فەرمووی: «خوایە خۆڕاگری بکە، بیگێڕە لەوانەی کە هیدایەتیان وەرگرتووە، بیکە بە هیدایەتدەر».

## فَضْلُ الْأَنْصَارِ

### پێگە و گەورەیی پشتیوانان

٦١. عَنِ الْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه ﷺ: «مَنْ أَحَبَّ الْأَنْصَارَ أَحَبَّه اللَّه، وَمَنْ أَبْغَضَ الْأَنْصَارَ أَبْغَضَه اللَّه». قَالَ شُعْبَةُ: قُلْتُ لِعَدِيٍّ: أَسَمِعْتَه مِنَ الْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ؟ قَالَ: إِيَّايَ حَدَّثَ.

بەڕائی کوڕی عازیب ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «هەر کەسێك ئەنصارِی خۆش بوێت، ئەوە خوا خۆشی دەوێت، هەر کەسێکش ڕقی لە ئەنصارِ بێت، ئەوە خوا ڕقی لێیەتی». شوعبە دەڵێت: بە عەدیم گوت: تۆ لە بەڕائی کوڕی عازیبت بیستووە؟ گوتی: بۆ خودی منی گێڕایەوە.

## فَضْلُ ابْنِ عَبَّاسٍ ﭬ

### پێگە و گەورەیی ئیبن عەبباس ﭬ

٦٢. عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﭬ قَالَ: ضَمَّنِي رَسُولُ اللَّه ﷺ إِلَيْه وَقَالَ: «اللَّهمَّ عَلِّمْه الْحِكْمَةَ، وَتَأْوِيلَ الْكِتَابِ».

ئیبن عەبباس ﭬ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ منی بەخۆیەوە گوشی و فەرمووی: «ئەی پەروەردگار فێری دانایی و لێکدانەوەی تەفسیری قورئانی بکە».

## بَابٌ فِي ذِكْرِ الْخَوَارِجِ

### باسێک دەربارەی خەواریج

٦٣. عَنْ أَبِي ذَرٍّ ﭬ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه ﷺ: «إِنَّ بَعْدِي مِنْ أُمَّتِي، أَوْ سَيَكُونُ بَعْدِي مِنْ أُمَّتِي قَوْمٌ يَقْرَءُونَ الْقُرْآنَ لَا يُجَاوِزُ حُلُوقَهمْ، يَمْرُقُونَ مِنَ الدِّينِ كَمَا يَمْرُقُ السَّهمُ مِنَ الرَّمِيَّةِ، ثُمَّ لَا يَعُودُونَ فِيه، همْ شِرَارُ الْخَلْقِ وَالْخَلِيقَةِ». قَالَ عَبْدُ اللَّه بْنُ الصَّامِتِ ﭬ: فَذَكَرْتُ ذَلِكَ لِرَافِعِ بْنِ عَمْرٍو، أَخِي الْحَكَمِ بْنِ عَمْرٍو الْغِفَارِيِّ، فَقَالَ: وَأَنَا أَيْضًا قَدْ سَمِعْتُه مِنْ رَسُولِ اللَّه.

ئەبو زەڕ ﭬ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «بێگومان لەدوای من هەندێک لە ئوممەتەکەم یان (فەرمووی:) لەدوای من خەڵکانێک لە ئوممەتەکەم پەیدا دەبن قورئان دەخوێنن، بەڵام لە گەروویان ناچێتە خوار، لە ئایین دەردەچن وەکوو چۆن تیر (لە نێچیر) دەردەچێت، دوای ئەوەش نایێنەوە نێو ئیسلام، ئەوانە خراپترینی دروستکراوەکانن». عەبدوڵڵای کوڕی صامیت ﭬ دەڵێت: ئەوەم بۆ ڕافیعی کوڕی عەمر، برای حەکەمی کوڕی عەمری غیفاری باس کرد، ئەویش گوتی: منیش بە هەمان شێوە بیستوومە لە پێغەمبەری خوا ﷺ.

٦٤. عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّه ﵄ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّه ﷺ: بِالْجِعْرَانَةِ وَهوَ يَقْسِمُ التِّبْرَ وَالْغَنَائِمَ، وَهوَ فِي حِجْرِ بِلَالٍ، فَقَالَ رَجُلٌ: اعْدِلْ يَا مُحَمَّدُ فَإِنَّكَ لَمْ تَعْدِلْ، فَقَالَ: «وَيْلَكَ، وَمَنْ يَعْدِلُ بَعْدِي إِذَا لَمْ أَعْدِلْ؟»، فَقَالَ عُمَرُ: دَعْنِي يَا رَسُولَ اللَّه حَتَّى أَضْرِبَ عُنُقَ هذَا الْمُنَافِقِ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّه ﷺ: «إِنَّ هذَا فِي أَصْحَابٍ، أَوْ أُصَيْحَابٍ لَه، يَقْرَءُونَ الْقُرْآنَ لَا يُجَاوِزُ تَرَاقِيَهمْ، يَمْرُقُونَ مِنَ الدِّينِ كَمَا يَمْرُقُ السَّهمُ مِنَ الرَّمِيَّةِ».

جابیری کوڕی عەبدوڵلا ﵄ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ لە جیعڕانە بوو، ئەویش زێڕ و زیو و دەستکەوتی جەنگی دابەش دەکرد، کە لەژێر چاودێری و پارێزگاری بیلالدا بوو، ئینجا پیاوێک، گوتی: ئەی موحەممەد، دادگەر بە، تۆ دادگەریت نەکرد، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: «هاوار بۆ تۆ، ئەگەر من دادگەر نەبم ئەی کێ لەدوای من دادگەر دەبێت؟»، ئینجا عومەر گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ لێم بگەڕێ با لە گەردنی ئەو دووڕووە بدەم، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: «بێگومان (ئەوە تەنها نییە) هاوڕێی دیکەی هەن، یان چەند هاوڕێیەکی کەمن، کە قورئان دەخوێنن لە گەروویان تێناپەڕێت (بۆ نێو دڵیان)، لە ئایین دەردەچن وەکوو چۆن تیر (لە نێچیر) دەردەچێت».

## بَابُ مَنْ سَنَّ سُنَّةً حَسَنَةً أَوْ سَيِّئَةً

### باسی ئەو کەسەی کە ڕێچکەیەکی چاک یان خراپ دادەهێنێت

٦٥. عَنْ أَبِي هرَيْرَةَ ﵁ قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ: فَحَثَّ عَلَيْه، فَقَالَ رَجُلٌ، عِنْدِي كَذَا وَكَذَا، قَالَ، فَمَا بَقِيَ فِي الْمَجْلِسِ رَجُلٌ إِلَّا تَصَدَّقَ عَلَيْه بِمَا قَلَّ أَوْ كَثُرَ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّه ﷺ: «مَنِ اسْتَنَّ خَيْرًا فَاسْتُنَّ بِه، كَانَ لَه أَجْرُه كَامِلًا، وَمِنْ أُجُورِ مَنِ اسْتَنَّ بِه، وَلَا يَنْقُصُ مِنْ أُجُورِهمْ شَيْئًا، وَمَنِ اسْتَنَّ سُنَّةً سَيِّئَةً فَاسْتُنَّ بِه، فَعَلَيْه وِزْرُه كَامِلًا، وَمِنْ أَوْزَارِ الَّذِي اسْتَنَّ بِه، وَلَا يَنْقُصُ مِنْ أَوْزَارِهمْ شَيْئًا».

ئەبو هوڕەیڕە ﵁ دەڵێت: پیاوێکی هەژار هات بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ، (پێغەمبەریش

ﷺ) ئامادەبووانی هان دا بۆ یارمەتیدانی، جا پیاوێک لەوانەی ئامادە بوون، گوتی: من ئەوە و ئەوەم هەیە (واتە: هەڵسا بە یارمەتیدانی ئەو هەژارە)، دوای ئەوە هەر یەکێک لەوانەی لە کۆڕەکەدا ئامادەبوون یارمەتی کابرایان دا، بە کەم یان بە زۆر (بەپێی توانا)، جا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: «هەر کەسێک یەکەم جار ڕێگایەک بگرێتە بەر کە جێی ڕەزامەندی خوا بێت و کاری پێ بکرێت، ئەوە پاداشتی ئەو کردەوەیەی بەتەواوی بۆ هەیە، وە (بەئەندازەی) ئەو کەسەش کە دوای ئەو کاری پێ دەکات پاداشتی بۆ هەیە، بێ ئەوەی لە پاداشتی هیچیان کەم ببێتەوە، هەر کەسێکیش ڕێگایەکی خراپ دابهێنێت و کاری پێ بکرێت، ئەوە گوناهی ئەو کارەی بۆ هەیە بەتەواوی، بەئەندازەی گوناهی ئەو کەسەش کە بەهۆی ئەوەوە ئەو ڕێگایە دەگرێتە بەر گوناهی بۆ هەیە، بێ ئەوەی لە گوناهی هیچیان کەم ببێتەوە».

٦٦. عَنْ أَبِي هرَيْرَةَ رضي الله عنه: أَنَّ رَسُولَ اللّٰه ﷺ قَالَ: «مَنْ دَعَا إِلَى هدًى، كَانَ لَه مِنَ الْأَجْرِ مِثْلُ أُجُورِ مَنِ اتَّبَعَه، لَا يَنْقُصُ ذَلِكَ مِنْ أُجُورِهِمْ شَيْئًا، وَمَنْ دَعَا إِلَى ضَلَالَةٍ، فَعَلَيْه مِنَ الْإِثْمِ مِثْلُ آثَامِ مَنِ اتَّبَعَه، لَا يَنْقُصُ ذَلِكَ مِنْ آثَامِهِمْ شَيْئًا».



ئەبو هوڕەیرە رضي الله عنه دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «هەر کەسێک بانگەشە بکات بۆ ڕێگایەک کە جێی ڕەزامەندی خوا بێت، ئەوە بەئەندازەی پاداشتی ئەوانەی کە شوێنی دەکەون پاداشتی بۆ هەیە، بێ ئەوەی لە پاداشتی هیچیان کەم بکرێتەوە، هەر کەسێکیش بانگەشەی گومڕایی بکات بەئەندازەی گوناهی ئەوانەی کە شوێنی دەکەون گوناهی بۆ دەنووسرێت، بێ ئەوەی لە گوناهی هیچیان کەم بکرێتەوە».

## بَابُ فَضْلِ مَنْ تَعَلَّمَ الْقُرْآنَ وَعَلَّمَه

### باسی پێگەی کەسێك کە فێری قورئان دەبێت و خەڵکیش فێر دەکات

٦٧. عَنْ عُثْمَانَ بْنِ عَفَّانَ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللّٰه ﷺ: «أَفْضَلُكُمْ مَنْ تَعَلَّمَ الْقُرْآنَ وَعَلَّمَه».

عوسمانی کوڕی عەففان ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «چاکترینتان ئەو کەسەیە کە قورئان فێر ببێت (و کاری پێ بکات) و، خەڵکیش فێری قورئان بکات».

٦٨. عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه ﷺ: «إِنَّ لِلَّه أَهلِينَ مِنَ النَّاسِ»، قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّه، مَنْ همْ؟ قَالَ: «همْ أَهلُ الْقُرْآنِ، أَهلُ اللَّه وَخَاصَّتُه».

ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «بێگومان خوا خەڵکی تایبەتی هەن لەنێو خەڵکیدا»، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوانە کێن؟ فەرمووی: «ئەوانە ئەو کەسانەن کە هەڵگری قورئانن (بە لەبەرکردن و خوێندنەوە و کارپێکردنی)، ئەوانە کەسانی تایبەتی خوان».

٦٩. عَنْ عَامِرِ بْنِ وَاثِلَةَ أَبِي الطُّفَيْلِ ﷺ: أَنَّ نَافِعَ بْنَ عَبْدِ الْحَارِثِ ﷺ لَقِيَ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ ﷺ بِعُسْفَانَ، وَكَانَ عُمَرُ، اسْتَعْمَلَه عَلَى مَكَّةَ، فَقَالَ عُمَرُ: مَنِ اسْتَخْلَفْتَ عَلَى أَهلِ الْوَادِي؟ قَالَ: اسْتَخْلَفْتُ عَلَيْهمْ ابْنَ أَبْزَى، قَالَ: وَمَنِ ابْنُ أَبْزَى؟ قَالَ: رَجُلٌ مِنْ مَوَالِينَا، قَالَ عُمَرُ، فَاسْتَخْلَفْتَ عَلَيْهمْ مَوْلًى، قَالَ: إِنَّه قَارِئٌ لِكِتَابِ اللَّه تَعَالَى، عَالِمٌ بِالْفَرَائِضِ، قَاضٍ، قَالَ عُمَرُ، أَمَا إِنَّ نَبِيَّكُمْ ﷺ قَالَ: «إِنَّ اللَّه يَرْفَعُ بِهذَا الْكِتَابِ أَقْوَامًا، وَيَضَعُ بِه آخَرِينَ».

عامری کوڕی واسیلەی ئەبو توفەیل ﷺ دەگێڕێتەوە: نافیعی کوڕی عەبدولحاریس ﷺ لە عوسفان (شوێنێکە) گەیشت بە عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ، عومەر نافیعی ڕاسپاردبوو بۆ کاروباری مەککە و سەرپەرشتیکردنی، عومەر (کە نافیعی لەوێ بینی) گوتی: چ کەسێکت لە شوێنی خۆت داناوە بۆ ڕاپەڕاندنی کارەکانت؟ نافیعیش گوتی: ئیبن ئەبزا لەجێی من کارەکان دەکات، عومەر گوتی: ئیبن ئەبزا کێیە؟ ئەویش گوتی: یەکێکە لە مەوالییەکان (واتە: عەرەب نییە)، عومەریش گوتی: یەکێك لە مەوالییەکانت کردۆتە جێنشینی خۆت؟ نافیع گوتی: (ئاخر) ئەو شارەزایە بە خوێندنی قورئان، زانایە بە زانستی میرات، قازییە، ئینجا عومەر گوتی:

پێغەمبەرەکەتان ﷺ فەرموویەتی: «بێگومان بەهۆی ئەم قورئانە و کارکردن پێی خوا کۆمەڵێک بەرز دەکاتەوە و کۆمەڵێکیش نزم دەکاتەوە».

## بَابُ فَضْلِ الْعُلَمَاءِ وَالْحَثِّ عَلَى طَلَبِ الْعِلْمِ

### باسی پێگە و گەورەیی زانایان و هاندان بۆ فێربوونی زانست

٧٠. عَنْ أَبِي هرَيْرَةَ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه ﷺ: «مَنْ يُرِدِ اللَّه بِه خَيْرًا يُفَقِّهه فِي الدِّينِ».

ئەبو هورەیرە رضي الله عنه دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «ئەگەر خوا چاکە و خێری بۆ کەسێک بوێت، ئەوە شارەزای دەکات لە ئایین (ڕێگای فێربوون و کارپێکردنی بۆ ئاسان دەکات)».

٧١. عَنْ زِرِّ بْنِ حُبَيْشٍ رضي الله عنه قَالَ: أَتَيْتُ صَفْوَانَ بْنَ عَسَّالٍ الْمُرَادِيَّ، فَقَالَ: مَا جَاءَ بِكَ؟ قُلْتُ: أُنْبِطُ الْعِلْمَ، قَالَ: فَإِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّه ﷺ يَقُولُ: «مَا مِنْ خَارِجٍ خَرَجَ مِنْ بَيْتِه فِي طَلَبِ الْعِلْمِ، إِلَّا وَضَعَتْ لَه الْمَلَائِكَةُ أَجْنِحَتَها رِضًا بِمَا يَصْنَعُ».

زیری کوڕی حوبەیش رضي الله عنه دەڵێت: هاتم بۆ لای صەفوانی کوڕی عەسسالی موڕادی، ئەویش گوتی: چی تۆی هێناوە بۆ ئێرە؟ گوتم: دەمەوێت فێری زانست ببم، ئەویش گوتی: من گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: «هەر کەس لە ماڵ دەربچێت و مەبەستی لە دەرچوونەکە وەرگرتن و فێربوونی زانست بێت، ئەوە فریشتەکان بۆ گەورەیی و ڕەزامەندی ئەوەی دەیکات باڵەکانیان ڕادەخەن».

٧٢. عَنْ أَبِي هرَيْرَةَ رضي الله عنه قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّه ﷺ يَقُولُ: «مَنْ جَاءَ مَسْجِدِي هذَا، لَمْ يَأْتِه إِلَّا لِخَيْرٍ يَتَعَلَّمُه أَوْ يُعَلِّمُه، فَهوَ بِمَنْزِلَةِ الْمُجَاهدِ فِي سَبِيلِ اللَّه، وَمَنْ جَاءَ لِغَيْرِ ذَلِكَ، فَهوَ بِمَنْزِلَةِ الرَّجُلِ يَنْظُرُ إِلَى مَتَاعِ غَيْرِه».

ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێت: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: «هەر کەسێک هات بۆ ئەو مزگەوتەی من و هاتنەکەشی تەنها بۆ ئەوە بوو چاکەیەک فێر بێت، یان فێری کەسێکی بکات، ئەوە لە شوێنی ئەو کەسەیە کە لەپێناو خوادا تێدەکۆشێت، وە هەر کەس بۆ جگە لەمە هاتبێت (بۆ مەبەستی فێربوون و فێرکردن نەهاتبێت)، ئەوە وەک ئەو کەسە وایە کە تەماشای کەلوپەلی کەسێکی دیکە بکات».

## بَابُ مَنْ بَلَّغَ عِلْمًا

### باسی ئەو کەسەی کە زانستێک دەگەیەنێت

٧٣. عَنْ زَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «نَضَّرَ اللَّه امْرَأً سَمِعَ مَقَالَتِي فَبَلَّغَها، فَرُبَّ حَامِلِ فِقْه غَيْرِ فَقِيه، وَرُبَّ حَامِلِ فِقْه إِلَى مَنْ هوَ أَفْقَه مِنْه»، زَادَ فِيه عَلِيُّ بْنُ مُحَمَّدٍ: «ثَلَاثٌ لَا يُغِلُّ عَلَيْهِنَّ قَلْبُ امْرِئٍ مُسْلِمٍ: إِخْلَاصُ الْعَمَلِ لِلَّه، وَالنُّصْحُ لِأَئِمَّةِ الْمُسْلِمِينَ، وَلُزُومُ جَمَاعَتِهِمْ».

زەیدی کوڕی سابیت ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «خوا ڕووی ئەو کەسە ڕۆشن و جوان بکات کە قسەیەکی من دەبیستێت و بڵاوی دەکاتەوە، چونکە هەندێك کەس هەیە بەڵگە شەرعییەکانی لایە، بەڵام ناتوانێت حوکمە شەرعییەکانی لێ دەربێنێت (بەڵام کاتێک بۆ کەسێکی شارەزاتر دەیگێڕێتەوە، ئەوە ئەو کەسە دەتوانێت حوکمە شەرعییەکانی لێ هەڵبێنجێت)، هەندێك کەس هەیە شارەزایە، بەڵام دەیگەیەنێت بە کەسێک کە لە خۆی شارەزاترە»، عەلی کوڕی موحەممەد ئەوەشی لێ زیاد کردووە: «سێ شت هەیە کە لەنێو دڵی هەر موسوڵمانێک هەبن ناپاکی ناکات: کارکردن بەدڵسۆزی تەنها لەبەر خوا، دڵسۆزی و چاکەویستن بۆ پێشەوایانی موسوڵمانان، پابەندبوون بە کۆمەڵی موسوڵمانان».

٧٤. عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَبْدِ اللَّه، عَنْ أَبِيه ﷺ: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «نَضَّرَ اللَّه امْرَأً سَمِعَ مِنَّا حَدِيثًا فَبَلَّغَه، فَرُبَّ مُبَلَّغٍ أَحْفَظُ مِنْ سَامِعٍ».

عەبدوڕڕەحمانی کوڕی عەبدوڵڵا لە باوکیەوە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: «خوا ڕووی ئەو کەسە ڕۆشن و جوان بکات کە فەرموودەیەکی من دەبیستێت و پاشان دەیگەیەنێت بە خەڵکی دیکە، چونکە هەندێك کەس هەیە کە فەرموودەکەی پێ دەگات شارەزاتر و پارێزگارترە لەو کەسەی کە لە منەوە بیستوویەتی».

## بَابُ ثَوَابِ مُعَلِّمِ النَّاسَ الْخَيْرَ

## باسی پاداشتی ئەو کەسەی خەڵک فێری چاکە دەکات

٧٥. عَنْ أَبِي الدَّرْدَاءِ ﷺ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّه ﷺ يَقُولُ: «إِنَّه لَيَسْتَغْفِرُ لِلْعَالِمِ مَنْ فِي السَّمَاوَاتِ، وَمَنْ فِي الْأَرْضِ، حَتَّى الْحِيتَانِ فِي الْبَحْرِ».

ئەبو دەرداء ﷺ دەڵێت: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: «بەڕاستی ئەو کەسەی کە زانایە (کار بە زانستەکەشی دەکات)، ئەوەی لە ئاسمانەکان و زەوی هەیە داوای لێخۆشبوونی بۆ دەکەن، هەتا نەهەنگەکانی نێو دەریاش».

٧٦. عَنْ عَبْدِ اللَّه بْنِ أَبِي قَتَادَةَ، عَنْ أَبِيه ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه ﷺ: «خَيْرُ مَا يُخَلِّفُ الرَّجُلُ مِنْ بَعْدِه ثَلَاثٌ: وَلَدٌ صَالِحٌ يَدْعُو لَه، وَصَدَقَةٌ تَجْرِي يَبْلُغُه أَجْرُها، وَعِلْمٌ يُعْمَلُ بِه مِنْ بَعْدِه».

عەبدوڵڵای کوڕی ئەبو قەتادە لە باوکیەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «باشترین شتێک کە پیاو لەدوای خۆی جێی دەهێڵێت سێ شتە: منداڵێکی چاکەکار کە دوعای بۆ بکات، چاکەیەکی بەردەوام کە بەهەمیشەیی خێرەکەی پێ دەگات (وەک دروستکردنی مزگەوت و پرد و نەخۆشخانە و بیری ئاو و ... هتد)، زانستێک کە لەدوای خۆی کاری پێ دەکرێت».

## بَابُ مَنْ كَرِه أَنْ يُوطَأَ عَقِبَاه

### باسی ئەو کەسەی کە حەز ناکات خەڵکی لەدوایەوە بڕۆن

٧٧. عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّه ﵄ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ: إِذَا مَشَى مَشَى أَصْحَابُه أَمَامَه وَتَرَكُوا ظَهرَه لِلْمَلَائِكَةِ.

جابیری کوڕی عەبدوڵڵا ﵄ دەڵێت: کاتێک پێغەمبەر ﷺ بەڕێگادا دەڕۆیشت، هاوەڵەکانی لەپێشی دەڕۆیشتن (یان لە تەنیشتی) و دواوەیان بۆ فریشتەکان جێ دەهێشت.

## بَابُ الِانْتِفَاعِ بِالْعِلْمِ وَالْعَمَلِ بِه

### باسی سوودوەرگرتن لە زانست و کارپێکردنی

٧٨. عَنْ أَبِي هرَيْرَةَ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه ﷺ: «مَنْ تَعَلَّمَ عِلْمًا مِمَّا يُبْتَغَى بِه وَجْه اللَّه، لَا يَتَعَلَّمُه إِلَّا لِيُصِيبَ بِه عَرَضًا مِنَ الدُّنْيَا، لَمْ يَجِدْ عَرْفَ الْجَنَّةِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ».

ئەبو هورەیرە ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «هەر کەسێك زانستێک فێر بێت کە ئەو زانستە پێویستە تەنها بۆ خاتری خوا بێت (بۆ خزمەتی دین و ژینی خەڵکی بێت)، بەڵام ئەو تەنها بۆ مەبەستی بەدەستهێنانی دونیا فێری ببێت، ئەوا ئەو کەسە لە ڕۆژی دواییدا بۆنی بەهەشت ناکات لە ڕۆژی دواییدا».

٧٩. عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﵄ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «مَنْ طَلَبَ الْعِلْمَ لِيُمَارِيَ بِه السُّفَهاءَ، أَوْ لِيُبَاهِيَ بِه الْعُلَمَاءَ، أَوْ لِيَصْرِفَ وُجُوه النَّاسِ إِلَيْه، فَهوَ فِي النَّارِ».

ئیبن عومەر ﵄ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: «هەر کەسێک فێری زانست ببێت بۆ ئەوەی لەگەڵ خەڵکی کاڵفام مشتومڕ بکات، یان شانازی پێوە

بکات بەسەر زانایاندا، یان بیەوێت سەرنجی خەڵک بۆ لای خۆی ڕابکێشێت، ئەوە لەنێو ئاگردایە».

## بَابُ مَنْ سُئِلَ عَنْ عِلْمٍ فَكَتَمَه

### باسی ئەو کەسەی پرسیاری زانستێکی لێ دەکرێت و دەیشارێتەوە

**٨٠. عَنْ أَبِي هرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه ﷺ: «مَنْ سُئِلَ عَنْ عِلْمٍ يَعْلَمُه فكَتَمَه، أُلْجِمَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ بِلِجَامٍ مِنْ نَارٍ».**

ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «هەر کەسێک پرسیاری زانیاریەکی لێ کرا، بیزانێت و بیشارێتەوە (بۆ ئەوەی کەس سوودی لێ نەبینێت)، مسۆگەر لە ڕۆژی دواییدا دەهێنرێت لە کاتێکدا کە لغاو کراوە بە لغاوێکی ئاگرین».

# كِتَابُ الطَّهارَةِ وَسُنَنِها

## پەرتووکی پاکوخاوێنی و سوننەتەکانی

### بَابُ لَا يَقْبَلُ اللَّهُ صَلَاةً بِغَيْرِ طُهورٍ

باسی نوێژێک کە بەبێ دەستنوێژی بکرێت خوا وەریناگرێت



٨١. عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا يَقْبَلُ اللَّهُ صَلَاةً إِلَّا بِطُهورٍ، وَلَا صَدَقَةً مِنْ غُلُولٍ».

ئیبن عومەر ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «خوا هیچ نوێژێک وەرناگرێت کە بەبێ دەستنوێژ کرابێت، هیچ بەخشینێکیش وەرناگرێت کە بە ماڵی دزیاری و حەرام پەیدا کرابێت».

### بَابُ الْمُحَافَظَةِ عَلَى الْوُضُوءِ

باسی پارێزگاریکردن لە دەستنوێژ بەبەردەوامی

٨٢. عَنْ ثَوْبَانَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «اسْتَقِيمُوا، وَلَنْ تُحْصُوا، وَاعْلَمُوا أَنَّ

خَيْرَ أَعْمَالِكُمُ الصَّلَاةَ، وَلَا يُحَافِظُ عَلَى الْوُضُوءِ إِلَّا مُؤْمِنٌ».

سەوبان ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «(شوێنی ڕاستی بکەون و) بەردەوام بن، بێگومان ناشتوانن (دەستتان لە هەموو چاکەیەک هەبێت)، بشزانن کە نوێژ باشترینی کارەکانتانە، هیچ کەسێك پارێزگاری لە (مانەوەی) دەستنوێژی ناکات جگە لە بڕوادار».

## بَابُ الْوُضُوءِ شَطْرُ الْإِيمَانِ

### باسی ئەوەی کە دەستنوێژ نیوەی ئیمانە

٨٣. عَنْ أَبِي مَالِكٍ الْأَشْعَرِيِّ ﷺ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «إِسْبَاغُ الْوُضُوءِ شَطْرُ الْإِيمَانِ، وَالْحَمْدُ لِلَّهِ مِلْءُ الْمِيزَانِ، وَالتَّسْبِيحُ وَالتَّكْبِيرُ مِلْءُ السَّمَوَاتِ وَالْأَرْضِ، وَالصَّلَاةُ نُورٌ، وَالزَّكَاةُ بُرْهانٌ، وَالصَّبْرُ ضِيَاءٌ، وَالْقُرْآنُ حُجَّةٌ لَكَ أَوْ عَلَيْكَ، كُلُّ النَّاسِ يَغْدُو، فَبَائِعٌ نَفْسَه، فَمُعْتِقُها أَوْ مُوبِقُها».

ئەبو مالیکی ئەشعەری ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «جوان دەستنوێژ شوشتن نیوەی نوێژە (لێرە مەبەست لە ئیمان نوێژە)، (الحمد لله) تەرازوو پڕ دەکات، (سبحان الله والله أكبر) خێریان بەئەندازەی پڕی ئاسمانەکان و زەوییە، نوێژ ڕووناکییە، زەکاتدان بەڵگەیە (بۆ بڕواداری)، خۆڕاگری ڕۆشناییە، قورئان بەڵگەیە بۆت (ئەگەر کاری پێ بکەی)، یان بەڵگەیە لەسەرت (ئەگەر کاری پێ نەکەی) هەموو مرۆڤەکان بەیانی دەکەنەوە و تێدەکۆشن و کار دەکەن و نەفسی خۆیان ماندوو دەکەن بە تێکۆشان، جا هەیانە نەفسی خۆی (بە خوا) دەفرۆشێت، ئازادی دەکات، یان بەهیلاکی دەبات».

## بَابُ ثَوَابِ الطُّهورُ

### باسی پاداشتی پاکی و دەستنوێژ شوشتن

٨٤. عَنْ أَبِي هرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه ﷺ: «إِنَّ أَحَدَكُمْ إِذَا تَوَضَّأَ، فَأَحْسَنَ الْوُضُوءَ، ثُمَّ أَتَى الْمَسْجِدَ، لَا يَنْهَزُه إِلَّا الصَّلَاةُ، لَمْ يَخْطُ خَطْوَةً، إِلَّا رَفَعَه اللَّه ﷻ بِها دَرَجَةً، وَحَطَّ عَنْه بِها خَطِيئَةً، حَتَّى يَدْخُلَ الْمَسْجِدَ».

ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «دڵنیا بن هەر یەکێک لە ئێوە کاتێک دەستنوێژێکی ڕێک و جوان دەشوات، پاشان دێتە مزگەوت، هیچ شتێک پاڵی نەدا تەنها هاتن بێت بۆ نوێژ، ئەوە هیچ هەنگاوێک نانێت، مەگەر بەو هەنگاوە خوا پلەیەک بەرزی دەکاتەوە، گوناهێکی لێ دەسڕێتەوە، تاکوو دەچێتە مزگەوتەوە».



## بَابُ السِّوَاكِ

### باسی سیواک

٨٥. عَنْ حُذَيْفَةَ ﷺ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّه ﷺ: إِذَا قَامَ مِنَ اللَّيْلِ يَتَهجَّدُ، يَشُوصُ فَاه بِالسِّوَاكِ.

حوزەیفە ﷺ دەڵێت: کاتێک پێغەمبەری خوا ﷺ هەڵدەستایەوە بۆ شەونوێژ، سیواکی دەکرد و بە دەم و ددانیدا دەهێنا.

٨٦. عَنْ أَبِي هرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه ﷺ: «لَوْلَا أَنْ أَشُقَّ عَلَى أُمَّتِي، لَأَمَرْتُهمْ بِالسِّوَاكِ عِنْدَ كُلِّ صَلَاةٍ».

ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «ئەگەر لەسەر ئوممەتەکەم

گران نەبووایە، ئەوە فەرمانم پێ دەکردن کە لە کاتی هەر نوێژێکدا سیواک بکەن».

## بَابُ مَا يَقُولُ الرَّجُلُ إِذَا دَخَلَ الْخَلَاءَ

### باسی ئەوەی کە پیاو (ئافرەت) دەچێتە سەرئاو چی دەڵێت

٨٧. عَنْ عَلِيٍّ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «سِتْرُ مَا بَيْنَ الْجِنِّ وَعَوْرَاتِ بَنِي آدَمَ إِذَا دَخَلَ الْكَنِيفَ أَنْ يَقُولَ: بِسْمِ اللَّهِ».

عەلی ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «پەردەی نێوان جنۆکە و داوێنی نەوەی ئادەم کاتێک دەچێتە سەرئاو ئەوەیە کە بڵێت: (بسم الله)، واتە: بە ناوی خوا».

## بَابُ مَا يَقُولُ إِذَا خَرَجَ مِنَ الْخَلَاءِ

### باسی ئەوەی کە کەسێک لە سەرئاو دەردەچێت چی دەڵێت

٨٨. عن يُوسُف بْن أَبِي بُرْدَةَ، سَمِعْتُ أَبِي ﵁ يَقُولُ: دَخَلْتُ عَلَى عَائِشَةَ، فَسَمِعْتُهَا تَقُولُ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِذَا خَرَجَ مِنَ الْغَائِطِ قَالَ: «غُفْرَانَكَ».

یوسوفی کوڕی ئەبو بوڕدە دەڵێت: گوێم لە باوکم ﵁ بوو دەیگوت: چووم بۆ لای عائیشە، جا گوێم لێ بوو دەیگوت: کاتێک پێغەمبەری خوا ﷺ لە سەرئاو دەهاتە دەرەوە، دەیفەرموو: «خوایە داوای لێخۆشبوونت لێ دەکەم».

## بَابُ التَّشْدِيدِ فِي الْبَوْلِ

### باسی هەڕەشەی توند لەسەر خۆپاکنەکردنەوە لە میز

٨٩. عَنْ أَبِي هرَيْرَةَ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَكْثَرُ عَذَابِ الْقَبْرِ مِنَ الْبَوْلِ».

ئەبو هوڕەیرە ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «زۆربەی سزای نێو گۆڕ لەسەر خۆپاکنەکردنەوەیە لە کاتی میزکردندا».

## بَابُ الرَّجُلِ وَالْمَرْأَةِ يَتَوَضَّآنِ مِنْ إِنَاءٍ وَاحِدٍ

### باسی ئەوەی کە پیاو و ئافرەت بە ئاوی یەک تەشت دەستنوێژ دەشۆن

٩٠. عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ قَالَ: كَانَ الرِّجَالُ وَالنِّسَاءُ يَتَوَضَّئُونَ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ مِنْ إِنَاءٍ وَاحِدٍ.

ئیبن عومەر ﷺ دەڵێت: لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا ﷺ پیاوان و ئافرەتان (ژن و مێرد) لە یەک تەشتدا دەستنوێژیان دەشوشت.

## بَابُ التَّيَمُّنِ فِي الْوُضُوءِ

### باسی پێشخستنی لای ڕاست لە دەستنوێژدا

٩١. عَنْ عَائِشَةَ ﷺ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ يُحِبُّ التَّيَمُّنَ فِي الطُّهورِ إِذَا تَطَهرَ، وَفِي تَرَجُّلِه إِذَا تَرَجَّلَ، وَفِي انْتِعَالِه إِذَا انْتَعَلَ.

عائیشە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ حەزی لێبوو لە کاتی دەستنوێژگرتندا لەلای ڕاستەوە دەست پێ بکات (بۆ ئەندامە جووتەکان)، هەروەها لە کاتی قژداهێنانیدا حەزی دەکرد لەلای ڕاستەوە دەست پێ بکات، لە کاتی پێڵاولەپێکردنیشدا حەزی دەکرد سەرەتا ئەوەی قاچی ڕاستەی لەپێ بکات.

## بَابُ الْمَضْمَضَةِ وَالِاسْتِنْشَاقِ مِنْ كَفٍّ وَاحِدٍ

### باسی ئاو لە زمان و لووت ڕادان بە یەک مشت (لوێچ، مست)

٩٢. عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﭭ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ مَضْمَضَ وَاسْتَنْشَقَ مِنْ غُرْفَةٍ وَاحِدَةٍ.

ئیبن عەبباس ﭭ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ ئاوی لە دەم و لووتی وەرکرد بە یەک مست (لوێچ).

## بَابُ الْوُضُوءِ ثَلَاثًا ثَلَاثًا

### باسی شوشتنی ئەندامانی دەستنوێژ سێ جار سێ جار

٩٣. عَنْ شَقِيقِ بْنِ سَلَمَةَ ﭬ قَالَ: رَأَيْتُ عُثْمَانَ وَعَلِيًّا، يَتَوَضَّآنِ ثَلَاثًا ثَلَاثًا، وَيَقُولَانِ: هكَذَا كَانَ وُضُوءُ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ.

شەقیقی کوڕی سەلەمە ﭬ دەڵێت: بینیم عوسمان و عەلی سێ جار سێ جار ئەندامەکانی دەستنوێژیان دەشوشت، دەیانگوت: دەستنوێژ شوشتنی پێغەمبەری خوا ﷺ ئا بەو شێوەیە بوو.

## بَابُ مَا جَاءَ فِي إِسْبَاغِ الْوُضُوءِ

### باسی ئەوەی هاتوە دەربارەی جوان دەستنوێژ شوشتن

٩٤. عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﭬ أَنَّه سَمِعَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «أَلَا أَدُلُّكُمْ عَلَى مَا يُكَفِّرُ اللَّه بِه الْخَطَايَا، وَيَزِيدُ بِه فِي الْحَسَنَاتِ؟»، قَالُوا: بَلَى يَا رَسُولَ اللَّهِ قَالَ: «إِسْبَاغُ الْوُضُوءِ عَلَى الْمَكَارِهِ، وَكَثْرَةُ الْخُطَا إِلَى الْمَسَاجِدِ، وَانْتِظَارُ الصَّلَاةِ بَعْدَ الصَّلَاةِ».

ئەبو سەعیدی خودری ﷺ لە پێغەمبەری خواوە ﷺ بیستوویەتی کە فەرموویەتی: «ئایا ڕێنماییتان نەکەم بۆ شتێک کە خودا بەهۆیەوە تاوانەکان دەسڕێتەوە و چاکە زیاد دەکات»، گوتیان: با، ئەی پێغەمبەری خوا، فەرمووی: «دەستنوێژ شوشتنی تەواو لە کاتی ناڕەحەتی، زۆر هەنگاونان بەرەو مزگەوت، چاوەڕوانکردنی نوێژ لەدوای نوێژ».

## بَابُ مَا جَاءَ فِي تَخْلِيلِ اللِّحْيَةِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی پەنجە خستنە نێو ڕیش (بۆ دەستنوێژ)

٩٥. عَنْ عَمَّارِ بْنِ يَاسِرٍ ﷺ قَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّه ﷺ يُخَلِّلُ لِحْيَتَه.

عەمماری کوڕی یاسیر ﷺ دەڵێت: بینیم پێغەمبەری خوا ﷺ پەنجەکانی لەنێو ڕیشیدا دەهێنا و دەبرد (بۆ ئەوەی بەباشی تەڕ ببێت لە کاتی دەستنوێژدا).

## بَابُ مَا جَاءَ فِي مَسْحِ الرَّأْسِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی مەسحکردنی سەر

٩٦. عَنْ عُثْمَانَ بْنِ عَفَّانَ ﷺ قَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّه ﷺ تَوَضَّأَ، فَمَسَحَ رَأْسَه مَرَّةً.

عوسمانی کوڕی عەففان ﷺ دەڵێت: بینیم پێغەمبەری خوا ﷺ دەستنوێژی شوشت، یەک جار مەسحی سەری کرد.

## بَابُ مَا جَاءَ فِي مَسْحِ الْأُذُنَيْنِ

### باسی ئەوەی هاتووە مەسحکردنی گوێچکەکان

٩٧. عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ: أَنَّ رَسُولَ اللَّه ﷺ مَسَحَ أُذُنَيْه دَاخِلَهُمَا بِالسَّبَّابَتَيْنِ،

وَخَالَفَ إِبْهَامَيْه إِلَى ظَاهِرِ أُذُنَيْه، فَمَسَحَ ظَاهِرَهمَا وَبَاطِنَهمَا.

ئیبن عەبباس ﵄ دەگێڕێتەوە: کە پێغەمبەری خوا ﷺ نێوەوەی گوێیەکانی بە پەنجەی شایەتمان و دەرەوەی گوێیەکانیشی بە پەنجە گەورەی مەسح کرد». کەواتە: ڕووکاری دەرەوە و نێوەوەی گوێیەکانی مەسح دەکرد.

تێبینی:

(سَبَّاب): ئەو پەنجەیەیە کە لە دەستی ڕاستدا بۆ شایەتمان بەکاری دێنین، لە دەستی چەپیش هەمان پەنجەیە.

## بَابُ تَخْلِيلِ الْأَصَابِعِ

### باسی شوشتنی نێوان (کەلێنی) پەنجەکان

٩٨. عَنِ الْمُسْتَوْرِدِ بْنِ شَدَّادٍ ﵁ قَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّه ﷺ تَوَضَّأَ فَخَلَّلَ أَصَابِعَ رِجْلَيْه بِخِنْصِرِه.

موستەوریدی کوڕی شەدداد ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوام ﷺ بینی دەستنوێژی گرت، جا پەنجە گچکەی دەستی خستە نێوان پەنجەکانی پێی.

## بَابُ غَسْلِ الْعَرَاقِيبِ

### باسی شوشتنی گوێزینگ و پاژنەپێ

٩٩. عَنْ عَبْدِ اللَّه بْنِ عَمْرٍو ﵄ قَالَ: رَأَى رَسُولُ اللَّه ﷺ قَوْمًا يَتَوَضَّئُونَ وَأَعْقَابُهمْ تَلُوحُ فَقَالَ: «وَيْلٌ لِلْأَعْقَابِ مِنَ النَّارِ، أَسْبِغُوا الْوُضُوءَ».

عەبدوڵڵای کوڕی عەمرٍ ﵄ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ چەند کەسێکی بینی کە دەستنوێژیان دەگرت و پاژنەپێکانیان دیار بوو کە ئاوی پێ نەکەتبوو، ئینجا

فەرمووی: «سزای سەخت لە ئاگردا بۆ ئەو پاژنانە، کە لە دەستنوێژدا بەتێر و تەواوی ناشۆردرێن».

## بَابُ مَا جَاءَ فِي الْوُضُوءِ عَلَى مَا أَمَرَ اللَّه تَعَالَى

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی دەستنوێژێك خوا فەرمانی پێ کردووە

١٠٠. عَنْ رِفَاعَةَ بْنِ رَافِعٍ ﷺ: أَنَّه كَانَ جَالِسًا عِنْدَ النَّبِيِّ ﷺ فَقَالَ: «إِنَّها لَا تَتِمُّ صَلَاةٌ لِأَحَدٍ، حَتَّى يُسْبِغَ الْوُضُوءَ، كَمَا أَمَرَه اللَّه تَعَالَى، يَغْسِلُ وَجْهه وَيَدَيْه إِلَى الْمِرْفَقَيْنِ، وَيَمْسَحُ بِرَأْسِه، وَرِجْلَيْه إِلَى الْكَعْبَيْنِ».

ڕیفاعەی کوڕی ڕافیع ﷺ دەگێڕێتەوە: لە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ دانیشتبوو، ئەویش فەرمووی: «نوێژی هیچ یەکێکتان تەواو نییە، تاکوو دەستنوێژێکی تێر و تەواو نەشوات، بە شێوازێک کە خوای بەرز فەرمانی پێ کردووە (ئەویش بەو شێوەیەیە): ڕوخساری بشوات، هەروەها دەستەکانی تاکوو ئانیشکەکان، وە مەسحی سەری بکات وە پێیەکانی تاکوو گوێزینگەکانی».

## بَابُ مَا يُقَالُ بَعْدَ الْوُضُوءِ

### باسی ئەوەی کە دەگوترێت دوای دەستنوێژ

١٠١. عَنْ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه ﷺ: «مَا مِنْ مُسْلِمٍ يَتَوَضَّأُ، فَيُحْسِنُ الْوُضُوءَ، ثُمَّ يَقُولُ أَشْهدُ أَنْ لَا إِلَه إِلَّا اللَّه، وَأَشْهدُ أَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُه وَرَسُولُه، إِلَّا فُتِحَتْ لَه ثَمَانِيَةُ أَبْوَابِ الْجَنَّةِ، يَدْخُلُ مِنْ أَيِّها شَاءَ».

عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «هیچ موسوڵمانێک نییە کە بەجوانترین شێوە دەستنوێژ بشوات، پاشان بڵێت: (أَشْهدُ

أَنْ لاَ إِلَه إِلاَّ الله وَحْدَه لاَ شَرِيكَ لَه، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُه وَرَسُولُه)، بێگومان هەر هەشت دەرگای بەهەشتی بۆ دەکرێنەوە، دەچێتە ژوورەوە لە هەر کامەیان بیەوێت».

## بَابُ الْمَضْمَضَةِ مِنْ شُرْبِ اللَّبَنِ

### باسی ئاو لە دەم وەردان دوای شیرخواردنەوە

١٠٢. عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ ﵂ زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّه ﷺ: «إِذَا شَرِبْتُمُ اللَّبَنَ فَمَضْمِضُوا؛ فَإِنَّ لَه دَسَمًا».

ئوم سەلەمەی ﵂ هاوسەری پێغەمبەر ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: «کاتێک شیرتان خواردەوە ئاو لە دەمتان ڕادەن، چونکە بێگومان چەوری تێدایە».

## بَابُ الْوُضُوءِ مِنَ الْمَذْيِ

### باسی دەستنوێژ شوشتنەوە لە مەزی

١٠٣. عَنْ عَلِيٍّ ﵁ قَالَ: سُئِلَ رَسُولُ اللَّه ﷺ عَنِ الْمَذْيِ فَقَالَ: «فِيه الْوُضُوءُ، وَفِي الْمَنِيِّ الْغُسْلُ».

عەلی ﵁ دەڵێت: پرسیار کرا لە پێغەمبەری خوا ﷺ دەربارەی مەزی (ئایا دەستنوێژ دەشکێنێت)، ئەویش فەرمووی: «پێویستە دەستنوێژی بۆ بشۆردرێتەوە، بۆ مەنی پێویستە خۆی بۆ بشوات (واتە: مەزی دەستنوێژ دەشکێنێت، بەڵام شوشتن واجب ناکات، بەڵام مەنی شوشتن واجب دەکات)».

## بَابُ الْوُضُوءِ لِكُلِّ صَلَاةٍ وَالصَّلَوَاتِ كُلِّها بِوُضُوءٍ وَاحِدٍ

### باسی دەستنوێژ شوشتنەوە بۆ هەر نوێژێک
### و کردنی هەموو نوێژەکان بە دەستنوێژێک

١٠٤. عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﵁ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّه ﷺ: يَتَوَضَّأُ لِكُلِّ صَلَاةٍ، وَكُنَّا نَحْنُ نُصَلِّي الصَّلَوَاتِ كُلَّها بِوُضُوءٍ وَاحِدٍ.

ئەنەسی کوڕی مالیک ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ هەموو نوێژێک دەستنوێژی دەشوشتەوە، بەڵام ئێمە هەموو نوێژەکانمان بە یەک دەستنوێژ دەکرد.

## بَابُ مِقْدَارِ الْمَاءِ الَّذِي لَا يُنَجَّسُ

### باسی ئەندازەی ئەو ئاوەی کە پیس نابێت

١٠٥. عَنْ عُبَيْدِ اللَّه بْنِ عَبْدِ اللَّه بْنِ عُمَرَ، عَنْ أَبِيه ﵁، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه ﷺ: «إِذَا كَانَ الْمَاءُ قُلَّتَيْنِ، أَوْ ثَلَاثًا، لَمْ يُنَجِّسْه شَيْءٌ».

عوبەیدوڵڵای کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی عومەر لە باوکیەوە ﵄ دەگێڕێتەوە، گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «ئەگەر ئاو دوو قوللە یان سێ قوللە بوو، ئەوە هیچ شتێک پیسی ناکات».

## بَابُ مَا جَاءَ فِي بَوْلِ الصَّبِيِّ الَّذِي لَمْ يُطْعَمْ

### باسی ئەوەی کە دەربارەی میزی منداڵی نێرینە
### هاتووە کە هێشتا تەنها شیری دایکی دەخوات

١٠٦. عَنْ أَبِي السَّمْحِ ﵁ قَالَ: كُنْتُ خَادِمَ النَّبِيِّ ﷺ، فَجِيءَ بِالْحَسَنِ أَوِ الْحُسَيْنِ،

فَبَالَ عَلَى صَدْرِهِ، فَأَرَادُوا أَنْ يَغْسِلُوه، فَقَالَ رَسُولُ اللَّه ﷺ: «رُشَّه، فَإِنَّه يُغْسَلُ بَوْلُ الْجَارِيَةِ، وَيُرَشُّ مِنْ بَوْلِ الْغُلَامِ».

ئەبو سەمح ﵁ دەڵێت: من خزمەتکاری پێغەمبەر ﷺ بووم، جا حەسەن، یان حوسەینیان هێنا بۆ خزمەتی، ئەویش لەسەر سینگی پێغەمبەری خوا ﷺ میزی کرد بە خۆیدا، ویستیان بیشۆنەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: «تەنیا ئاوپڕژێنی بکەن، لەبەر ئەوەی میزی کچی بچکۆلە (شیرەخۆرە) دەشۆردرێتەوە، بەڵام میزی کوڕی بچکۆلە ئاوپڕژێن دەکرێت».

## بَابُ مُصَافَحَةِ الْجُنُبِ

### باسی تەوقەکردن لەگەڵ کەسی لەشگران

١٠٧. عَنْ أَبِي هرَيْرَةَ ﵁: أَنَّه لَقِيَه النَّبِيُّ ﷺ فِي طَرِيقٍ مِنْ طُرُقِ الْمَدِينَةِ، وَهوَ جُنُبٌ، فَانْسَلَّ، فَفَقَدَه النَّبِيُّ ﷺ، فَلَمَّا جَاءَ قَالَ: أَيْنَ كُنْتَ يَا أَبَا هرَيْرَةَ؟ قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّه، لَقِيتَنِي وَأَنَا جُنُبٌ، فَكَرِهتُ أَنْ أُجَالِسَكَ حَتَّى أَغْتَسِلَ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّه ﷺ: «الْمُؤْمِنُ لَا يَنْجُسُ».

ئەبو هوڕەیرە ﵁ دەگێڕێتەوە: جارێکیان لە کۆڵانێک لە کۆڵانەکانی مەدینەدا پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوی بینی، بەڵام لەبەر ئەوەی لەشگران بوو، خۆی پەنا دا و لە پێغەمبەر ﷺ ون بوو، پاشان (دوای خۆشوشتن) هاتەوە خزمەتی، پێغەمبەری خوا ﷺ لێی پرسی: ئەرێ ئەبو هوڕەیرە لەکوێ بوویت؟ ئەویش گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا، لەو کاتەی پێت گەیشتم لەشگران بووم، بۆیە حەزم نەکرد بەو شێوەیە لە خزمەتت دانیشم تاوەکوو خۆم نەشۆم، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: «بڕوادار پیس نابێت».

## بَابُ الصَّلَاةِ فِي الثَّوْبِ الَّذِي يُجَامِعُ فِيه

### باسی نوێژکردن له پۆشاکێکدا که جیماعی پێوه کرابێت

١٠٨. عَنْ مُعَاوِيَةَ بْنِ أَبِي سُفْيَانَ ﵁: أَنَّه سَأَلَ أُخْتَه أُمَّ حَبِيبَةَ زَوْجَ النَّبِيِّ ﷺ، هلْ كَانَ رَسُولُ اللَّه ﷺ يُصَلِّي فِي الثَّوْبِ الَّذِي يُجَامِعُ فِيه؟ قَالَتْ: نَعَمْ، إِذَا لَمْ يَكُنْ فِيه أَذًى.

موعاویەی کوڕی ئەبو سوفیان ﵁ دەگێڕێتەوە: پرسیاری کرد لە خوشکی خۆی ئوم حەبیبەی خێزانی پێغەمبەر ﷺ، ئایا پێغەمبەری خوا ﷺ بەو پۆشاکەی کە سەرجێیی دەکرد، (بە هەمان پۆشاك) نوێژیشی دەکرد؟ گوتی: بەڵێ، بە مەرجێک هیچ پیسییەکی پێوە نەبووایە.

## بَابُ مَا جَاءَ فِي التَّوْقِيتِ فِي الْمَسْحِ لِلْمُقِيمِ وَالْمُسَافِرِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی ماوەی مەسح بۆ نیشتەجێ و گەشتیار

١٠٩. عَنْ شُرَيْحِ بْنِ هَانِئٍ ﵁ قَالَ: سَأَلْتُ عَائِشَةَ ﵂ عَنِ الْمَسْحِ عَلَى الْخُفَّيْنِ، فَقَالَتْ: ائْتِ عَلِيًّا، فَسَلْه، فَإِنَّه أَعْلَمُ بِذَلِكَ مِنِّي، فَأَتَيْتُ عَلِيًّا، فَسَأَلْتُه عَنِ الْمَسْحِ، فَقَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّه ﷺ: يَأْمُرُنَا أَنْ نَمْسَحَ، لِلْمُقِيمِ يَوْمًا وَلَيْلَةً، وَلِلْمُسَافِرِ ثَلَاثَةَ أَيَّامٍ.

شورەیحی کوڕی هانیئ ﵁ دەڵێت: پرسیارم کرد لە عائیشە ﵂ دەربارەی مەسحکردن لەسەر خوففەکان، ئەویش گوتی: بڕۆ بۆ لای عەلی، پرسیاری لێ بکە، چونکە بەڕاستی ئەو لە من باشتری لێ دەزانێت، منیش چووم بۆ لای عەلی ﵁ و پرسیارم لێ کرد دەربارەی مەسح، ئەویش گوتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێ دەکردین کە مەسح بکەین، بۆ کەسی نیشتەجێ ڕۆژ و شەوێک، بۆ ڕێبوار سێ ڕۆژ.

## بَابُ مَا جَاءَ فِي الْمَسْحِ عَلَى الْعِمَامَةِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی مەسح لەسەر مێزەر

١١٠. عَنْ بِلَالٍ ﷺ: أَنَّ رَسُولَ اللَّه ﷺ مَسَحَ عَلَى الْخُفَّيْنِ، وَالْخِمَارِ.

بیلال ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ مەسحی لەسەر خوففەکانی و مێزەرەکەی کرد.

## بَابُ مَا جَاءَ فِي السَّبَبِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی هۆکارەکان (ی تەیەممومکردن)

١١١. عَنْ عَمَّارِ بْنِ يَاسِرٍ ﷺ قَالَ: سَقَطَ عِقْدُ عَائِشَةَ ﷺ فَتَخَلَّفَتْ لِالْتِمَاسِهِ، فَانْطَلَقَ أَبُو بَكْرٍ ﷺ إِلَى عَائِشَةَ، فَتَغَيَّظَ عَلَيْهَا فِي حَبْسِهَا النَّاسَ، فَأَنْزَلَ اللَّه ﷻ الرُّخْصَةَ فِي التَّيَمُّمِ، قَالَ: فَمَسَحْنَا يَوْمَئِذٍ إِلَى الْمَنَاكِبِ، قَالَ: فَانْطَلَقَ أَبُو بَكْرٍ إِلَى عَائِشَةَ فَقَالَ: مَا عَلِمْتُ إِنَّكِ لَمُبَارَكَةٌ.

عەمماری کوڕی یاسیر ﷺ دەڵێت: دایکی ئیمانداران عائیشە ﷺ ملوانکەیەکی لێکەوت، بەهۆی گەڕان بەدوایدا دوا کەوت، بۆیە ئەبو بەکر ﷺ ڕۆیشت بۆ لای عائیشە لێی توڕە بوو، چونکە بوو بەهۆی ئەوەی خەڵکی دوا بکەون، ئینجا خوا ﷻ ئایەتی تەیەممومی دابەزاند، عەممار ﷺ دەڵێت: ئەو ڕۆژە ئێمە تاوەکوو شانەکانمان مەسحمان کرد، گوتی: ئەبو بەکر چوو بۆ لای عائیشە پێی گوت: نەمزانی کە تۆ خێر و بەرەکەتی (چونکە بەهۆی ئەو دوا کەوتن و نەگەیشتنە ئاو و کاتی نوێژیش هات، بۆیە لە جیاتی دەستنوێژ مۆڵەتی تەیەمموم دابەزی).

١١٢. عَنْ أَبِي هرَيْرَةَ ﵁: أَنَّ رَسُولَ اللّٰهِ ﷺ قَالَ: «جُعِلَتْ لِيَ الْأَرْضُ مَسْجِدًا وَطَهورًا».

ئەبو هورەیرە ﵁ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «زەوی بۆ من کراوە بە مزگەوت و پاک و پاککەرەوە (واتە: لە هەر شوێنێک کاتی نوێژ بوو دەکرێت لەو شوێنە نوێژ بکرێت مادەم خاوێن بێت، وە هەروەها دەکرێت لەجیاتی ئاو خۆڵ بەکار بهێنرێت، لە کاتێکدا کە ئاو دەست نەکەوێت)».

## بَابُ مَا جَاءَ فِي التَّيَمُّمِ ضَرْبَةً وَاحِدَةً

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی تەیەممووم بە یەک جار دەست لە زەویدان

١١٣. عَنْ سَعِيدِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبْزَى، عَنْ أَبِيه ﵁: أَنَّ رَجُلًا أَتَى عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ، فَقَالَ: إِنِّي أَجْنَبْتُ، فَلَمْ أَجِدِ الْمَاءَ، فَقَالَ عُمَرُ: لَا تُصَلِّ، فَقَالَ: عَمَّارُ بْنُ يَاسِرٍ: أَمَا تَذْكُرُ يَا أَمِيرَ الْمُؤْمِنِينَ إِذْ أَنَا وَأَنْتَ فِي سَرِيَّةٍ، فَأَجْنَبْنَا، فَلَمْ نَجِدِ الْمَاءَ، فَأَمَّا أَنْتَ فَلَمْ تُصَلِّ، وَأَمَّا أَنَا فَتَمَعَّكْتُ فِي التُّرَابِ، فَصَلَّيْتُ، فَلَمَّا أَتَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ، فَذَكَرْتُ ذَلِكَ لَه، فَقَالَ: «إِنَّمَا كَانَ يَكْفِيكَ»، وَضَرَبَ النَّبِيُّ ﷺ بِيَدَيْه إِلَى الْأَرْضِ، ثُمَّ نَفَخَ فِيهِمَا، وَمَسَحَ بِهِمَا وَجْهه وَكَفَّيْه.

سەعیدی کوڕی عەبدوڕڕەحمانی کوڕی ئەبزا لە باوکیەوە ﵁ دەگێڕێتەوە: پیاوێک هات بۆ لای عومەری کوڕی خەتتاب ﵁ و گوتی: من لەشگران بووم، وە ئاوم دەست نەکەوت، عومەریش ﵁ گوتی: نوێژ مەکە، عەمماری کوڕی یاسیریش ﵁ گوتی: ئەی پێشەوای بڕواداران بەبیرت نەماوە کە من و تۆ لە لەشکرێکدا بووین و تووشی لەشگرانی بووین، ئاومان چنگ نەکەوت، ئینجا تۆ نوێژت نەکرد، بەڵام من خۆم لە خۆڵ وەردا و دواتر نوێژم کرد، کاتێک هاتینەوە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ بۆمان گێڕایەوە، ئەویش فەرمووی: «تەنها ئەوەندە بەس بوو»، لەو کاتەدا پێغەمبەری خوا ﷺ دەستەکانی لە زەوی دا و پاشان فووی لێ کردن و بە

دەستەکانی مەسحی ڕوخسار و لەپەدەستەکانی کرد.

## بَابُ مَا جَاءَ فِي الْغُسْلِ مِنَ الْجَنَابَةِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی خۆشوشتن لە لەشگرانی

١١٤. عَنْ مَيْمُونَةَ ﵂ قَالَتْ: وَضَعْتُ لِلنَّبِيِّ ﷺ غُسْلاً فَاغْتَسَلَ مِنَ الْجَنَابَةِ، فَأَكْفَأَ الْإِنَاءَ بِشِمَالِهِ عَلَى يَمِينِهِ، فَغَسَلَ كَفَّيْهِ ثَلَاثًا، ثُمَّ أَفَاضَ عَلَى فَرْجِهِ، ثُمَّ دَلَكَ يَدَهُ بِالْأَرْضِ، ثُمَّ مَضْمَضَ، وَاسْتَنْشَقَ، وَغَسَلَ وَجْهَهُ ثَلَاثًا، وَذِرَاعَيْهِ ثَلَاثًا، ثُمَّ أَفَاضَ الْمَاءَ عَلَى سَائِرِ جَسَدِهِ، ثُمَّ تَنَحَّى، فَغَسَلَ رِجْلَيْهِ.

مەیموونە ﵂ دەڵێت: ئاوی خۆشوشتنم بۆ پێغەمبەر ﷺ دانا، ئەویش لە لەشگرانی خۆی شوشت، بە جامەکەی کە بە دەستی چەپی گرتبووی ئاوی بە لای ڕاستیدا کرد و دەستەکانی سێ جار شوشت، پاشان ئاوی بە دامێنیدا کرد، دواتر دەستی هێنا بە زەویدا، پاشان ئاوی لە دەم و لووتی ڕادا، دەم و چاوی سێ جار شوشت، باسکەکانی سێ جار شوشت، دواتر ئاوی بەسەر هەموو جەستەیدا کرد، پاشان داهاتەوە و پێیەکانی شوشت.



## بَابٌ فِي الْوُضُوءِ بَعْدَ الْغُسْلِ

### باسێك دەربارەی دەستنوێژ دوای خۆشوشتن

١١٥. عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، لَا يَتَوَضَّأُ بَعْدَ الْغُسْلِ مِنَ الْجَنَابَةِ.

عائیشە ﵂ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دوای خۆشوشتنی لە لەشگرانی دەستنوێژی نەدەشوشت.

## بَابُ مَنْ قَالَ: لَا يَنَامُ الْجُنُبُ حَتَّى يَتَوَضَّأَ وُضُوءَه لِلصَّلَاةِ

باسی ئەوەی گوتوویەتی: لەشگران ناخەوێت تاکوو دەستنوێژ نەگرێت

١١٦. عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ: أَنَّه كَانَ تُصِيبُه الْجَنَابَةُ بِاللَّيْلِ، فَيُرِيدُ أَنْ يَنَامَ، فَأَمَرَه رَسُولُ اللَّه ﷺ أَنْ يَتَوَضَّأَ ثُمَّ يَنَامَ.

ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەگێڕێتەوە: شەوانە تووشی لەشگرانی دەبوو، دەیویست بخەوێت، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمانی پێ کرد کە دەستنوێژ بشوات ئینجا بخەوێت.

## بَابٌ فِي الْمَرْأَةِ تَرَى فِي مَنَامِها مَا يَرَى الرَّجُلُ

باسێك دەربارەی ئەوەی پیاو لە خەودا دەیبینێت ئافرەتیش دەیبینێت

١١٧. عَنْ أَمِّ سَلَمَةَ ﷺ قَالَتْ: جَاءَتْ أُمُّ سُلَيْمٍ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ، فَسَأَلَتْه عَنِ الْمَرْأَةِ تَرَى فِي مَنَامِها مَا يَرَى الرَّجُلُ؟ قَالَ: «نَعَمْ، إِذَا رَأَتِ الْمَاءَ فَلْتَغْتَسِلْ»، فَقُلْتُ: فَضَحْتِ النِّسَاءَ، وَهلْ تَحْتَلِمُ الْمَرْأَةُ؟، قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «تَرِبَتْ يَمِينُكِ، فَبِمَ يُشْبِهها وَلَدُها إِذًا».

ئوم سەلەمە ﷺ دەڵێت: ئوم سولەیم هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ و پرسیاری لێ کرد دەربارەی ئافرەتێک کە لە خەودا ئەو شتە دەبینێت کە پیاو دەیبینێت (خەونی لەشگرانی)؟ فەرمووی: «بەڵێ، ئەگەر (ئافرەت) ئاوی بینی با خۆی بشوات»، (ئوم سەلەمە دەڵێت:) گوتم: ئافرەتت ڕیسوا کرد، ئایا ئافرەت تووشی لەشگرانی دەبێت (لە خەودا)؟ پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: «دەستت بە خۆڵ بێت، ئەی ئەگەر وا نەبێت، چۆن منداڵەکەی لە خۆی دەچێت».

## بَابُ مَا جَاءَ فِي وُجُوبِ الْغُسْلِ إِذَا الْتَقَى الْخِتَانَانِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی پێویستبوونی خۆشوشتن ئەگەر ئەندامی نێرینە و مێینە پێك گەیشتن

١١٨. عَنْ أَبِي هرَيْرَةَ ﵁ عَنْ رَسُولِ اللَّه ﷺ قَالَ: «إِذَا جَلَسَ الرَّجُلُ بَيْنَ شُعَبِها الْأَرْبَعِ، ثُمَّ جَهدَها، فَقَدْ وَجَبَ الْغُسْلُ».

ئەبو هورەیرە ﵁ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «ئەگەر پیاو لە نێوان چوارپەلی ئافرەت دانیشت و پاشان جووت بوو لەگەڵی (و ئاویشی نەیەتەوە)، ئەوە خۆشوشتنی لەسەر پێویست دەبێت».

## بَابُ النُّفَسَاءِ كَمْ تَجْلِسُ

### باسی مانەوە و کاتی ئافرەتێک کە منداڵی بووە

١١٩. عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ ﵂ قَالَتْ: كَانَتِ النُّفَسَاءُ عَلَى عَهدِ رَسُولِ اللَّه ﷺ تَجْلِسُ أَرْبَعِينَ يَوْمًا، وَكُنَّا نَطْلِي وُجُوهنَا بِالْوَرْسِ مِنَ الْكَلَفِ.

ئوم سەلەمە ﵂ دەڵێت: لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا ﷺ کە ئافرەتێک منداڵی ببووایە، ئەوە چل ڕۆژ دادەنیشت (واتە: دەستی لە نوێژ و ڕۆژوو هەڵدەگرت و لەگەڵ مێردەکەی جووت نەدەبوو)، دەڵێت: لەبەر زیپکە و پەڵەی ڕەشی دەموچاو و ڕوخسار، ڕوخسارمان بە وەڕس (جۆرە گیایەکە) دەرمان دەکرد و لە دەموچاومان هەڵدەسوو.

## بَابُ إِذَا حَاضَتِ الْجَارِيَةُ لَمْ تُصَلِّ إِلَّا بِخِمَارٍ

### باسی ئەوە کە کچ باڵغ بوو دروست نییە بەبێ سەرپۆش نوێژ بکات

١٢٠. عَنْ عَائِشَةَ ﵂ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «لَا يَقْبَلُ اللَّه صَلَاةَ حَائِضٍ إِلَّا بِخِمَارٍ».

عائیشە ﵂ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە: فەرموویەتی: «خوا نوێژی ئافرەتی باڵغ وەرناگرێت و قبووڵی ناکات کە خۆی دانەپۆشیبێت».

تێبینی:

لەم فەرموودەیەدا وشەی (حَائِض) بە مانای باڵغبوون دێت.

## بَابُ مَنْ تَوَضَّأَ فَتَرَكَ مَوْضِعًا لَمْ يُصِبْه الْمَاءُ

### باسی کەسێك دەستنوێژ بشوات و شوێنێک جێ بهێڵێت و تەڕ نەبێت

١٢١. عَنْ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ ﵁ قَالَ: رَأَى رَسُولُ اللَّه ﷺ رَجُلًا تَوَضَّأَ، فَتَرَكَ مَوْضِعَ الظُّفْرِ عَلَى قَدَمِه، فَأَمَرَه أَنْ يُعِيدَ الْوُضُوءَ وَالصَّلَاةَ قَالَ: فَرَجَعَ.

عومەری کوڕی خەتتاب ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ پیاوێکی بینی دەستنوێژی شوشت، بەڵام بەئەندازەی نینۆکێک لە پێیەکانی بەجێ هێشتبوو، ئینجا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێ کرد، هەم دەستنوێژەکە و هەم نوێژەکە دووبارە بکاتەوە، ڕاوی دەڵێت: پیاوەکەش گەڕایەوە و وای کرد.

# كِتَابُ الصَّلَاةِ

# پەرتووکی نوێژ

## بَابُ وَقْتِ صَلَاةِ الْفَجْرِ

### باسی کاتی نوێژی بەیانی



١٢٢. عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: كُنَّ نِسَاءُ الْمُؤْمِنَاتِ، يُصَلِّينَ مَعَ النَّبِيِّ ﷺ صَلَاةَ الصُّبْحِ، ثُمَّ يَرْجِعْنَ إِلَى أَهْلِهِنَّ، فَلَا يَعْرِفُهُنَّ أَحَدٌ، تَعْنِي مِنَ الْغَلَسِ.

عائیشە ﵂ دەڵێت: ئافرەتانی بڕوادار لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ نوێژی بەیانییان دەکرد، پاشان دەگەڕانەوە بۆ نێو خێزانەکانیان و هیچ کەسیش (لە ڕێگاوبان) نەیدەناسینەوە، مەبەستی ئەوە بوو کە هەر تاریک بوو کە دەگەڕانەوە (بۆیە لەبەر تاریکی نەدەناسرانەوە).

١٢٣. عَنْ أَبِي هرَيْرَةَ ﵁ عَنْ رَسُولِ اللَّه ﷺ: {وَقُرْآنَ الْفَجْرِ إِنَّ قُرْآنَ الْفَجْرِ كَانَ مَشْهُودًا} الإسراء: ٧٨، قَالَ: «تَشْهدُه مَلَائِكَةُ اللَّيْلِ وَالنَّهارِ».

ئەبو هورەیرە ﵁ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ لە تەفسیری ئەو ئایەتەدا: {وَقُرْآنَ الْفَجْرِ إِنَّ قُرْآنَ الْفَجْرِ كَانَ مَشْهُودًا}، واتە: هەروەها نوێژی بەیانی

(بەجێ بهێنە) بەڕاستی قورئانخوێندنی نوێژی بەیانی هەمیشە دەبینرێت (لەلایەن فریشتەكانی شەو و ڕۆژەوە)، فەرمووی: «فریشتەی شەو و ڕۆژ ئامادە دەبن تیایدا».

## بَابُ وَقْتِ صَلَاةِ الظُّهرِ

### باسی كاتی نوێژی نیوەڕۆ

١٢٤. عَنْ جَابِرِ بْنِ سَمُرَةَ ﵁: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يُصَلِّي الظُّهرَ إِذَا دَحَضَتِ الشَّمْسُ.

جابیری كوڕی سەموڕە ﵁ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ نوێژی نیوەڕۆی دەكرد كاتێک كە خۆر لە نێوەڕاستی ئاسمان لایدەدا و دەترازا.

## بَابُ وَقْتِ صَلَاةِ الْعَصْرِ

### باسی كاتی نوێژی عەسر

١٢٥. عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﵁: أَنَّ رَسُولَ اللَّه ﷺ كَانَ يُصَلِّي الْعَصْرَ وَالشَّمْسُ مُرْتَفِعَةٌ حَيَّةٌ، فَيَذْهبُ الذَّاهبُ إِلَى الْعَوَالِي، وَالشَّمْسُ مُرْتَفِعَةٌ.

ئەنەسی كوڕی مالیک ﵁ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ كە نوێژی عەسری كردووە هێشتا خۆر بەرز و بەتین و بەشەوق بوو، ڕێبوار دەچوو بۆ عەوالی (چەند لادێیەک بوون، دوو تا سێ میل دوور بوون لە مەدینەوە)، دەگەیشتە ئەوێ لە كاتێكدا كە خۆر هەر بەرز بوو.

## بَابُ الْمُحَافَظَةِ عَلَى صَلَاةِ الْعَصْرِ

### باسی پارێزگاریكردن لە نوێژی عەسر

١٢٦. عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﵄: أَنَّ رَسُولَ اللَّه ﷺ قَالَ: «إِنَّ الَّذِي تَفُوتُه صَلَاةُ الْعَصْرِ،

فَكَأَنَّمَا وُتِرَ أَهْلُه وَمَالُه».

ئیبن عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «بێگومان ئەو کەسەی نوێژی عەسر لەدەست دەدات (دەیچوێنێت)، وەکوو ئەوە وایە کە منداڵ و ماڵ و سامانی لەدەست دابێت».

## بَابُ وَقْتِ صَلَاةِ الْمَغْرِبِ

### باسی کاتی نوێژی مەغریب (شێوان)

١٢٧. عَنْ رَافِعِ بْنِ خَدِيجٍ ﷺ يَقُولُ: كُنَّا نُصَلِّي الْمَغْرِبَ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّه ﷺ، فَيَنْصَرِفُ أَحَدُنَا، وَإِنَّه لَيَنْظُرُ إِلَى مَوَاقِعِ نَبْلِه.

ڕافیعی کوڕی خەدیج ﷺ دەڵێت: ئێمە لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا ﷺ کە نوێژی مەغریبمان دەکرد، کاتێک یەکێکمان لێدەبوویەوە ئەگەر تەماشای جێی تیرەکەی بکردبایە دەیبینی (مەبەست ئەوەیە کە هێندە زوو لە کاتی خۆیدا نوێژەکەیان دەکرد، واتە: لە سەرەتای کاتی بوونی نوێژەکەدا و سووڕەتی کورتیشی تێدا خوێندووە).

## بَابُ وَقْتِ صَلَاةِ الْعِشَاءِ

### باسی کاتی نوێژی عیشا (خەوتنان)

١٢٨. عَنْ أَبِي سَعِيدٍ ﷺ قَالَ صَلَّى بِنَا رَسُولُ اللَّه ﷺ صَلَاةَ الْمَغْرِبِ، ثُمَّ لَمْ يَخْرُجْ حَتَّى ذَهَبَ شَطْرُ اللَّيْلِ، فَخَرَجَ فَصَلَّى بِهِمْ، ثُمَّ قَالَ: «إِنَّ النَّاسَ قَدْ صَلَّوْا وَنَامُوا، وَأَنْتُمْ لَمْ تَزَالُوا فِي صَلَاةٍ مَا انْتَظَرْتُمُ الصَّلَاةَ، وَلَوْلَا الضَّعِيفُ وَالسَّقِيمُ، أَحْبَبْتُ أَنْ أُؤَخِّرَ هذِه الصَّلَاةَ إِلَى شَطْرِ اللَّيْلِ».

ئەبو سەعید ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی شێوانی بۆ کردین، پاشان

لە ماڵەکەی خۆی نەهاتە دەرەوە تاکوو نیوەی شەو ڕۆیشت، ئەوجار هاتە دەر و نوێژی عیشای بۆ کردن، پاشان فەرمووی: «خەڵکی دیکە نوێژیان کردووە و خەتوون (چاوەڕێی جەماعەتیان نەکردووە)، بەڵام ئێوە بەردەوام لە نوێژدا بوون مادام چاوەڕێی نوێژی جەماعەتتان کردووە، خۆ ئەگەر لەبەر (لاوازی) لاوازەکان و (نەخۆشی) نەخۆشەکان نەبووایە، ئەوە پێم خۆش بوو ئەو نوێژە (نوێژی خەوتنان) دوا بخەم بۆ نیوەی شەو».

## بَابُ مَنْ نَامَ عَنِ الصَّلَاةِ أَوْ نَسِيَهَا

### باسی ئەوەی لە کاتی نوێژدا خەوی لێکەوتووە یان لەبیری چووە

١٢٩. عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﵁ قَالَ: سُئِلَ النَّبِيُّ ﷺ، عَنِ الرَّجُلِ يَغْفُلُ عَنِ الصَّلَاةِ أَوْ يَرْقُدُ عَنْهَا، قَالَ: «يُصَلِّيهَا إِذَا ذَكَرَهَا».

ئەنەسی کوڕی مالیک ﵁ دەڵێت: پرسیار کرا لە پێغەمبەر ﷺ دەربارەی پیاوێک کە نوێژەکەی لەبیر دەکات، یان دەخەوێت (خەبەری نابێتەوە تا کاتی نوێژەکە دەڕوات)، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: «هەر کاتێك بیری کەوتەوە با ئەو کاتە نوێژەکە بکات».

## بَابُ وَقْتِ الصَّلَاةِ فِي الْعُذْرِ وَالضَّرُورَةِ

### باسی (دواکەوتن) لە نوێژ کردن لە کاتی خۆی بەهۆی بیانوو یان پێویستییەک

١٣٠. عَنْ عَائِشَةَ ﵂: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «مَنْ أَدْرَكَ مِنَ الصُّبْحِ رَكْعَةً، قَبْلَ أَنْ تَطْلُعَ الشَّمْسُ، فَقَدْ أَدْرَكَهَا، وَمَنْ أَدْرَكَ مِنَ الْعَصْرِ رَكْعَةً، قَبْلَ أَنْ تَغْرُبَ الشَّمْسُ، فَقَدْ أَدْرَكَهَا».

عائیشە ﵂ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «هەر کەسێک فریای

یەک ڕکاتی نوێژی بەیانی بکەوێت پێش ئەوەی خۆر هەڵبێت، ئەوە فریای هەموو نوێژەکە کەوتووە، هەر کەسێک فریای یەک ڕکات نوێژی عەسر بکەوێت پێش ئەوەی خۆر ئاوا بێت، ئەوە فریای نوێژەکە کەوتووە».

## بَابُ النَّهْيِ عَنِ النَّوْمِ قَبْلَ صَلَاةِ الْعِشَاءِ، وَعَنِ الْحَدِيثِ بَعْدَهَا

### باسی ناپەسندی نووستنی پێش نوێژی خەوتنان و قسەکردن لەدوای نوێژ

١٣١. عَنْ أَبِي بَرْزَةَ الْأَسْلَمِيِّ ﷺ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّه ﷺ يَسْتَحِبُّ أَنْ يُؤَخِّرَ الْعِشَاءَ، وَكَانَ يَكْرَه النَّوْمَ قَبْلَهَا، وَالْحَدِيثَ بَعْدَهَا.

ئەبو بەرزەی ئەسلەمی ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ پێیخۆش بوو نوێژی خەوتنان دوا بخات، پێیناخۆش بوو کە پێش نوێژی خەوتنان بخەوێت، لەدوای نوێژەکە قسە بکات.

# كِتَابُ الْأَذَانِ، وَالسُّنَّةُ فِيه

## پەرتووكی بانگ و سوننەتەكانی

### بَابُ بَدْءِ الْأَذَانِ

### باسی دەستپێكی بانگدان (بانگی نوێژ)

١٣٢. عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ عَبْدِ اللَّه بْنِ زَيْدٍ، عَنْ أَبِيه ﵁ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّه ﷺ قَدْ هَمَّ بِالْبُوقِ، وَأَمَرَ بِالنَّاقُوسِ فَنُحِتَ، فَأُرِيَ عَبْدُ اللَّه بْنُ زَيْدٍ فِي الْمَنَامِ، قَالَ: رَأَيْتُ رَجُلًا عَلَيْه ثَوْبَانِ أَخْضَرَانِ يَحْمِلُ نَاقُوسًا، فَقُلْتُ لَه: يَا عَبْدَ اللَّه تَبِيعُ النَّاقُوسَ؟ قَالَ: وَمَا تَصْنَعُ بِه؟ قُلْتُ: أُنَادِي بِه إِلَى الصَّلَاةِ، قَالَ: أَفَلَا أَدُلُّكَ عَلَى خَيْرٍ مِنْ ذَلِكَ؟ قُلْتُ: وَمَا هوَ؟ قَالَ تَقُولُ: اللَّه أَكْبَرُ، اللَّه أَكْبَرُ، اللَّه أَكْبَرُ، اللَّه أَكْبَرُ، أَشْهدُ أَنْ لَا إِلَه إِلَّا اللَّه، أَشْهدُ أَنْ لَا إِلَه إِلَّا اللَّه، أَشْهدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّه، أَشْهدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّه، حَيَّ عَلَى الصَّلَاةِ، حَيَّ عَلَى الصَّلَاةِ، حَيَّ عَلَى الْفَلَاحِ، حَيَّ عَلَى الْفَلَاحِ، اللَّه أَكْبَرُ، اللَّه أَكْبَرُ، لَا إِلَه إِلَّا اللَّه، قَالَ: فَخَرَجَ عَبْدُ اللَّه بْنُ زَيْدٍ، حَتَّى أَتَى رَسُولَ اللَّه ﷺ، فَأَخْبَرَه بِمَا رَأَى، قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّه، رَأَيْتُ رَجُلًا عَلَيْه ثَوْبَانِ أَخْضَرَانِ، يَحْمِلُ نَاقُوسًا، فَقَصَّ عَلَيْه الْخَبَرَ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّه ﷺ: «إِنَّ صَاحِبَكُمْ قَدْ رَأَى رُؤْيَا، فَاخْرُجْ مَعَ بِلَالٍ إِلَى الْمَسْجِدِ فَأَلْقِها عَلَيْه، وَلْيُنَادِ بِلَالٌ؛ فَإِنَّه أَنْدَى

صَوْتًا مِنْكَ». قَالَ: فَخَرَجْتُ مَعَ بِلَالٍ إِلَى الْمَسْجِدِ، فَجَعَلْتُ أُلْقِيها عَلَيْه وَهوَ يُنَادِي بِها، قَالَ: فَسَمِعَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ بِالصَّوْتِ، فَخَرَجَ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّه، وَاللَّه لَقَدْ رَأَيْتُ مِثْلَ الَّذِي رَأَى.

موحەممەدی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی زەید لە باوکیەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ بیری لە کەڕەنایەک دەکردەوە (بۆ ئەوەی خەڵکی پێ ئاگادار بکاتەوە بۆ نوێژ)، جا فەرمانی کرد بەوەی کە زەنگ دروست بکرێت، ئینجا عەبدوڵڵای کوڕی زەید لە خەودا نیشانی درا کە پیاوێک دوو پۆشاکی سەوزی پۆشیبوو و زەنگێکی پێ بوو و هەڵیگرتبوو، (دەڵێت:) منیش پێم گوت: ئەی بەندەی خوا ئەو زەنگانە دەفرۆشیت؟ ئەویش گوتی: چییان پێ دەکەیت؟ منیش گوتم: (خەڵکی) پێ بانگ دەکەم بۆ نوێژ، ئەویش گوتی: ئایا شتێکی لەوە باشترت پێ نەڵێم؟ منیش گوتم: ئەو شتە چییە؟ گوتی: ئەوەیە کە بڵێی: (اللَّه أَكْبَرُ، اللَّه أَكْبَرُ، اللَّه أَكْبَرُ، اللَّه أَكْبَرُ، أَشْهدُ أَنْ لَا إِلَه إِلَّا اللَّه، أَشْهدُ أَنْ لَا إِلَه إِلَّا اللَّه، أَشْهدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّه، أَشْهدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّه، حَيَّ عَلَى الصَّلَاة، حَيَّ عَلَى الصَّلَاةِ، حَيَّ عَلَى الْفَلَاحِ، حَيَّ عَلَى الْفَلَاحِ، اللَّه أَكْبَرُ، اللَّه أَكْبَرُ، لَا إِلَه إِلَّا اللَّه)، (موحەممەد) دەڵێت: عەبدوڵڵای کوڕی زەید لە ماڵ هاتەدەر چووە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ، ئەو شتەی کە لە خەودا بینیبووی بە پێغەمبەری ﷺ ڕاگەیاند و گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا، پیاوێکم بینی لە خەودا کە دوو پۆشاکی سەوزی پۆشیبوو، زەنگێکی پێ بوو، ئینجا چیرۆکەکەی بۆ گێڕایەوە، ئینجا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: «هاوەڵەکەتان خەونی بینیوە، بڕۆ بۆ مزگەوت لەگەڵ بیلال و ئەوەی (لە خەودا بینیوتە) پێی بڵێ و با بیلال بانگی پێ بدات (بەو وشانە)، چونکە بیلال دەنگی لە تۆ بەرزترە». دەڵێ منیش چووم ئەو شتانەم بە بیلال دەگوت و بیلالیش بانگی پێ دەدا، جا عومەری کوڕی خەتتاب گوێی لەو دەنگە بوو، بۆیە ڕۆیشت بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ و گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا، سوێند بە خوا ئەوەی ئەو بینیویەتی منیش بینیومە.

## بَابُ مَا يُقَالَ إِذَا أَذَّنَ الْمُؤَذِّنُ

### باسی ئەوەی کە کاتێك بانگدەر بانگ دەدات دەبێت چۆن وەڵامی بدەینەوە و چی بڵێین

١٣٣. عَنْ أَبِي هرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه ﷺ: «إِذَا أَذَّنَ الْمُؤَذِّنُ، فَقُولُوا مِثْلَ قَوْلِه».

ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «ئەگەر بانگبێژ بانگی دا، ئەوە ئەو چی گوت ئێوەش بیڵێنەوە».

١٣٤. عَنْ سَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ ﷺ عَنْ رَسُولِ اللَّه ﷺ أَنَّه قَالَ: «مَنْ قَالَ حِينَ يَسْمَعُ الْمُؤَذِّنَ: وَأَنَا أَشْهدُ أَنْ لَا إِلَه إِلَّا اللَّه، وَحْدَه لَا شَرِيكَ لَه، وَأَشْهدُ أَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُه وَرَسُولُه، رَضِيتُ بِاللَّه رَبًّا، وَبِالْإِسْلَامِ دِينًا، وَبِمُحَمَّدٍ نَبِيًّا، غُفِرَ لَه ذَنْبُه».

سەعدی کوڕی ئەبو وەققاص ﷺ لە پێغەمبەری خواوە ﷺ دەگێڕێتەوە: فەرموویەتی: «هەر کەسێك کاتێك گوێبیستی بانگ دەبێت، بڵێت: (وَأَنَا أَشْهدُ أَنْ لَا إِلَه إِلَّا اللَّه، وَحْدَه لَا شَرِيكَ لَه، وَأَشْهدُ أَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُه وَرَسُولُه، رَضِيتُ بِاللَّه رَبًّا، وَبِالْإِسْلَامِ دِينًا، وَبِمُحَمَّدٍ نَبِيًّا)، واتە: منیش شایەتی دەدەم هیچ پەرستراوێکی بەهەق نییە جگە لە خوای تاک و تەنها هیچ هاوبەشی نییە، شایەتیش دەدەم کە موحەممەد بەندە و پێغەمبەری خوایە، ڕازی بووم بەوەی خوا پەروەردگارم بێت، ئیسلامیش ئایینم بێت، موحەممەدیش پێغەمبەرم بێت. ئەوە لە گوناهەکانی دەبووردرێت».

١٣٥. عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّه ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه ﷺ: «مَنْ قَالَ حِينَ يَسْمَعُ النِّدَاءَ: اللَّهمَّ رَبَّ هذِه الدَّعْوَةِ التَّامَّةِ، وَالصَّلَاةِ الْقَائِمَةِ، آتِ مُحَمَّدًا الْوَسِيلَةَ، وَالْفَضِيلَةَ، وَابْعَثْه مَقَامًا مَحْمُودًا الَّذِي وَعَدْتَه، إِلَّا حَلَّتْ لَه الشَّفَاعَةُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ».

جابیری کوڕی عەبدوڵڵا ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «هەر

کەسێك گوێبیستی بانگ بوو، (پاشان) گوتی: (اللَّهمَّ رَبَّ هذه الدَّعْوَة التَّامَّة، وَالصَّلَاةِ الْقَائِمَة، آتِ مُحَمَّدًا الْوَسِيلَةَ، وَالْفَضِيلَةَ، وَابْعَثْه مَقَامًا مَحْمُودًا الَّذي وَعَدْتَه)، واته: ئەی پەروەردگاری خاوەن ئەم بانگەوازە تەواوە و ئەم نوێژە ڕاگیراوە کە دەکرێت، وەسیلە و فەزیلە ببەخشە بە موحەممەد ﷺ و بیگەیەنەرە ئەو شوێنە سوپاسگوزارییە کە پەیمانت پێ داوە. ئەوە بێگومان لە ڕۆژی قیامەتدا بەر شەفاعەتی من دەکەوێت».

## بَابُ فَضْلِ الْأَذَانِ وَثَوَابِ الْمُؤَذِّنِينَ

### باسی گەورەیی بانگدان و پاداشتی بانگدەران

١٣٦. عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَبْدِ اللَّه بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي صَعْصَعَةَ، عَنْ أَبِيه رضي الله عنه وَكَانَ أَبُوه فِي حِجْرِ أَبِي سَعِيدٍ، قَالَ: قَالَ لِي أَبُو سَعِيدٍ: إِذَا كُنْتَ فِي الْبَوَادِي، فَارْفَعْ صَوْتَكَ بِالْأَذَانِ، فَإِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّه ﷺ يَقُولُ: «لَا يَسْمَعُه جِنٌّ، وَلَا إِنْسٌ، وَلَا شَجَرٌ، وَلَا حَجَرٌ، إِلَّا شَهِدَ لَه».

عەبدوڕڕەحمانی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی عەبدوڕڕەحمانی کوڕی ئەبو صەعصەعە لە باوکیەوە رضي الله عنه کە لەژێر سەرپەرشتی ئەبو سەعیددا بوو، دەگێڕێتەوە: گوتوویەتی: ئەبو سەعید پێی گوتم: هەر کاتێک لە شیو و دۆڵەکاندا بوویت و بانگت دا، دەنگت بەرز بکەوە، چونکە من لە پێغەمبەری خواوە ﷺ بیستوومە کە دەیفەرموو: «هەر شتێک لە جن و مرۆڤ و داروبەرد کە گوێبیستی بانگ ببێت، ئەوە دەبێتە شایەت بۆی (بۆ بانگبێژ)».

# كِتَابُ الْمَسَاجِدِ وَالْجَمَاعَاتِ

## پەرتووکی مزگەوتەکان و نوێژی بەکۆمەڵ

### بَابُ مَنْ بَنَى لِلَّه مَسْجِدًا

باسی ئەو کەسەی مزگەوتێک دروست دەکات لەپێناوی خوادا

١٣٧. عَنْ عُثْمَانَ بْنِ عَفَّانَ ﵁ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّه ﷺ يَقُولُ: «مَنْ بَنَى لِلَّه مَسْجِدًا، بَنَى اللَّه لَه مِثْلَه فِي الْجَنَّةِ».

عوسمانی کوڕی عەففان ﵁ دەڵێت: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: «هەر کەسێک لەپێناو خوادا مزگەوتێک دروست بکات، ئەوە خوا لە بەهەشتدا ماڵێکی لە وێنەی ئەو مزگەوتە بۆ دروست دەکات».

### بَابُ تَشْيِيدِ الْمَسَاجِدِ

باسی بەرزکردنی مزگەوتەکان زیاد لە پێویست

١٣٨. عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه ﷺ: «لَا تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى يَتَبَاهى

النَّاسُ فِي الْمَسَاجِدِ».

ئەنەسی کوڕی مالیک ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «قیامەت نایەت تاكوو وای لێ نەیەت کە خەڵکی خۆی بە ڕازاندنەوەی مزگەوت هەڵدەکێشێت (واتە: هەر کەسەو بە ڕازاندنەوەی مزگەوتی خۆی دەنازێت و خۆی پێوە هەڵدەکێشێت)».

## بَابُ أَيْنَ يَجُوزُ بِنَاءُ الْمَسَاجِدِ

### باسی دروستکردنی مزگەوت لەکوێ ڕێگە پێ دراوە

١٣٩. عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﵁ قَالَ: كَانَ مَوْضِعُ مَسْجِدِ النَّبِيِّ ﷺ لِبَنِي النَّجَّارِ، وَكَانَ فِيهِ نَخْلٌ، وَمَقَابِرُ لِلْمُشْرِكِينَ، فَقَالَ لَهمُ النَّبِيُّ ﷺ: «ثَامِنُونِي بِه»، قَالُوا: لَا نَأْخُذُ لَه ثَمَنًا أَبَدًا، قَالَ، فَكَانَ النَّبِيُّ ﷺ يَبْنِيه وَهمْ يُنَاوِلُونَه، وَالنَّبِيُّ ﷺ يَقُولُ: «أَلَا إِنَّ الْعَيْشَ عَيْشُ الْآخِرَه، فَاغْفِرْ لِلْأَنْصَارِ، وَالْمُهاجِرَه»، قَالَ: وَكَانَ النَّبِيُّ ﷺ يُصَلِّي قَبْلَ أَنْ يَبْنِيَ الْمَسْجِدَ حَيْثُ أَدْرَكَتْه الصَّلَاةُ.

ئەنەسی کوڕی مالیک ﵁ دەڵێت: شوێنی مزگەوتی پێغەمبەری خوا ﷺ هیی بەنو نەجاڕ بوو، ئەو شوێنە هەم دارخورما و هەم گۆڕی هاوبەشدانەرانی تێدا بوو، جا پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموون: «لەجیاتی ئەم شوێنە پارەم لێ وەربگرن»، ئەوانیش گوتیان: بە هیچ شێوەیەک نرخەکەی وەرناگرین (لە ڕێگەی خوا دەیبەخشین)، ئەنەس ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ بیناکەی دروست دەکرد و ئەوانیش کاریان لەگەڵ دەکرد، پێغەمبەر ﷺ دەیفەرموو: «ئاگادار بن بەڕاستی خۆشی و ژیان تەنها خۆشی دواڕۆژە، خوایە خۆش بیت لە ئەنصاڕ و موهاجیرەکان». ڕاوی دەڵێت: پێش ئەوەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ مزگەوت دروست بکات، لە هەر شوێنێک کاتی نوێژ هاتبایە، ئەوە هەر لەو شوێنە نوێژەکەی دەکرد.

## بَابُ الْمَوَاضِعِ الَّتِي تُكْرَه فِيها الصَّلَاةُ

### باسی ئەو شوێنانەی کە نوێژکردن تێیدا ناپەسندە

١٤٠. عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه ﷺ: «الْأَرْضُ كُلُّها مَسْجِدٌ، إِلَّا الْمَقْبَرَةَ، وَالْحَمَّامَ».

ئەبو سەعیدی خودری ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «زەوی هەمووی مزگەوتە (واتە: گونجاوە بۆ نوێژ تێداکردن) تەنها گۆڕستان و گەرماو (حەمام) نەبێت».

## بَابُ النَّوْمِ فِي الْمَسْجِدِ

### باسی نوستن لەنێو مزگەوتدا

١٤١. عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﵄ قَالَ: كُنَّا نَنَامُ فِي الْمَسْجِدِ عَلَى عَهدِ رَسُولِ اللَّه ﷺ.

ئیبن عومەر ﵄ دەڵێت: ئێمە لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا ﷺ لەنێو مزگەوت دەخەوتین.

## بَابُ أَيُّ مَسْجِدٍ وُضِعَ أَوَّلُ

### باسی کامە مزگەوت یەکەمجار بنیات نرا

١٤٢. عَنْ أَبِي ذَرٍّ الْغِفَارِيِّ ﵁ قَالَ قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّه أَيُّ مَسْجِدٍ وُضِعَ أَوَّلُ؟ قَالَ: «الْمَسْجِدُ الْحَرَامُ»، قَالَ: قُلْتُ: ثُمَّ أَيٌّ؟ قَالَ: «ثُمَّ الْمَسْجِدُ الْأَقْصَى»، قُلْتُ: كَمْ بَيْنَهمَا؟ قَالَ: «أَرْبَعُونَ عَامًا، ثُمَّ الْأَرْضُ لَكَ مُصَلًّى، فَصَلِّ حَيْثُ مَا أَدْرَكَتْكَ الصَّلَاةُ».

ئەبو زەری غیفاری ﷺ دەڵێت: گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ چ مزگەوتێک یەکەمجار بنیات نرا؟ فەرمووی: «مزگەوتی حەڕام»، گوتی: گوتم: ئەی دوای ئەو؟ فەرمووی: «مزگەوتی ئەقصا»، گوتم: نێوانیان چەند بووە؟ فەرمووی: «چل ساڵ، پاشان زەوی هەمووی بۆ تۆ شوێنی نوێژکردنە، لە هەر شوێنێک کاتی نوێژ هات، هەر لەو شوێنە نوێژەکەت ئەنجام بدە».

## بَابُ الدُّعَاءِ عِنْدَ دُخُولِ الْمَسْجِدِ

### باسی دوعای چوونە نێو مزگەوت

١٤٣. عَنْ أَبِي حُمَيْدٍ السَّاعِدِيِّ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه ﷺ: «إِذَا دَخَلَ أَحَدُكُمُ الْمَسْجِدَ، فَلْيُسَلِّمْ عَلَى النَّبِيِّ، ثُمَّ لِيَقُلْ: اللَّهمَّ افْتَحْ لِي أَبْوَابَ رَحْمَتِكَ، وَإِذَا خَرَجَ فَلْيَقُلْ: اللَّهمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ مِنْ فَضْلِكَ».

ئەبو حومەیدی ساعیدی ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «ئەگەر یەکێک لە ئێوە چووە نێو مزگەوت با سەلام و دروود بنێرێت بۆ پێغەمبەر، پاشان با بڵێت: خوایە دەرگاکانی ڕەحمەت و بەزەییتم بۆ بکەیتەوە، کاتێکیش هاتە دەر لە مزگەوت با بڵێت: خوایە داوای فەزڵ و چاکەی تۆ دەکەم».

١٤٤. عَنْ أَبِي هرَيْرَةَ ﷺ: أَنَّ رَسُولَ اللَّه ﷺ قَالَ: «إِذَا دَخَلَ أَحَدُكُمُ الْمَسْجِدَ، فَلْيُسَلِّمْ عَلَى النَّبِيِّ ﷺ، وَلْيَقُلْ: اللَّهمَّ افْتَحْ لِي أَبْوَابَ رَحْمَتِكَ، وَإِذَا خَرَجَ، فَلْيُسَلِّمْ عَلَى النَّبِيِّ ﷺ، وَلْيَقُلْ: اللَّهمَّ اعْصِمْنِي مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ».

ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «کاتێک هەر یەکێکتان دەچێتە نێو مزگەوت، با سڵاو بنێرێت بۆ پێغەمبەر ﷺ و بڵێت: خوایە دەرگاکانی ڕەحمەت و بەزەییتم بۆ بکەیتەوە، وە کاتێکیش دەرچوو لە مزگەوت، با سڵاو بنێرێت بۆ پێغەمبەر ﷺ و بڵێت: خوایە بمپارێزە لە شەیتانی دوورخراوە لە بەزەیی خۆت».

## بَابُ الْمَشْيِ إِلَى الصَّلَاةِ

### باسی ڕۆیشتن بۆ نوێژ

١٤٥. عَنْ أَبِي هرَيْرَةَ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه ﷺ: «إِذَا تَوَضَّأَ أَحَدُكُمْ، فَأَحْسَنَ الْوُضُوءَ، ثُمَّ أَتَى الْمَسْجِدَ، لَا يَنْهزُه إِلَّا الصَّلَاةُ، لَا يُرِيدُ إِلَّا الصَّلَاةَ، لَمْ يَخْطُ خَطْوَةً إِلَّا رَفَعَه اللَّه بِها دَرَجَةً، وَحَطَّ عَنْه بِها خَطِيئَةً، حَتَّى يَدْخُلَ الْمَسْجِدَ، فَإِذَا دَخَلَ الْمَسْجِدَ، كَانَ فِي صَلَاةٍ مَا كَانَتِ الصَّلَاةُ تَحْبِسُه».

ئەبو هورەیرە ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «ئەگەر یەکێک لە ئێوە دەستنوێژێکی جوان و تەواوی شوشت، پاشان هاتە مزگەوت کە تەنها نوێژ پاڵی ناوە کە لە ماڵ دەربچێت و بە مەبەستی نوێژ هاتبێت، ئەوە بە هەر هەنگاوێک خوا پلەیەکی بەرز دەکاتەوە و گوناهێکی لێ دەسڕێتەوە تاکوو دەچێتە نێو مزگەوت، ئینجا کە چووە نێو مزگەوت وەکوو ئەوە وایە کە بەردەوام لە نوێژدایە مادام تەنها لەبەر نوێژ ماوەتەوە (وە چاوەڕێی نوێژێکی دیکە دەکات)».

١٤٦. عَنْ سَهلِ بْنِ سَعْدِ السَّاعِدِيِّ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه ﷺ: «لِيَبْشَرِ الْمَشَّاءُونَ فِي الظُّلَمِ، بِنُورٍ تَامٍّ يَوْمَ الْقِيَامَةِ».

سەهلی کوڕی سەعدی ساعیدی ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «مژدە بێت لەوانەی کە هاموشۆی مزگەوت دەکەن لە تاریکیدا، بە نوور و ڕۆشناییەکی تێر و تەواو لە ڕۆژی قیامەتدا».

## بَاب الْأَبْعَدُ فَالْأَبْعَدُ مِنَ الْمَسْجِدِ أَعْظَمُ أَجْرًا

### باسی ئەوەی هەتا دوورتر بێت لە مزگەوت پاداشتەکە زیاترە

١٤٧. عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﵁ قَالَ: أَرَادَتْ بَنُو سَلِمَةَ أَنْ يَتَحَوَّلُوا مِنْ دِيَارِهِمْ

إِلَى قُرْبِ الْمَسْجِدِ، فَكَرِهَ النَّبِيُّ ﷺ أَنْ يُعْرُوا الْمَدِينَةَ، فَقَالَ: «يَا بَنِي سَلِمَةَ، أَلَا تَحْتَسِبُونَ آثَارَكُمْ؟»، فَأَقَامُوا.

ئەنەسی کوڕی مالیک ﵁ دەڵێت: نەوەکانی سەلەمە ویستیان لە دەوری شار ماڵەکانیان بگوازنەوە بۆ نزیک مزگەوت، پێغەمبەریش ﷺ پێی خۆش نەبوو دەوری مەدینە چۆڵ بێت، بۆیە فەرمووی: «ئەی نەوەکانی سەلەمە بەتەمای پاداشتی هەنگاوەکانتان نین لای خوا؟»، ئیدی ئەوانیش مانەوە (پێشنیارەکەی پێغەمبەریان ﷺ قبووڵ کرد).

## بَابُ فَضْلِ الصَّلَاةِ فِي جَمَاعَةٍ

## باسی گەورەیی و پاداشتی نوێژی بەکۆمەڵ

١٤٨. عَنْ أَبِي هرَيْرَةَ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: «صَلَاةُ الرَّجُلِ فِي جَمَاعَةٍ، تَزِيدُ عَلَى صَلَاتِهِ فِي بَيْتِهِ وَصَلَاتِهِ فِي سُوقِهِ بِضْعًا وَعِشْرِينَ دَرَجَةً».

ئەبو هورەیرە ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «نوێژێک کە پیاو بەکۆمەڵ بیکات، بیست و ئەوەندە جار پلە و پاداشتی زیاترە لەو نوێژەی کە لە ماڵەوە، یان لە بازاڕ بەتەنیا دەیکات».

✍ تێبینی:
(بِضع): لە زمانی عەرەبی ژمارە (٣) تاکوو (٩) دەگرێتەوە.

## بَابُ صَلَاةِ الْعِشَاءِ وَالْفَجْرِ فِي جَمَاعَةٍ

## باسی نوێژی خەوتنان و بەیانی بەکۆمەڵ

١٤٩. عَنْ عَائِشَةُ ﵂ قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: «لَوْ يَعْلَمُ النَّاسُ مَا فِي صَلَاةِ

الْعِشَاءِ، وَصَلَاةِ الْفَجْرِ، لَأَتَوْهُمَا وَلَوْ حَبْوًا».

عائیشە ﵂ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «ئەگەر خەڵکی گەورەیی و پاداشتی نوێژی خەوتنان و بەیانییان بزانییایە، ئەوە ئەگەر بەگاگۆڵکەش بووایە دەهاتن بۆ ئەنجامدانی».

## بَابُ لُزُومِ الْمَسَاجِدِ وَانْتِظَارِ الصَّلَاةِ

### باسی پابەندبوون بە مزگەوت و چاوەڕوانیکردنی نوێژ

١٥٠. عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو ﵄ قَالَ: صَلَّيْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ الْمَغْرِبَ، فَرَجَعَ مَنْ رَجَعَ، وَعَقَّبَ مَنْ عَقَّبَ، فَجَاءَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مُسْرِعًا، قَدْ حَفَزَهُ النَّفَسُ، وَقَدْ حَسَرَ عَنْ رُكْبَتَيْهِ، فَقَالَ: «أَبْشِرُوا، هَذَا رَبُّكُمْ قَدْ فَتَحَ بَابًا مِنْ أَبْوَابِ السَّمَاءِ، يُبَاهِي بِكُمُ الْمَلَائِكَةَ، يَقُولُ: انْظُرُوا إِلَى عِبَادِي قَدْ قَضَوْا فَرِيضَةً، وَهُمْ يَنْتَظِرُونَ أُخْرَى».

عەبدوڵڵای کوڕی عەمر ﵄ دەڵێت: لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی شێوانمان کرد، پاشان ئەوەی ڕۆیشتەوە ڕۆیشتەوە، ئەوەشی کە مایەوە مایەوە، ئینجا پێغەمبەری خوا ﷺ بەخێرایی هات، هەناسەکانی بەخێرایی لێدەدا و ئەژنۆکانی دەرکەوتن، جا فەرمووی: «موژدەتان لێ بێ ئەوە خوای پەروەردگارتان دەرگایەک لە دەرگاکانی ئاسمانی کردۆتەوە لای فریشتەکان ڕاتاندەنوێنێت و شانازیتان پێوە دەکات، دەفەرموێت: تەماشای بەندەکانم بکەن یەکێک لە فەرزەکانیان کردووە و چاوەڕێی یەکێکی دیکە دەکەن».

# كِتَابُ إِقَامَةِ الصَّلَاةِ وَالسُّنَّةُ فِيها

## پەرتووکی نوێژ بەرپاکردن
## و سوننەتەکانی نێو نوێژ

### بَابُ افْتِتَاحِ الصَّلَاةِ

### باسی دەستپێکی نوێژ

١٥١. عَنْ أَبِي حُمَيْدٍ السَّاعِدِيِّ ﷺ يَقُولُ: كَانَ رَسُولُ اللَّه ﷺ: إِذَا قَامَ إِلَى الصَّلَاةِ، اسْتَقْبَلَ الْقِبْلَةَ، وَرَفَعَ يَدَيْه، وَقَالَ: «اللَّه أَكْبَرُ».

ئەبو حومەیدی ساعیدی ﷺ دەڵێت: هەر کاتێک پێغەمبەری خوا ﷺ هەڵسابایە بۆ نوێژ، ڕووی دەکردە ڕووگە و دەستەکانی بەرز دەکردەوە و دەیفەرموو: «اللَّهُ أَكْبَرَ».

١٥٢. عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّه ﷺ، يَسْتَفْتِحُ صَلَاتَه يَقُولُ: «سُبْحَانَكَ اللَّهمَّ وَبِحَمْدِكَ، وَتَبَارَكَ اسْمُكَ، وَتَعَالَى جَدُّكَ، وَلَا إِلَه غَيْرُكَ».

ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەستپێکی نوێژی بەوە بوو کە دەیفەرموو: «سُبْحَانَكَ اللَّهمَّ وَبِحَمْدِكَ، وَتَبَارَكَ اسْمُكَ، وَتَعَالَى جَدُّكَ، وَلَا إِلَه غَيْرُكَ، واتە: پاک و بێگەردی بۆ تۆ خوایە، سوپاس و ستاییش بۆ تۆ، ناوت بەرز و

پیرۆزە، خاوەنی بەرزی و شکۆی، هیچ پەرستراوێکی بەهەق نییە جگە لە تۆ».

## بَابُ وَضْعِ الْيَمِينِ عَلَى الشِّمَالِ فِي الصَّلَاةِ

### باسی دانانی دەستی ڕاست لەسەر دەستی چەپ لە نوێژدا

١٥٣. عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ ﵁ قَالَ: مَرَّ بِيَ النَّبِيُّ ﷺ وَأَنَا وَاضِعٌ يَدِي الْيُسْرَى عَلَى الْيُمْنَى فَأَخَذَ بِيَدِي الْيُمْنَى فَوَضَعَها عَلَى الْيُسْرَى.

عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود ﵁ دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ بەلامدا تێپەڕی، من لەو کاتەدا دەستی چەپم لەسەر دەستی ڕاستم دانابوو، ئینجا (پێغەمبەری خوا ﷺ) دەستی ڕاستمی گرت و لەسەر دەستی چەپمی دانا.

## بَابُ افْتِتَاحِ الْقِرَاءَةِ

### باسی دەستپێکی خوێندنی فاتیحە

١٥٤. عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، يَفْتَتِحُ الْقِرَاءَةَ بِ: {الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ} الفاتحة: ٢.

عائیشە ﵂ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ بە: {الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ}، دەستی بە خوێندنی فاتیحە دەکرد (لە نوێژدا).

## بَابُ الْقِرَاءَةِ فِي صَلَاةِ الْفَجْرِ

### باسی خوێندنی قورئان لە نوێژی بەیانیدا

١٥٥. عَنْ قُطْبَةَ بْنِ مَالِكٍ ﵁: سَمِعَ النَّبِيَّ ﷺ يَقْرَأُ فِي الصُّبْحِ: {وَالنَّخْلَ بَاسِقَاتٍ

لَها طَلْعٌ نَضِيدٌ} ق: ١٠.

قوتبەی کوڕی مالیک ﷺ دەگێڕێتەوە: گوێی لە پێغەمبەر ﷺ بووە لە نوێژی بەیانیدا ئەو ئایەتەی دەخوێندەوە: {وَالنَّخْلَ بَاسِقَاتٍ لَها طَلْعٌ نَضِيدٌ}، واتە: هەروەها دارخورمای بەرز و بڵند بە هێشووی تێکپەستراوەوە.

## بَابُ الْقِرَاءَةِ فِي صَلَاةِ الْفَجْرِ يَوْمَ الْجُمُعَةِ

### باسی خوێندنی قورئان لە نوێژی بەیانی ڕۆژی جومعەدا

١٥٦. عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ: قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَقْرَأُ فِي صَلَاةِ الصُّبْحِ يَوْمَ الْجُمُعَةِ: {الم (١) تَنْزِيلُ} السَّجدَة: ٢، وَ: {هَلْ أَتَى عَلَى الْإِنْسَانِ} الانسان: ٢.

ئیبن عەبباس ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ لە نوێژی بەیانی ڕۆژی جومعەدا سووڕەتی: {الم (١) تَنْزِيلُ}، و: {هَلْ أَتَى عَلَى الْإِنْسَانِ}ی دەخوێند. (واتە: سووڕەتەکانی: السجدة و الإنسان).

## بَابُ الْقِرَاءَةِ فِي الظُّهرِ وَالْعَصْرِ

### باسی خوێندنی قورئان لە نوێژی نیوەڕۆ و عەسردا

١٥٧. عَنْ قَزَعَةَ ﷺ قَالَ: سَأَلْتُ أَبَا سَعِيدٍ الْخُدْرِيَّ، عَنْ صَلَاةِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَ: لَيْسَ لَكَ فِي ذَلِكَ خَيْرٌ، قُلْتُ: بَيِّنْ، رَحِمَكَ اللَّهُ، قَالَ: كَانَتِ الصَّلَاةُ تُقَامُ لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ الظُّهرَ، فَيَخْرُجُ أَحَدُنَا إِلَى الْبَقِيعِ، فَيَقْضِي حَاجَتَه، فَيَجِيءُ فَيَتَوَضَّأُ، فَيَجِدُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فِي الرَّكْعَةِ الْأُولَى مِنَ الظُّهرِ.

قەزەعە ﷺ دەڵێت: پرسیارم لە ئەبو سەعیدی خودری کرد دەربارەی نوێژی پێغەمبەری خوا ﷺ، ئەویش گوتی: (لە وەڵامی ئەو پرسیارە) هیچ چاکەیەکت بۆ

نییە (چونکە دەیزانی کە پێشی بڵێت ناتوانێت بیکات، بۆیە گوتی خێری لێ ناکەیت)، قەزەعە دەڵێت: گوتم: بۆم ڕوون بکەوە ڕەحمەتی خوات لێ بێت، گوتی: قامەتی نوێژ بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ دەکرا بۆ نوێژی نیوەڕۆ، یەکێک لە ئێمە (دەیتوانی) بچێت بۆ بەقیع لەوێ پێویستییەکەی جێبەجێ بکات و بێتەوە دەستنوێژ بشوات، ئەو جاریش دەیبینی کە پێغەمبەری خوا ﷺ هەر لە ڕکاتی یەکەمی نوێژی نیوەڕۆدایە.

 تێبینی:

مەبەست لەو درێژکردنەوەی نوێژە تەنیا ڕکاتی یەکەمە، ئەویش بە مەبەستی ئەوەی خەڵک بە نوێژی بەکۆمەڵ ڕابگەن، بۆیە ڕکاتی یەکەمی نوێژەکەی درێژ دەکردەوە، ئەمە تێگەیشتن و قسەی هەندێک لە هاوەڵانە، هەندێکیش گوتوویانە ڕکاتی یەکەم و دووەمی درێژ دەکردەوە.



## بَابُ الْقِرَاءَةِ فِي صَلَاةِ الْمَغْرِبِ

### باسی خوێندنی قورئان لە نوێژی شێواندا

١٥٨. عَنْ جُبَيْرِ بْنِ مُطْعِمٍ رضي الله عنه قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَقْرَأُ فِي الْمَغْرِبِ بِالطُّورِ، قَالَ جُبَيْرٌ فِي غَيْرِ هذَا الْحَدِيثِ: فَلَمَّا سَمِعْتُه يَقْرَأُ: {أَمْ خُلِقُوا مِنْ غَيْرِ شَيْءٍ أَمْ هُمُ الْخَالِقُونَ} الطور: ٣٥، إِلَى قَوْلِه: {فَلْيَأْتِ مُسْتَمِعُهُمْ بِسُلْطَانٍ مُبِينٍ} الطور: ٣٨، كَادَ قَلْبِي يَطِيرُ.

جوبەیری کوڕی موتعیم رضي الله عنه دەڵێت: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو کە لە نوێژی شێواندا سووڕەتی (الطور)ـی دەخوێند. جوبەیر لە جگە لەم فەرموودەیەدا، دەڵێت: کاتێک گوێم لێ بوو کە (پێغەمبەر ﷺ) ئەم ئایەتانەی دەخوێند: {أَمْ خُلِقُوا مِنْ غَيْرِ شَيْءٍ أَمْ هُمُ الْخَالِقُونَ}، واتە: ئایا ئەوان لە خۆیانەوە دروست بوون یان خۆیان دروستکەری خۆیانن، تا دەگاتە ئەوەی: {فَلْيَأْتِ مُسْتَمِعُهُمْ بِسُلْطَانٍ مُبِينٍ}، واتە: جا (ئەگەر ڕاست دەکەن) با گوێگرەکەیان بەڵگەیەکی ڕوون بهێنێت». (جوبەیر دەڵێت:) خەریک بوو دڵم

بفڕێت (لەبەر ڕوون و ئاشكرایی هەق و دەركەوتنی ناهەق بۆم).

## بَابُ الْقِرَاءَةِ فِي صَلَاةِ الْعِشَاءِ

### باسی خوێندنی قوڕئان لە نوێژی خەوتناندا

١٥٩. عَنِ الْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ ﵁: أَنَّه صَلَّى مَعَ النَّبِيِّ ﷺ الْعِشَاءَ الْآخِرَةَ، قَالَ: فَسَمِعْتُه يَقْرَأُ بِالتِّينِ وَالزَّيْتُونِ.

بەرائی كوڕی عازیب ﵁ كە لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ نوێژی خەوتنانی كردووە دەڵێت: گوێبیستی (پێغەمبەری خوا ﷺ) بووم كە سووڕەتی (التین)ـی دەخوێند.

## بَابُ الْقِرَاءَةِ خَلْفَ الْإِمَامِ

### باسی خوێندنی قوڕئان لەدوای ئیمام (لە نوێژدا)

١٦٠. عَنْ عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ ﵁ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «لَا صَلَاةَ لِمَنْ لَمْ يَقْرَأْ فِيها بِفَاتِحَةِ الْكِتَابِ».

عوبادەی كوڕی صامیت ﵁ دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: «هەر كەسێك لە نوێژدا فاتیحە نەخوێنێت نوێژەكەی بەرناكەوێت».

## بَابُ إِذَا قَرَأَ الْإِمَامُ فَأَنْصِتُوا

### باسی بێدەنگبوون كاتێك ئیمام قوڕئان دەخوێنێ (لە نوێژدا)

١٦١. عَنِ ابْنِ أُكَيْمَةَ ﵁ قَالَ: سَمِعْتُ أَبَا هرَيْرَةَ ﵁ يَقُولُ: صَلَّى النَّبِيُّ ﷺ بِأَصْحَابِه صَلَاةً، نَظُنُّ أَنَّها الصُّبْحُ، فَقَالَ: «هلْ قَرَأَ مِنْكُمْ مِنْ أَحَدٍ؟»، قَالَ رَجُلٌ: أَنَا، قَالَ:

«إِنِّي أَقُولُ مَا لِي أُنَازَعُ الْقُرْآنَ».

ئیبن ئوکەیمە ﵁ دەڵێت: گوێم لە ئەبو هورەیرە ﵁ بوو دەیگوت: پێغەمبەر ﷺ بەرنوێژیی بۆ هاوەڵانی کرد لە یەکێک لە نوێژەکان کە پێم وایە نوێژی بەیانی بوو، ئینجا فەرمووی: «ئایا هیچ یەکێک لە ئێوە (لەگەڵ مندا) قورئانی خوێند؟»، پیاوێک گوتی: من، (پێغەمبەری خوا ﷺ) فەرمووی: «ئەوە بۆیە (لە دڵی خۆمدا) دەمگوت دەبێت بۆ بەربەرەکانیم بکرێت (لە قورئانخوێندندا)».

## بَابُ الْجَهرِ بِآمِينَ

### باسی دەنگبەرزکردنەوە بە (آمین) دوای فاتیحە

١٦٢. عَنْ عَائِشَةَ ﵂ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «مَا حَسَدَتْكُمُ الْيَهودُ عَلَى شَيْءٍ، مَا حَسَدَتْكُمْ عَلَى السَّلَامِ وَالتَّأْمِينِ».

عائیشە ﵂ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: «جوولەکە لە هیچ شتێک هێندە حەسوودیتان پێ نابەن وەکوو لە سەلامکردن و گوتنی: ئامین، حەسوودیتان پێ دەبەن».

## بَابُ رَفْعِ الْيَدَيْنِ إِذَا رَكَعَ، وَإِذَا رَفَعَ رَأْسَه مِنَ الرُّكُوعِ

### باسی دەستبەرزکردنەوە لە کاتی ڕکووعبردن و هەستانەوە لە ڕکووع

١٦٣. عَنْ ابْنِ عُمَرَ ﵄ قَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّه ﷺ، إِذَا افْتَتَحَ الصَّلَاةَ رَفَعَ يَدَيْه حَتَّى يُحَاذِيَ بِهِمَا مَنْكِبَيْه، وَإِذَا رَكَعَ، وَإِذَا رَفَعَ رَأْسَه مِنَ الرُّكُوعِ، وَلَا يَرْفَعُ بَيْنَ السَّجْدَتَيْنِ.

ئیبن عومەر ﵄ دەڵێت: پێغەمبەری خوام ﷺ بینیوە کاتێک دەستی دەکرد بە نوێژ

دەستەكانی بەرز دەكردەوە تاكوو ئاستی شانەكانی، هەروەها لە كاتی ڕكووع و هەڵسانەوەش لە ڕكووع (بە هەمان شێوە دەستی بەرز دەكردەوە)، بەڵام لە نێوان دوو سوجدەكاندا دەستی بەرز نەدەكردەوە.

## بَابُ الرُّكُوعِ فِي الصَّلَاةِ

### باسی ڕكووع لە نوێژدا

١٦٤. عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّه ﷺ إِذَا رَكَعَ لَمْ يَشْخَصْ رَأْسَه، وَلَمْ يُصَوِّبْه، وَلَكِنْ بَيْنَ ذَلِكَ.

عائیشە ﵂ دەڵێت: كاتێک پێغەمبەری خوا ﷺ ڕكووعی دەبرد نە سەری بەرز دەكردەوە، نە نزمیش، بەڵكوو لەو نێوانەدا بوو.

١٦٥. عَنْ عَلِيِّ بْنِ شَيْبَانَ ﵁ وَكَانَ مِنَ الْوَفْدِ، قَالَ: خَرَجْنَا إِلَى رَسُولِ اللَّه ﷺ، فَبَايَعْنَاه وَصَلَّيْنَا خَلْفَه، فَلَمَحَ بِمُؤْخِرِ عَيْنِه رَجُلاً، لَا يُقِيمُ صَلَاتَه، -يَعْنِي: صُلْبَه- فِي الرُّكُوعِ وَالسُّجُودِ، فَلَمَّا قَضَى النَّبِيُّ ﷺ الصَّلَاةَ، قَالَ: «يَا مَعْشَرَ الْمُسْلِمِينَ لَا صَلَاةَ لِمَنْ لَا يُقِيمُ صُلْبَه فِي الرُّكُوعِ وَالسُّجُودِ».

عەلی كوڕی شەیبان ﵁ كە لەگەڵ وەفدێک بووە، دەڵێت: دەرچووین تاكوو هاتینە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ، دەڵێت: ئێمەش پەیمانمان پێ دا و نوێژمان لەدوایەوە كرد، ئینجا (پێغەمبەر ﷺ) بە نیگای چاوەكانی پیاوێكی بینی لەدواوە كە لە نوێژدا تەواو پشتی ڕاست ناكاتەوە لە ڕكووع و سوجدەدا، جا كاتێک پێغەمبەر ﷺ لە نوێژەكەی تەواو بوو فەرمووی: «ئەی كۆمەڵی موسوڵمانان هەر كەسێک لە ڕكووع و سوجدەدا پشتی ڕاست نەكاتەوە نوێژەكەی دروست نییە».

## بَابُ مَا يَقُولُ إِذَا رَفَعَ رَأْسَه مِنَ الرُّكُوعِ

### باسی ئەوەی کە لەدوای هەستانەوە لە ڕکووع دەگوترێت

١٦٦. عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ: أَنَّه سَمِعَ رَسُولَ اللَّه ﷺ يَقُولُ: «إِذَا قَالَ الْإِمَامُ: سَمِعَ اللَّه لِمَنْ حَمِدَه، فَقُولُوا: اللَّهمَّ رَبَّنَا وَلَكَ الْحَمْدُ».

ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەگێڕێتەوە: گوێی لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: «هەرکات پێشنوێژ (ئیمام) گوتی: سَمِعَ اللَّه لِمَنْ حَمِدَه، ئێوەش بڵێین: رَبَّنَا وَلَكَ الْحَمْدُ».

## بَابُ السُّجُودِ



### باسی سوجدەبردن

١٦٧. عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه ﷺ: «أُمِرْتُ أَنْ أَسْجُدَ عَلَى سَبْعٍ، وَلَا أَكُفَّ شَعَرًا، وَلَا ثَوْبًا». قَالَ ابْنُ طَاوُسٍ: فَكَانَ أَبِي يَقُولُ: الْيَدَيْنِ وَالرُّكْبَتَيْنِ وَالْقَدَمَيْنِ، وَكَانَ يَعُدُّ الْجَبْهةَ وَالْأَنْفَ وَاحِداً.

ئیبن عەبباس ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «فەرمانم پێ کراوە، کە لەسەر حەوت (ئەندامی جەستە) سوجدە بەرم، (لە کاتی نوێژدا) نە پرچ و نە پۆشاکم نەپێچمەوە و خڕیان نەکەمەوە». ئیبن تاوس دەڵێت: باوکم دەیگوت حەوتەکان بریتین لە: دوو دەستەکان و دوو ئەژنۆکان و هەردوو پێیەکان، نێوچاوان و لووتی بە یەک دادەنا.

## بَابُ التَّسْبِيحِ فِي الرُّكُوعِ وَالسُّجُودِ

### باسی زیکری نێو ڕکووع و سوجده

١٦٨. عَنْ حُذَيْفَةَ بْنِ الْيَمَانِ ﵁: أَنَّه سَمِعَ رَسُولَ اللَّه ﷺ يَقُولُ إِذَا رَكَعَ: «سُبْحَانَ رَبِّيَ الْعَظِيمِ»، ثَلَاثَ مَرَّاتٍ، وَإِذَا سَجَدَ قَالَ: «سُبْحَانَ رَبِّيَ الْأَعْلَى»، ثَلَاثَ مَرَّاتٍ.

حوزەیفەی کوڕی یەمان ﵁ دەگێڕێتەوە: گوێی لە پێغەمبەری خوا ﷺ بووە کە کاتێک ڕکووعی دەبرد سێ جار دەیفەرموو: «سُبْحَانَ رَبِّيَ الْعَظِيمِ»، وە کاتێک سوجدەی دەبرد سێ جار دەیفەرموو: «سُبْحَانَ رَبِّيَ الأَعْلَى».

## بَابُ الِاعْتِدَالِ فِي السُّجُودِ



### باسی ڕێک و ڕاستبوون لە سوجدەدا

١٦٩. عَنْ جَابِرٍ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه ﷺ: «إِذَا سَجَدَ أَحَدُكُمْ فَلْيَعْتَدِلْ، وَلَا يَفْتَرِشْ ذِرَاعَيْه افْتِرَاشَ الْكَلْبِ».

جابیر ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «ئەگەر یەکێکتان سوجدەی برد، با هاوسەنگ بێت (لە بەینی ڕاخستن و دانانی دەست و باسک لەسەر زەوی و لە نێوان جیاکردنەوەی دەست و باسک لە تەنیشتەکانی و لکاندنیان)، دەستەکانی بە شێوەیەک ڕانەکێشێت لەسەر زەوی هەر وەکوو چۆن سەگ ڕایاندەکێشێت».

## بَابُ الْجُلُوسِ بَيْنَ السَّجْدَتَيْنِ

### باسی دانیشتن لە نێوان دوو سوجدەدا

١٧٠. عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّه ﷺ، إِذَا رَفَعَ رَأْسَه مِنَ الرُّكُوعِ لَمْ

يَسْجُدْ حَتَّى يَسْتَوِيَ قَائِمًا، فَإِذَا سَجَدَ فَرَفَعَ رَأْسَه، لَمْ يَسْجُدْ حَتَّى يَسْتَوِيَ جَالِسًا، وَكَانَ يَفْتَرِشُ رِجْلَه الْيُسْرَى.

عائیشه ﵂ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێک لە ڕکووع سەری بەرز دەکردەوە (هەڵدەستایەوە)، نەدەچوویە سوجدە تاکوو تەواو بەپێوە ڕێک نەبووبایەوە (ئەوجار سوجدەی دەبرد)، کاتێک سوجدەی دەبرد و سەری لە سوجدە بەرز دەکردەوە، نەدەچووە سوجدە تاکوو بەدانیشتنەوە (پشتی) ڕێک نەبووبایەوە (ئینجا دەچووە سوجدە)، لە دانیشتنی نێوان سوجدەکاندا لاقی چەپی ڕادەخست.

## بَابُ مَا يَقُولُ بَيْنَ السَّجْدَتَيْنِ

### باسی زیکری نێوان سوجدەکان

١٧١. عَنْ حُذَيْفَةَ ﵁: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يَقُولُ بَيْنَ السَّجْدَتَيْنِ: «رَبِّ اغْفِرْ لِي، رَبِّ اغْفِرْ لِي».

حوزەیفە ﵁ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ لە نێوان سوجدەکاندا دوو جار دەیفەرموو: «(رَبِّ اغْفِرْ لِي، رَبِّ اغْفِرْ لِي)، واتە: پەروەردگارە لێم خۆش بە».

## بَابُ مَا جَاءَ فِي التَّشَهدِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی زیکر لە تەحییاتدا

١٧٢. عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّه ﷺ يُعَلِّمُنَا التَّشهدَ كَمَا يُعَلِّمُنَا السُّورَةَ مِنَ الْقُرْآنِ، فَكَانَ يَقُولُ: «التَّحِيَّاتُ الْمُبَارَكَاتُ الصَّلَوَاتُ الطَّيِّبَاتُ لِلَّه، السَّلَامُ عَلَيْكَ أَيُّها النَّبِيُّ وَرَحْمَةُ اللَّه وَبَرَكَاتُه، السَّلَامُ عَلَيْنَا وَعَلَى عِبَادِ اللَّه الصَّالِحِينَ، أَشْهدُ أَنْ لَا إِلَه إِلَّا اللَّه، وَأَشْهدُ أَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُه وَرَسُولُه».

ئیبن عەبباس ﵄ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ خوێندنی تەحییاتی فێر دەکردین هەر وەک چۆن سوورەتێکی قورئانی فێر دەکردین، جا دەیفەرموو: «هەرچی قەدر و ڕێزە چ گوفتار، چ کردار، هەرچی سەرچاوەی پاکی و خاوێنییە ئەوانە لە ڕاستییدا هەموویان شاییستەی خوان، دروودی خوا لەسەر تۆ ئەی پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ ڕەحمەت و بەرەکەتی خوا، دروود و سەلام لەسەر ئێمەش وە لەسەر هەموو بەندە باشەکانی خوا، شایەتی و گەواهی دەدەم کە هیچ پەرستراوێکی بەهەق نییە جگە لە خوا، شایەتی دەدەم کە موحەممەد ﷺ بەندە و نێردراوی خوایە».

## بَابُ الصَّلَاةِ عَلَى النَّبِيِّ ﷺ

### باسی سەڵاواتدان لەسەر پێغەمبەر ﷺ

١٧٣. عَنِ ابْنِ أَبِي لَيْلَى ﵁ قَالَ: لَقِيَنِي كَعْبُ بْنُ عُجْرَةَ ﵁ فَقَالَ: أَلَا أُهْدِي لَكَ هَدِيَّةً؟ خَرَجَ عَلَيْنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، فَقُلْنَا: قَدْ عَرَفْنَا السَّلَامَ عَلَيْكَ، فَكَيْفَ الصَّلَاةُ عَلَيْكَ؟ قَالَ: «قُولُوا: اللَّهُمَّ صَلِّ عَلَى مُحَمَّدٍ، وَعَلَى آلِ مُحَمَّدٍ، كَمَا صَلَّيْتَ عَلَى إِبْرَاهِيمَ، إِنَّكَ حَمِيدٌ مَجِيدٌ، اللَّهُمَّ بَارِكْ عَلَى مُحَمَّدٍ، وَعَلَى آلِ مُحَمَّدٍ، كَمَا بَارَكْتَ عَلَى إِبْرَاهِيمَ، إِنَّكَ حَمِيدٌ مَجِيدٌ».

ئیبن ئەبو لەیلا ﵁ دەڵێت: کەعبی کوڕی عوجرە ﵁ هاتە لام و گوتی: ئایا دیارییەکت پێ نەدەم؟ (جا گوتی:) پێغەمبەری خوا ﷺ هاتە لامان، ئێمەش پێمان گوت: لە ڕاستیدا ئێمە فێر بووین کە چۆن سەلامت لێ بکەین، ئەی سەڵاواتدان لەسەر جەنابت چۆنە و چۆن دەبێت؟ (پێغەمبەریش ﷺ) فەرمووی: «بڵێن: اللَّهمَّ صَلِّ عَلَى مُحَمَّد، وَعَلَى آل مُحَمَّد، كَمَا صَلَّيْتَ عَلَى إِبْرَاهِيمَ، إِنَّكَ حَميدٌ مَجِيدٌ، اللَّهمَّ بَارِكْ عَلَى مُحَمَّدٍ، وَعَلَى آلِ مُحَمَّدٍ، كَمَا بَارَكْتَ عَلَى إِبْرَاهِيمَ، إِنَّكَ حَمِيدٌ مَجِيدٌ».

## بَابُ الْإِشَارَةِ فِي التَّشَهدِ

### باسی ئاماژەی (پەنجەی شایەتمان) لە تەحییاتدا

١٧٤. عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﵄: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ إِذَا جَلَسَ فِي الصَّلَاةِ، وَضَعَ يَدَيْه عَلَى رُكْبَتَيْه، وَرَفَعَ إِصْبَعَه الْيُمْنَى الَّتِي تَلِي الْإِبْهامَ، فَيَدْعُو بِها، وَالْيُسْرَى عَلَى رُكْبَتِه بَاسِطَها عَلَيْها.

ئیبن عومەر ﵄ دەگێڕێتەوە: هەر کات پێغەمبەری خوا ﷺ دادەنیشت لە نوێژدا، ئەوە دەستەکانی لەسەر ئەژنۆکانی دادەنا و پەنجەی (شایەتمانی) دەستی ڕاستی کە لەدوای پەنجە گەورەیە بەرزی دەکردەوە و دوعای پێ دەکرد، (دەستی) چەپیشی لەسەر ئەژنۆی (چەپی) دادەنا و درێژی دەکرد.

## بَابُ التَّسْلِيمِ

### باسی سەلامدانەوەی نوێژ

١٧٥. عَنْ عَبْدِ اللَّه ﵁: أَنَّ رَسُولَ اللَّه ﷺ كَانَ يُسَلِّمُ عَنْ يَمِينِه وَعَنْ شِمَالِه حَتَّى يُرَى بَيَاضُ خَدِّه، «السَّلَامُ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَةُ اللَّه».

عەبدوڵڵا ﵁ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ بە لای ڕاست و چەپدا سەلامی دەدایەوە (بەجۆرێک سەلامی دەدایەوە) تاوەکوو سپییەتی ڕوومەتی دەبینرا، (وتەی سەلامدانەوەکەی ئاوا بوو کە دەیفەرموو:) «السَّلَامُ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَةُ اللَّه».

## بَابُ مَا يُقَالُ بَعْدَ التَّسْلِيمِ

### باسی ئەوەی کە لەدوای سەلامدانەوە دەگوترێت

١٧٦. عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِذَا سَلَّمَ لَمْ يَقْعُدْ إِلَّا مِقْدَارَ مَا يَقُولُ: «اللَّهُمَّ أَنْتَ السَّلَامُ، وَمِنْكَ السَّلَامُ، تَبَارَكْتَ يَا ذَا الْجَلَالِ وَالْإِكْرَامِ».

عائیشه ﵂ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێک سەلامی دەدایەوە تەنها بەئەندازەی ئەوەندە (بەرامبەر قیبلە) دادەنیشت کە بفەرمووێت: «خوایە تۆ خۆت خاوەنی ئاشتی و هێمنی، ئاشتی هەر لە تۆوەیە، بەرز و پیرۆزیت خاوەنی شکۆ و ڕێزیت».

١٧٧. عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ ﵂: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يَقُولُ إِذَا صَلَّى الصُّبْحَ حِينَ يُسَلِّمُ: «اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ عِلْمًا نَافِعًا، وَرِزْقًا طَيِّبًا، وَعَمَلًا مُتَقَبَّلًا».

ئوم سەلەمە ﵂ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ کە نوێژی بەیانی دەکرد و سەلامی دەدایەوە دەیفەرموو: «خوایە داوای زانستێکت لێ دەکەم کە سوودبەخش بێت (بۆ دونیا و قیامەت) و (داوای) ڕۆزی حەڵاڵ و پاکت لێ دەکەم، وە کردەوەیەک کە وەرگیراو بێت».

## بَابُ إِذَا حَضَرَتِ الصَّلَاةُ وَوُضِعَ الْعَشَاءُ

### باسی کاتێک کاتی نوێژ دێت و نانی ئێوارەش دانراوە

١٧٨. عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﵁: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «إِذَا وُضِعَ الْعَشَاءُ، وَأُقِيمَتِ الصَّلَاةُ، فَابْدَءُوا بِالْعَشَاءِ».

ئەنەسی کوڕی مالیک ﵁ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «کاتێک نانی ئێوارە دانرا و قامەتیش بۆ نوێژ کرا، سەرەتا دەست بە نانخواردنەکە بکەن».

## بَابُ الْجَمَاعَةِ فِي اللَّيْلَةِ الْمَطِيرَةِ

### باسی نوێژی بەکۆمەڵ لە شەوی باراناویدا

١٧٩. عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﵄ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّه ﷺ يُنَادِي مُنَادِيه فِي اللَّيْلَةِ الْمَطِيرَةِ، أَوِ اللَّيْلَةِ الْبَارِدَةِ ذَاتِ الرِّيحِ: صَلُّوا فِي رِحَالِكُمْ.

ئیبن عومەر ﵄ دەڵێت: لە شەوی باراناویدا، یان لە شەوێکدا کە سارد بووایە و بای هاتبایە، ئەوە بانگبێژەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ بانگی ڕادەهێشت کە لە شوێن و ماڵەکانی خۆتاندا نوێژ بکەن.

## بَابُ الْمُرُورِ بَيْنَ يَدَيِ الْمُصَلِّي

### باسی ڕۆیشتن بەبەردەم نوێژخوێندا

١٨٠. عَنْ بُسْرِ بْنِ سَعِيدٍ ﵁ قَالَ: أَرْسَلُونِي إِلَى زَيْدِ بْنِ خَالِدٍ أَسْأَلُه عَنِ الْمُرُورِ، بَيْنَ يَدَيِ الْمُصَلِّي، فَأَخْبَرَنِي عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «لَأَنْ يَقُومَ أَرْبَعِينَ، خَيْرٌ لَه مِنْ أَنْ يَمُرَّ بَيْنَ يَدَيْه». قَالَ سُفْيَانُ: فَلَا أَدْرِي أَرْبَعِينَ سَنَةً، أَوْ شَهرًا، أَوْ صَبَاحًا، أَوْ سَاعَةً.

بوسری کوڕی سەعید ﵁ دەڵێت: ناردیانم بۆ لای زەیدی کوڕی خالید تاکوو پرسیاری حوکمی ڕۆیشتن بەبەردەم نوێژخوێنیدا لێ بکەم، ئەویش لە پێغەمبەرەوە ﷺ بۆی گێڕامەوە کە فەرموویەتی: «ئەگەر (کەسێک) چل ڕابوەستێت بۆی باشترە لەوەی بەپێش نوێژخوێندا تێبپەڕێت». سوفیان دەڵێت: جا نازانم (مەبەستی لە چلەکە) چل ساڵ بوو، یان چل مانگ بوو، یان چل ڕۆژ بوو، یان چل سەعات بوو.

## بَابُ النَّهْيِ أَنْ يُسْبَقَ الْإِمَامُ بِالرُّكُوعِ وَالسُّجُودِ

### باسی قەدەغەکردنی پێشکەوتنی پێشنوێژ (ئیمام) لە سوجدە و ڕکووعدا

١٨١. عَنْ أَبِي هرَيْرَةَ ﵁ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يُعَلِّمُنَا أَنْ: لَا نُبَادِرَ الْإِمَامَ بِالرُّكُوعِ، وَالسُّجُودِ، وَإِذَا كَبَّرَ فَكَبِّرُوا، وَإِذَا سَجَدَ فَاسْجُدُوا.

ئەبو هوڕەیرە ﵁ دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ فێری دەکردین کە لە سوجدە و ڕکووعدا پێش ئیمام نەکەوین، وە (دەیفەرموو) کە ئیمام (الله أکبر)ـی کرد ئێوەش بیکەن، ئەگەر ڕۆیشتە سوجدە ئێوەش سوجدە بەرن، (واتە: پێشی مەکەون هەمیشە لەدوای ئەو بن).

## بَابُ مَنْ يُسْتَحَبُّ أَنْ يَلِيَ الْإِمَامَ

### باسی ئەوانەی کە سوننەتە ڕاستەوخۆ لەدوای ئیمام بن

١٨٢. عَنْ أَبِي مَسْعُودٍ الْأَنْصَارِيِّ ﵁ قَالَ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَمْسَحُ مَنَاكِبَنَا فِي الصَّلَاةِ وَيَقُولُ: «لَا تَخْتَلِفُوا فَتَخْتَلِفَ قُلُوبُكُمْ، لِيَلِيَنِّي مِنْكُمْ أُولُو الْأَحْلَامِ وَالنُّهى، ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهمْ، ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهمْ».

ئەبو مەسعوودی ئەنصاڕی ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەستی بە شانماندا دەهێنا لە کاتی نوێژدا دەیفەرموو: «ڕیزەکە تێک مەدەن (ڕیزی نوێژی بەکۆمەڵ)، چونکە (تێکدانی ڕیزی نوێژ) دەبێتە هۆی جیاوازی و لێکترازانی دڵەکانتان، ئینجا با ئەوانەی پێگەیشتوو و ئەقڵ کامڵن لەدوای منەوە بن، ئەوجار ئەوانەی لەو تایبەتمەندییە لەوان نزیکن، ئەوجار ئەوانەی دوای ئەوان».

## بَابُ مَنْ أَحَقُّ بِالْإِمَامَةِ

### باسی ئەوەی کە کێ شاییستەترە ببێتە ئیمام (پێشنوێژ)

١٨٣. عَنْ أَبِي مَسْعُودٍ ﵁ يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللَّه ﷺ: «يَؤُمُّ الْقَوْمَ أَقْرَؤُهمْ لِكِتَابِ اللَّه، فَإِنْ كَانَتْ قِرَاءَتُهمْ سَوَاءً، فَلْيَؤُمَّهمْ أَقْدَمُهمْ هِجْرَةً، فَإِنْ كَانَتِ الْهِجْرَةُ سَوَاءً، فَلْيَؤُمَّهمْ أَكْبَرُهمْ سِنًّا، وَلَا يُؤُمُّ الرَّجُلُ فِي أَهلِه، وَلَا فِي سُلْطَانِه، وَلَا يُجْلَس عَلَى تَكْرِمَتِه فِي بَيْتِه إِلَّا بِإِذْنٍ، أَوْ بِإِذْنِه».

ئەبو مەسعوود ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «ئەو کەسە پێشنوێژیی بۆ خەڵکەکەی دەکات کە شارەزاترینە لە خوێندنەوەی قورئان (یان بە مانا و خوێندنی قورئان)، خۆ ئەگەر لە جوانخوێندنی قورئاندا وەکوو یەک بوون، ئەوە کامیان زووتر کۆچی کردووە (بۆ مەدینە) با ئەو پێش بکەوێت، جا ئەگەر لە کۆچکردنیشدا وەکوو یەک بوون، با کامیان گەورەترە ئەویان پێش بکەوێت، با هیچ پیاوێک پێشنوێژیی بۆ کەس نەکات کە خاوەن ماڵە، یان خاوەن دەسەڵاتی ئەم شوێنەیە، با لەو شوێنەی کە خاوەن ماڵ بۆ خۆی لێی دادەنیشێت و تایبەتە بە خۆی، لێی دانەنیشێت، مەگەر بە مۆڵەتی کەسەکە خۆی نەبێت».

## بَابُ مَا يَجِبُ عَلَى الْإِمَامِ

### باسی ئەو شتەی کە لەسەر ئیمام پێویستە

١٨٤. عَنْ أَبِي عَلِيٍّ الْهمْدَانِيِّ: أَنَّه خَرَجَ فِي سَفِينَةٍ فِيها عُقْبَةُ بْنِ عَامِرٍ الْجُهنِيُّ ﵁، فَحَانَتْ صَلَاةٌ مِنَ الصَّلَوَاتِ، فَأَمَرْنَاه أَنْ يَؤُمَّنَا، وَقُلْنَا لَه: إِنَّكَ أَحَقُّنَا بِذَلِكَ، أَنْتَ صَاحِبُ رَسُولِ اللَّه ﷺ، فَأَبَى، فَقَالَ: إِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّه ﷺ يَقُولُ: «مَنْ أَمَّ النَّاسَ فَأَصَابَ، فَالصَّلَاةُ لَه وَلَهمْ، وَمَنِ انْتَقَصَ مَنْ ذَلِكَ شَيْئًا، فَعَلَيْه، وَلَا عَلَيْهمْ».

ئەبو عەلی هەمدانی دەگێڕێتەوە: لەگەڵ کەشتییەک دەرچوو عوقبەی کوڕی عامیری جوهەنی ﵁ تێدا بوو، جا کاتی نوێژێک لە نوێژەکان هات و ئێمەش داوامان لێ کرد کە پێشنوێژیمان بۆ بکات، پێمان گوت: تۆ لە ئێمە شایستەتریت بۆ ئەو کارە، تۆ هاوەڵی پێغەمبەری خوای ﷺ، ئەویش نەیکرد و گوتی: من لە پێغەمبەری خوا ﷺ گوێم لێ بوو کە دەیفەرموو: «هەر کەسێک بەتەواوی پێشنوێژیی بۆ خەڵک بکات، ئەوە پاداشتەکەی بۆ خۆی و بۆ خەڵکەکەیە، هەر کەسێک بەناتەواوی بیکات، ئەوە گوناهەکەی لەسەر خۆیەتی و خەڵکەکە هیچیان لەسەر نییە».

## بَابُ مَنْ أَمَّ قَوْمًا فَلْيُخَفِّفْ

### باسی ئەوەی کە هەر کەسێك پێشنوێژیی بۆ خەڵک دەکات با (نوێژەکەی) سووك بکات

١٨٥. عَنْ أَبِي مَسْعُودٍ ﵁ قَالَ: أَتَى النَّبِيَّ ﷺ رَجُلٌ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنِّي لَأَتَأَخَّرُ فِي صَلَاةِ الْغَدَاةِ مِنْ أَجْلِ فُلَانٍ لِمَا يُطِيلُ بِنَا فِيها، قَالَ: فَمَا رَأَيْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَطُّ فِي مَوْعِظَةٍ أَشَدَّ غَضَبًا مِنْه يَوْمَئِذٍ، فَقَالَ: «يَا أَيُّها النَّاسُ إِنَّ مِنْكُمْ مُنَفِّرِينَ، فَأَيُّكُمْ مَا صَلَّى بِالنَّاسِ، فَلْيُجَوِّزْ؛ فَإِنَّ فِيهِمُ الضَّعِيفَ، وَالْكَبِيرَ، وَذَا الْحَاجَةِ».

ئەبو مەسعوود ﵁ دەڵێت: پیاوێک هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ، گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا، من لە نوێژی بەیانی خۆم دوا دەخەم لەبەر فلانە کەس، چونکە نوێژەکەمان زۆر لەسەر درێژ دەکاتەوە، (ئەبو مەسعوود) گوتی: هەرگیز پێغەمبەری خوام ﷺ نەبینیوە بەم شێوەیە لە کاتی ئامۆژگاریکردندا توڕە بێت وەک ئەو ڕۆژە، ئینجا فەرمووی: «ئەی خەڵکینە! بەڕاستی ئێوە هەندێکتان تێدایە کە خەڵکی دوور دەخەنەوە (لە ئایین)، با هەر کەسێکتان کە پێشنوێژیی بۆ خەڵک دەکات نوێژەکەی کورت بێت، چونکە بەڕاستی خەڵکی کەمتوانا و بەتەمەن و خاوەن کارتان لەنێودایە».

١٨٦. عَنْ عُثْمَانُ بْنُ أَبِي الْعَاصِ ﵁: أَنَّ آخِرَ مَا قَالَ لِي رَسُولُ اللهِ ﷺ: «إِذَا أَمَمْتَ قَوْمًا فَأَخِفَّ بِهِمْ».

عوسمانی کوڕی ئەبو عاص ﵁ دەگێڕێتەوە: کۆتا شتێک کە پێغەمبەری خوا ﷺ بە منی فەرموو: «ئەگەر پێشنوێژیت بۆ خەڵکانێک کرد ئەوە لەسەریان سووک و ئاسان بکە (درێژی مەکەوە)».

## بَابُ الْإِمَامِ يُخَفِّفُ الصَّلَاةَ إِذَا حَدَثَ أَمْرٌ

### باسی هەرکات شتێک ڕووی دا ئیمام نوێژەکەی سووك و کورت دەکاتەوە

١٨٧. عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه ﷺ: «إِنِّي لَأَدْخُلُ فِي الصَّلَاةِ، وَإِنِّي أُرِيدُ إِطَالَتَها، فَأَسْمَعُ بُكَاءَ الصَّبِيِّ، فَأَتَجَوَّزُ فِي صَلَاتِي، مِمَّا أَعْلَمُ لِوَجْدِ أُمِّه بِبُكَائِه».

ئەنەسی کوڕی مالیک ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «لە ڕاستیدا کاتێك دەچمە نێو نوێژ و دەمەوێت نوێژەکە درێژ بکەمەوە، لەو کاتەدا گریانی منداڵ دەبیستم، بۆیە نوێژەکە کورت دەکەمەوە، چونکە دەزانم کە دایک چەند ناڕەحەت دەبێت کاتێك گوێی لە دەنگی گریانی منداڵەکەیەتی».

## بَابُ إِقَامَةِ الصُّفُوفِ

### باسی ڕێکخستنی ڕیزی نوێژخوێنان

١٨٨. عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه ﷺ: «سَوُّوا صُفُوفَكُمْ، فَإِنَّ تَسْوِيَةَ الصُّفُوفِ مِنْ تَمَامِ الصَّلَاةِ».

ئەنەسی کوڕی مالیک ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «ڕیزەکانتان ڕێک بخەن، چونکە بەڕاستی ڕێکوپێکی ڕیزەکان لە تەواوی نوێژەکەیە».

١٨٩. عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّه ﷺ: «إِنَّ اللَّه وَمَلَائِكَتَه يُصَلُّونَ عَلَى الَّذِينَ يَصِلُونَ الصُّفُوفَ، وَمَنْ سَدَّ فُرْجَةً رَفَعَه اللَّه بِها دَرَجَةً».

عائیشە ﵂ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «بەڕاستی خوا و فریشتەکان سەڵاوات دەنێرن بۆ ئەوانەی کە ڕیزەکانیان بەیەک دەگەیەنن و ڕێکیان دەخەن، هەر کەسێک کەلێنێکی ڕیز پڕ بکاتەوە، خوا پلەیەک بەرزی دەکاتەوە».

تێبینی:

سەڵاوات: ئەگەر لەلایەن خواوە بێت، بە مانای ڕەحمەت و بەزەییە، ئەگەر لەلای فریشتەکانەوە بێت، بە مانای ئەوەیە دوعا دەکەن بۆ ئەو کەسە.

## بَابُ صُفُوفِ النِّسَاءِ

## باسی ڕیزەکانی ئافرەتان لە نوێژدا

١٩٠. عَنْ أَبِي هرَيْرَةَ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: «خَيْرُ صُفُوفِ النِّسَاءِ آخِرُهَا، وَشَرُّهَا أَوَّلُهَا، وَخَيْرُ صُفُوفِ الرِّجَالِ أَوَّلُهَا، وَشَرُّهَا آخِرُهَا».

ئەبو هورەیرە ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «باشترین ڕیزەکانی ئافرەتان ڕیزی کۆتاییە، خراپترینیان ڕیزی یەکەمە، باشترین ڕیزەکانی پیاوان ڕیزی یەکەمە، خراپترینیان ڕیزی کۆتاییە».

تێبینی:

چونکە لەدوای ڕیزی کۆتایی پیاوان، ڕیزی یەکەمی ئافرەتان دەست پێ دەکات، ئەوکات زۆر لێک نزیک دەبنەوە، بۆی هەیە ببێتە هۆی ئەوەی نوێژەکە نوێژێکی پڕ خشوع و تەواو و کامڵ نەبێت، ئەوە لە کاتێکدایە کە ئافرەتان و پیاوان بەیەکەوە لە یەک شوێن و لە یەک کاتدا نوێژی بەکۆمەڵ بکەن، بەبێ بوونی پەردەیەک لەنێوانیاندا.

## بَابُ مَا جَاءَ فِي الدُّعَاءِ فِي الِاسْتِسْقَاءِ

### باسی نوێژی داواکردنی بارانبارین

١٩١. عَنْ شُرَحْبِيلَ بْنِ السِّمْطِ رضي الله عنه: أَنَّه قَالَ لِكَعْبٍ رضي الله عنه: يَا كَعْبُ بْنَ مُرَّةَ حَدِّثْنَا عَنْ رَسُولِ اللَّه ﷺ وَاحْذَرْ، قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ فَقَالَ: يَا رَسُولَ الله اسْتَسْقِ اللَّه فَرَفَعَ رَسُولُ الله ﷺ يَدَيْه فَقَالَ: «اللَّهمَّ اسْقِنَا غَيْثًا مَرِيئًا مَرِيعًا طَبَقًا عَاجِلاً غَيْرَ رَائِثٍ، نَافِعًا غَيْرَ ضَارٍّ»، قَالَ: فَمَا جَمَّعُوا حَتَّى أُحْيُوا، قَالَ: فَأَتَوْه فَشَكَوْا إِلَيْه الْمَطَرَ، فَقَالُوا يَا رَسُولَ الله: تَهدَّمَتِ الْبُيُوتُ، فَقَالَ: «اللَّهمَّ حَوَالَيْنَا وَلَا عَلَيْنَا»، قَالَ: فَجَعَلَ السَّحَابُ يَنْقَطِعُ يَمِينًا وَشِمَالاً.

شورەحبیلی کوڕی سیمت رضي الله عنه دەگێڕێتەوە: بە کەعبی رضي الله عنه گوتووە: ئەی کەعبی کوڕی موڕڕە، لە پێغەمبەری خواوە ﷺ (فەرموودەمان) بۆ بگێڕەوە بەئاگاییەوە، گوتی: پیاوێک هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا داوای بارانبارین لە خوا بکە، جا پێغەمبەری خوا ﷺ دەستەکانی بەرز کردەوە، فەرمووی: «ئەی خوایە بارانێکمان بۆ ببارێنە کە کۆتاییەکەی خێر بێت و زۆر بێت و لەسەرخۆ بێت لە زووترین کاتدا و دوا نەکەوێت، سوودبەخش بێت و زیانبەخش نەبێت»، گوتی: نوێژی جومعەکەیان تەواو نەکردبوو خوا وەڵامی دوعاکەی دانەوە (بارانبارین دەستی پێ کرد)، گوتی: خەڵکی هاتن و سکاڵایان کرد لە دەستی زۆر بارانبارین و گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا خانووەکان لەناو دەچن، ئینجا (پێغەمبەری خوا ﷺ) فەرمووی: «خوایە لە دەوروبەرمان بیبارێنە بەسەرماندا مەیبارێنە»، گوتی: ئینجا هەورەکان بەلای ڕاست و چەپدا کەرت بوون (بڵاو بوونەوە).


## بَابُ مَا جَاءَ فِي صَلَاةِ الْعِيدَيْنِ

### باسی ئەوەی دەربارەی نوێژی دوو جەژنەکە هاتووە

١٩٢. عَنْ عَطَاءٍ رضي الله عنه قَالَ: سَمِعْتُ ابْنَ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما يَقُولُ: أَشْهدُ عَلَى رَسُولِ الله ﷺ أَنَّه

صَلَّى قَبْلَ الْخُطْبَةِ، ثُمَّ خَطَبَ فَرَأَى أَنَّه لَمْ يُسْمِعِ النِّسَاءَ فَأَتَاهنَّ فَذَكَّرَهنَّ وَوَعَظَهنَّ وَأَمَرَهنَّ بِالصَّدَقَةِ، وَبِلَالٌ قَائِلٌ بِيَدَيْه هكَذَا، فَجَعَلَتِ الْمَرْأَةُ تُلْقِي الْخُرْصَ وَالْخَاتَمَ وَالشَّيْءَ.

عەتاء ﷺ دەڵێت: گوێم لە ئیبن عەبباس ﷺ بوو دەیگوت: شایەتی دەدەم کە پێغەمبەری خوا ﷺ پێش وتار نوێژی کرد، پاشان وتاری دا، ئینجا بینیی کە ئافرەتان گوێبیستی نەدەبوون، بۆیە هات بۆ لایان یادی خستنەوە و ئامۆژگاری کردن و فەرمانی پێ کردن کە خێر و چاکە بکەن، بیلالیش پۆشاکەکەی بە دەستی ڕاخستبوو، ئینجا ئافرەتەکان گوارە و ئەنگوستیلە و شتی دیکەی لە خشڵ و زێڕ و زیویان دەخستە نێو پۆشاکەکەی بیلالەوە.

١٩٣. عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ صَلَّى يَوْمَ الْعِيدِ بِغَيْرِ أَذَانٍ وَلَا إِقَامَةٍ.

ئیبن عەبباس ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ نوێژی جەژنی کرد بەبێ بانگدان و قامەتکردن.

## بَابُ مَا جَاءَ فِي كَمْ يُكَبِّرُ الْإِمَامُ فِي صَلَاةِ الْعِيدَيْنِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی پێشنوێژ چەند (الله أکبر) دەکات لە نوێژی دوو جەژنەکان

١٩٤. عَنْ عَائِشَةَ ﷺ: أَنَّ رَسُولَ اللَّه ﷺ كَبَّرَ فِي الْفِطْرِ وَالْأَضْحَى سَبْعًا وَخَمْسًا، سِوَى تَكْبِيرَتَيِ الرُّكُوعِ.

عائیشە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ لە نوێژی جەژنی ڕەمەزان و جەژنی قورباندا حەوت و پێنج (الله أکبر)ـی دەکرد، جگە لە دوو (الله أکبر)ـەکەی چوونە ڕکووع.

## بَابُ مَا جَاءَ فِي خُرُوجِ النِّسَاءِ فِي الْعِيدَيْنِ

### باسی دەرچوونی ئافرەتان بۆ نوێژی دوو جەژنەکان

١٩٥. عَنْ أُمِّ عَطِيَّةَ رضي الله عنها قَالَتْ: أَمَرَنَا رَسُولُ اللَّه ﷺ أَنْ نُخْرِجَهنَّ فِي يَوْمِ الْفِطْرِ وَالنَّحْرِ، قَالَ: قَالَتْ أُمُّ عَطِيَّةَ: فَقُلْنَا: أَرَأَيْتَ إِحْدَاهنَّ لَا يَكُونُ لَها جِلْبَابٌ؟ قَالَ: «فَلْتُلْبِسْها أُخْتُها مِنْ جِلْبَابِها».

ئوم عەتییە رضي الله عنها دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێ کردین کە ئافرەتان بهێنین لە ڕۆژی جەژنی ڕەمەزان و قوربان (بۆ ئامادەبوون بۆ نوێژی جەژن)، ڕاوی دەڵێت: ئوم عەتییە گوتی: جا گوتمان: ئەی ئەگەر یەکێک عەبایەکی نەبوو (کە خۆی پێ دابپۆشێت)؟ فەرمووی: «با خوشکەکەی بە عەبایەکەی خۆی دایبپۆشێت (پێی بدات)».

## بَابُ مَا جَاءَ فِيمَا إِذَا اجْتَمَعَ الْعِيدَانِ فِي يَوْمٍ

### باسی ئەوەی کە ئەگەر یەکێک لە جەژنەکان کەوتە ڕۆژی هەینی

١٩٦. عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما عَنْ رَسُولِ اللَّه ﷺ أَنَّه قَالَ: «اجْتَمَعَ عِيدَانِ فِي يَوْمِكُمْ هذَا، فَمَنْ شَاءَ أَجْزَأَه مِنَ الْجُمُعَةِ، وَإِنَّا مُجَمِّعُونَ إِنْ شَاءَ اللَّه».

ئیبن عەبباس رضي الله عنهما دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «لەم ڕۆژەدا کە تێیداین دوو جەژن کۆبوونەتەوە، جا هەر کەسێک دەیکات ئەوە بۆی بەبری نوێژی هەینی دەکەوێت، ئێمە ئەگەر خوا بیەوێت نوێژی هەینی دەکەین».

## بَابُ مَا جَاءَ فِي قِيَامِ اللَّيْلِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی شەونوێژ

١٩٧. عَنْ أَبِي هرَيْرَةَ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه ﷺ: «يَعْقِدُ الشَّيْطَانُ عَلَى قَافِيَةِ رَأْسِ

أَحَدِكُمْ بِاللَّيْلِ بِحَبْلٍ فِيه ثَلَاثُ عُقَدٍ، فَإِنِ اسْتَيْقَظ فَذَكَرَ اللَّه انْحَلَّتْ عُقْدَةٌ، فَإِذَا قَامَ فَتَوَضَّأَ، انْحَلَّتْ عُقْدَةٌ، فَإِذَا قَامَ إِلَى الصَّلَاةِ انْحَلَّتْ عُقَدُه كُلُّها، فَيُصْبِحُ نَشِيطًا طَيِّبَ النَّفْسِ قَدْ أَصَابَ خَيْرًا، وَإِنْ لَمْ يَفْعَلْ أَصْبَحَ كَسِلاً خَبِيثَ النَّفْسِ لَمْ يُصِبْ خَيْراً».

ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «شەیتان لە بەشی دواوەی سەری هەر یەکێکتان لە شەودا بە پەتێک سێ گرێ لێ دەدات (کاتێ دەخەوێت)، جا ئەگەر (هەڵسا لە خەو) یادی خوای کرد، گرێیەک دەبێتەوە، ئەگەر هەڵسا و دەستنوێژی گرت گرێیەکی دیکە دەبێتەوە، ئینجا هەرکات هەڵسا نوێژی کرد، ئەوە هەموو گرێیەکان دەکرێنەوە، ئەوکات بەچوست و چالاکی و دڵخۆشی بەیانی دەکاتەوە و خێر و چاکەی دێتە ڕێ، خۆ ئەگەر ئەوەی نەکرد ئەوە بەتەمبەڵی و دڵناخۆشی بەیانی دەکاتەوە و چاکە نایەتە ڕێی».

## بَابُ مَا جَاءَ فِيمَنْ أَيْقَظَ أَهلَه مِنَ اللَّيْلِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی ئەوەی ماڵەوە هەڵدەستێنێت لە شەودا

١٩٨. عَنْ أَبِي سَعِيدٍ، وَأَبِي هرَيْرَةَ ﷺ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «إِذَا اسْتَيْقَظَ الرَّجُلُ مِنَ اللَّيْلِ وَأَيْقَظَ امْرَأَتَه فَصَلَّيَا رَكْعَتَيْنِ كُتِبَا مِنَ الذَّاكِرِينَ اللَّه كَثِيرًا وَالذَّاكِرَاتِ».

ئەبو سەعید و ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕنەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: «هەر کاتێک پیاو لە شەودا هەڵسایەوە و خێزانەکەشی هەڵساند و دوو ڕکات نوێژیان کرد، ئەوە لەوانە دەنووسرێن کە زۆر یادی خوا دەکەن لە ژنان و لە پیاوان».

## بَابٌ فِي حُسْنِ الصَّوْتِ بِالْقُرْآنِ

### باسێك دەربارەی دەنگخۆشی و جوانخوێندنی قورئان

١٩٩. عَنْ عَائِشَةَ ﷺ زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ، قَالَتْ: أَبْطَأْتُ عَلَى عَهدِ رَسُولِ اللَّه ﷺ لَيْلَةً

بَعْدَ الْعِشَاءِ، ثُمَّ جِئْتُ فَقَالَ: «أَيْنَ كُنْتِ؟»، قُلْتُ: كُنْتُ أَسْتَمِعُ قِرَاءَةَ رَجُلٍ مِنْ أَصْحَابِكَ لَمْ أَسْمَعْ مِثْلَ قِرَاءَتِه وَصَوْتِه مِنْ أَحَدٍ، قَالَتْ: فَقَامَ وَقُمْتُ مَعَه حَتَّى اسْتَمَعَ لَه، ثُمَّ الْتَفَتَ إِلَيَّ فَقَالَ: «هذَا سَالِمٌ مَوْلَى أَبِي حُذَيْفَةَ، الْحَمْدُ لِلّه الَّذِي جَعَلَ فِي أُمَّتِي مِثْلَ هذَا».

عائیشە ﵂ خێزانی پێغەمبەر ﷺ دەڵێت: شەوێک دوای نوێژی خەوتنان خۆم دوا خست لە سەردەمی پێغەمبەری خوا ﷺ، پاشان کە هاتمەوە فەرمووی: «لەکوێ بوویت؟»، گوتم: گوێم لە قورئانخوێندنی یەکێک لە هاوەڵەکانت گرتبوو، کە گوێم لەو شێوە خوێندنەوە و دەنگە نەبووە لە هیچ کەسێک، گوتی: ئەویش هەڵسا و منیش لەگەڵیدا هەڵسام تاکوو گوێی لێ بگرێت، پاشان ئاوڕی لە من دایەوە، فەرمووی: «ئەوە سالیمە و بەندەی ئەبو حوزەیفەیە، سوپاس و ستاییش بۆ خوا کە کەسانی ئاوای داناوە لەنێو ئوممەتەکەمدا».

٢٠٠. عَنْ جَابِرٍ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللّه ﷺ: «إِنَّ مِنْ أَحْسَنِ النَّاسِ صَوْتًا بِالْقُرْآنِ، الَّذِي إِذَا سَمِعْتُمُوه يَقْرَأُ، حَسِبْتُمُوه يَخْشَى اللّه».

جابیر ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «باشترین و جوانترین دەنگ بۆ قورئانخوێندن (دەنگی) ئەو کەسەیە کە گوێتان لە خوێندنەکەی بوو هەست بکەن کە لە خوا دەترسێت (تەنها مەبەستی ئەوەیە قورئانخوێندنەکە بۆ ڕەزامەندیی خوا بێت)».

## بَابُ مَا جَاءَ فِيمَنْ نَامَ عَنْ حِزْبِه مِنَ اللَّيْلِ

### باسی ئەو کەسەی کە لە بەشە قورئانخوێندنی شەوەکەی خەوی لێدەکەوێت

٢٠١. عَنْ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ ﵁ يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللّه ﷺ: «مَنْ نَامَ عَنْ حِزْبِه، أَوْ عَنْ شَيْءٍ مِنْه، فَقَرَأَه فِيمَا بَيْنَ صَلَاةِ الْفَجْرِ وَصَلَاةِ الظُّهرِ، كُتِبَ لَه كَأَنَّمَا قَرَأَه مِنَ اللَّيْلِ».

عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «هەر کەسێك خەوی لێبکەوێت لە بەشە قوڕئانخوێندنی شەوەکەیدا، یان کەمێک لە بەشی شەوەکەی، دواتر لە نێوان نوێژی بەیانی و نیوەڕۆدا (ئەو بەشەی) خوێند، وەک ئەوەی لە شەودا خوێندبێتی بۆی هەژمار دەکرێت».

٢٠٢. عَنْ أَبِي الدَّرْدَاءِ ﷺ يَبْلُغُ بِه النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «مَنْ أَتَى فِرَاشَه، وَهوَ يَنْوِي أَنْ يَقُومَ فَيُصَلِّيَ مِنَ اللَّيْلِ، فَغَلَبَتْه عَيْنُه حَتَّى يُصْبِحَ، كُتِبَ لَه مَا نَوَى، وَكَانَ نَوْمُه صَدَقَةً عَلَيْه مِنْ رَبِّه».

ئەبو دەرداء ﷺ دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ پێی گەیشتوە، فەرموویەتی: «هەر کەسێک هاتە سەر جێگای خەوەکەی و نییەتی ئەوەی هەبوو کە شەو هەڵسێتەوە و شەونوێژ بکات، بەڵام خەو بەسەر چاوەکانیدا زاڵ بوو تاکوو بەیانی، ئەوە ئەوەی نییەتی لێ هێناوە بۆی دەنووسرێت، خەوەکەشی دەبێتە بەخششێکی خوا کە بەسەریدا ڕژاندووە».

## بَابُ فِي كَمْ يُسْتَحَبُّ يُخْتَمُ الْقُرْآنُ

### باسێك دەربارەی ئەوەی سوننەتە لە چ ماوەیەك قوڕئان خەتم بکرێت

٢٠٣. عَنْ عَبْدِ اللَّه بْنِ عَمْرٍو ﷺ: أَنَّ رَسُولَ اللَّه ﷺ قَالَ: «لَمْ يَفْقَه مَنْ قَرَأَ الْقُرْآنَ فِي أَقَلَّ مِنْ ثَلَاثٍ».

عەبدوڵڵای کوڕی عەمر ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «هەر کەسێک لە کەمتر لە سێ ڕۆژدا قوڕئان تەواو بکات، ئەوە لە مانا و مەبەستی تێناگات».

٢٠٤. عَنْ عَائِشَةَ ﷺ قَالَتْ: لَا أَعْلَمُ نَبِيَّ اللَّه ﷺ قَرَأَ الْقُرْآنَ كُلَّه حَتَّى الصَّبَاحِ.

عائیشە ﵂ دەڵێت: نەمزانیوە پێغەمبەری خوا ﷺ قورئانی هەموو خوێندبێت تاکوو بەیانی.

## بَابُ مَا جَاءَ فِي الْقِرَاءَةِ فِي صَلَاةِ اللَّيْلِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی خوێندنی قورئان لە شەونوێژدا

٢٠٥. عَنْ أَبِي ذَرٍّ ﵁ يَقُولُ: قَامَ النَّبِيُّ ﷺ بِآيَةٍ حَتَّى أَصْبَحَ يُرَدِّدُها وَالْآيَةُ: {إِنْ تُعَذِّبْهِمْ فَإِنَّهِمْ عِبَادُكَ وَإِنْ تَغْفِرْ لَهِمْ فَإِنَّكَ أَنْتَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ} المائدة: ١١٨.

ئەو زەر ﵁ دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ بە ئایەتێک شەونوێژی کرد تاکوو بەیانی دووبارەی دەکردەوە، ئەویش ئەو ئایەتە بوو: {إِنْ تُعَذِّبْهِمْ فَإِنَّهِمْ عِبَادُكَ وَإِنْ تَغْفِرْ لَهِمْ فَإِنَّكَ أَنْتَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ}، واتە: ئەگەر سزایان بدەیت، ئەوە بێگومان بەندەی خۆتن و ئەگەر لێشیان خۆش ببیت، ئەوە بێگومان تەنها خۆتی بەدەسەڵات و کاردروست.

٢٠٦. عَنْ حُذَيْفَةَ ﵁: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ صَلَّى، فَكَانَ إِذَا مَرَّ بِآيَةِ رَحْمَةٍ سَأَلَ، وَإِذَا مَرَّ بِآيَةِ عَذَابٍ اسْتَجَارَ، وَإِذَا مَرَّ بِآيَةٍ فِيها تَنْزِيه لِلَّه سَبَّحَ.

حوزەیفە ﵁ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ نوێژی کرد، جا کاتێک بە ئایەتێکدا تێدەپەڕیی کە باسی ڕەحمەت و بەزەیی دەکرد داوای (ڕەحمەت و بەزەیی خوای) دەکرد، کاتێکیش بە ئایەتی سزادا تێدەپەڕیی پەنای دەگرت بە خوا (لە سزای خوا)، وە کاتێک بە ئایەتێکدا تێدەپەڕیی کە باسی پاکی و بێگەردی خوای دەکرد (سبحان الله)ـی دەکرد (واتە: خوای بە پاک و بێگەرد ناو دەبرد).

٢٠٧. عَنْ غُضَيْفِ بْنِ الْحَارِثِ قَالَ: أَتَيْتُ عَائِشَةَ ﵂ فَقُلْتُ أَكَانَ رَسُولُ اللَّه ﷺ

يَجْهرُ بِالْقُرْآنِ أَوْ يُخَافِتُ بِه قَالَتْ: رُبَّمَا جَهرَ وَرُبَّمَا خَافَتَ، قُلْتُ: اللّه أَكْبَرُ الْحَمْدُ لِلَّه الَّذِي جَعَلَ فِي هذَا الْأَمْرِ سَعَةً.

غوزەیفی کوڕی حاریس دەڵێت: هاتم بۆ لای عائیشە ﵂ گوتم: ئایا پێغەمبەری خوا ﷺ قوڕئانی بە دەنگی بەرز دەخوێند یان بە دەنگی نزم؟ گوتی: هەندێك جار بە دەنگی بەرز و هەندێك جار بە دەنگی نزم، گوتم: (الله أكبر)، سوپاس و ستاییش بۆ ئەو خوایەی کە فراوانیی خستووەتە نێو ئەو دینەوە.

## بَابُ مَا جَاءَ فِي الدُّعَاءِ إِذَا قَامَ الرَّجُلُ مِنَ اللَّيْلِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی دوعای کەسێک کە بۆ شەونوێژ هەڵساوەتەوە

٢٠٨. عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللّه ﷺ إِذَا تَهجَّدَ مِنَ اللَّيْلِ قَالَ: «اللَّهمَّ لَكَ الْحَمْدُ، أَنْتَ نُورُ السَّمَوَاتِ وَالْأَرْضِ وَمَنْ فِيهِنَّ، وَلَكَ الْحَمْدُ، أَنْتَ قَيَّامُ السَّمَوَاتِ وَالْأَرْضِ وَمَنْ فِيهِنَّ، وَلَكَ الْحَمْدُ، أَنْتَ مَالِكُ السَّمَوَاتِ وَالْأَرْضِ وَمَنْ فِيهِنَّ، وَلَكَ الْحَمْدُ، أَنْتَ الْحَقُّ، وَوَعْدُكَ حَقٌّ، وَلِقَاؤُكَ حَقٌّ، وَقَوْلُكَ حَقٌّ، وَالْجَنَّةُ حَقٌّ، وَالنَّارُ حَقٌّ، وَالسَّاعَةُ حَقٌّ، وَالنَّبِيُّونَ حَقٌّ، وَمُحَمَّدٌ حَقٌّ، اللَّهمَّ لَكَ أَسْلَمْتُ، وَبِكَ آمَنْتُ، وَعَلَيْكَ تَوَكَّلْتُ، وَإِلَيْكَ أَنَبْتُ، وَبِكَ خَاصَمْتُ، وَإِلَيْكَ حَاكَمْتُ، فَاغْفِرْ لِي مَا قَدَّمْتُ وَمَا أَخَّرْتُ، وَمَا أَسْرَرْتُ وَمَا أَعْلَنْتُ، أَنْتَ الْمُقَدِّمُ وَأَنْتَ الْمُؤَخِّرُ، لَا إِلَه إِلَّا أَنْتَ، وَلَا إِلَه غَيْرُكَ، وَلَا حَوْلَ وَلَا قُوَّةَ إِلَّا بِكَ».

ئیبن عەبباس ﵄ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێک شەونوێژی دەکرد، دەیفەرموو: «خوایە سوپاس و ستاییش بۆ تۆ، تۆ ڕووناکیی ئاسمانەکان و زەوی و هەرچی وا لەنێویاندایە، وە سوپاس و ستاییش هەر بۆ تۆیە، تۆ هەڵسوڕێنەری ئاسمانەکان و زەوی و هەرچی وا لەنێویاندایە، وە سوپاس و ستاییش هەر بۆ تۆیە، تۆ خاوەنی ئاسمانەکان و زەوی و هەرچی وا لەنێویاندایە، سوپاس و ستاییش بۆ تۆیە، تۆ

هەقی، بەڵێنەکانت هەقن، پێگەیشتنت هەقە، فەرمایشتەکەت هەقە، بەهەشت هەقە، دۆزەخ هەقە، ڕۆژی دوایی هەقە، پێغەمبەران هەقن، وە موحەممەد هەقە، خوایە ملکەچی فەرمانەکانی تۆم و خۆم سپاردووە بە تۆ، بڕوام هێناوە بە تۆ، پشتم هەر بە تۆ بەستووە، هەر بۆ لای تۆ دەگەڕێمەوە، بە پشتیوانیی تۆ بەرەنگار (ی دوژمنان) دەبمەوە، حوکمی کێشەکان تەنها بۆ لای تۆ دێنمەوە، سا لەو گوناهانەم خۆش بە کە پێشم خستووە و لەو گوناهانەشم کە دوام خستووە، ئەوەشی کە بەنهێنی کردوومە، ئەوەشی کە بەئاشکرا کردوومە، پێشخستن و دواخستن تەنها بە دەستی تۆیە، هیچ پەرستراوێکی بەهەق نییە تەنها تۆ نەبێت، وە هیچ پەرستراوێکی بەهەق نییە جگە لە تۆ، وە هیچ ئاڵوگۆڕ و وەرگێڕانێک و هێزێک نییە تەنها بە پشتیوانی تۆ نەبێت».

## بَابُ مَا جَاءَ فِيمَا يُرْجَى أَنْ يَكْفِيَ مِنْ قِيَامِ اللَّيْلِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی (کارێك) ئومێد دەکرێت بەبری شەونوێژ بکەوێت



٢٠٩. عَنْ أَبِي مَسْعُودٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: «الْآيَتَانِ مِنْ آخِرِ سُورَةِ الْبَقَرَةِ مَنْ قَرَأَهمَا فِي لَيْلَةٍ كَفَتَاه». قَالَ حَفْصٌ فِي حَدِيثِه: قَالَ عَبْدُ الرَّحْمَنِ فَلَقِيتُ أَبَا مَسْعُودٍ وَهوَ يَطُوفُ فَحَدَّثَنِي بِه.

ئەبو مەسعوود رَضِيَ اللهُ عَنْهُ دەڵێت: پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فەرموویەتی: «دوو ئایەت هەیە لە کۆتایی سووڕەتی بەقەڕە هەر کەس بیانخوێنێت لە شەوێکدا بەسیەتی». حەفص لە ڕیوایەتەکەیدا دەڵێت: عەبدوڕڕەحمان گوتی: بە ئەبو مەسعوود رَضِيَ اللهُ عَنْهُ گەیشتم لە کاتێکدا کە تەوافی دەکرد، ئەویش ئەو فەرموودەیەی بۆ گێڕامەوە.

## بَابُ مَا جَاءَ فِي الْمُصَلِّي إِذَا نَعَسَ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی نوێژخوێن کاتێك خەوی دێت

٢١٠. عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا قَالَتْ: قَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: «إِذَا نَعَسَ أَحَدُكُمْ، فَلْيَرْقُدْ حَتَّى يَذْهبَ

عَنْه النَّوْمُ، فَإِنَّه لَا يَدْرِي، إِذَا صَلَّى وَهوَ نَاعِسٌ، لَعَلَّه يَذْهبُ فَيَسْتَغْفِرُ، فَيَسُبُّ نَفْسَه».

عائیشه ﵂ دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: «هەر یەکێک لە ئێوە خەوی هات، با پاڵ بداتەوە و بخەوێت تاکوو خەوەکەی دەڕوات، چونکە ئەو کەسە کاتێک نوێژ دەکات و خەوی دێت نازانێت، بۆی هەیە بیەوێت داوای لێخۆشبوون لە خوا بکات، بەڵام لەجیاتی ئەوە جنێو بە خۆی بدات».

٢١١. عَنْ أَبِي هرَيْرَةَ ﵁: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «إِذَا قَامَ أَحَدُكُمْ مِنَ اللَّيْلِ، فَاسْتَعْجَمَ الْقُرْآنُ عَلَى لِسَانِه، فَلَمْ يَدْرِ مَا يَقُولُ، اضْطَجَعَ».

ئەبو هورەیرە ﵁ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: «ئەگەر یەکێکتان لە شەودا هەڵسایەوە و زمانی تەتەڵەی دەکرد لە قورئانخوێندندا و هەڵەی دەکرد، نەیدەزانی چی دەڵێت، با ڕاکشێت (تاکوو خەو بەریدەدات)».

## بَابُ مَا جَاءَ فِي التَّطَوُّعِ فِي الْبَيْتِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی نوێژی سوننەت لەماڵەوە

٢١٢. عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﵄ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه ﷺ: «لَا تَتَّخِذُوا بُيُوتَكُمْ قُبُورًا».

ئیبن عومەر ﵄ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «ماڵەکانتان مەکەنە گۆڕستان (واتە: نوێژیان تێدا بکەن با ڕووناک بنەوە)».

## بَابُ مَا جَاءَ فِي صَلَاةِ الضُّحَى

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی نوێژی چێشتەنگاو

٢١٣. عَنْ مُعَاذَةَ الْعَدَوِيَّةِ ﵂ قَالَتْ: سَأَلْتُ عَائِشَةَ ﵂: أَكَانَ النَّبِيُّ ﷺ يُصَلِّي

الضُّحَى؟ قَالَتْ: نَعَمْ، أَرْبَعًا، وَيَزِيدُ مَا شَاءَ اللَّه.

موعازەتەی عەدەوی ﵂ دەڵێت: پرسیارم کرد لە عائیشە ﵂: ئایا پێغەمبەر ﷺ نوێژی چێشتەنگاوی دەکرد؟ گوتی: بەڵێ، چوار ڕکات، زیاتریش ئەوەندەی خوا ویستی لەسەر با.

## بَابُ مَا جَاءَ فِي أَنَّ الصَّلَاةَ كَفَّارَةٌ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی ئەوەی کە نوێژ پاککەرەوەیە

٢١٤. عَنْ عُثْمَانٍ ﵁ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُول اللَّه ﷺ يَقُولُ: «أَرَأَيْتَ لَوْ كَانَ بِفِنَاءِ أَحَدِكُمْ نَهرٌ يَجْرِي يَغْتَسِلُ فِيه كُلَّ يَوْمٍ خَمْسَ مَرَّاتٍ، مَا كَانَ يَبْقَى مِنْ دَرَنِه؟»، قَالَ: لَا شَيْءَ، قَالَ: «فَإِنَّ الصَّلَاةَ تُذْهِبُ الذُّنُوبَ كَمَا يُذْهِبُ الْمَاءُ الدَّرَنَ».

عوسمان ﵁ دەڵێ: لە پێغەمبەری خواوە ﷺ بیستوومە دەیفەرموو: «ئایا ئەگەر لەبەر ماڵی هەر یەکێکتان ڕووبارێک بڕوات و ڕۆژێ پێنج جار خۆی لێ بشوات، هیچ چڵکی پێوە دەمێنێت؟»، گوتی: هیچ شتێک، فەرمووی: «بەڕاستی نوێژ تاوانەکان ڕادەماڵێت وەکوو چۆن ئاو چڵک و چەپەڵی ڕادەماڵێت».

## بَابُ مَا جَاءَ فِي فَرْضِ الصَّلَوَاتِ الْخَمْسِ وَالْمُحَافَظَةِ عَلَيْها

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی پێنج نوێژە فەرزەکە و پارێزگاریلێکردنیان

٢١٥. عَنْ عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ ﵁ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُول اللَّه ﷺ يَقُولُ: «خَمْسُ صَلَوَاتٍ افْتَرَضَهنَّ اللَّه عَلَى عِبَادِه، فَمَنْ جَاءَ بِهنَّ لَمْ يَنْتَقِصْ مِنْهنَّ شَيْئًا، اسْتِخْفَافًا بِحَقِّهنَّ، فَإِنَّ اللَّه جَاعِلٌ لَه يَوْمَ الْقِيَامَةِ عَهدًا أَنْ يُدْخِلَه الْجَنَّةَ، وَمَنْ جَاءَ بِهنَّ قَدِ انْتَقَصَ مِنْهنَّ شَيْئًا، اسْتِخْفَافًا بِحَقِّهنَّ، لَمْ يَكُنْ لَه عِنْدَ اللَّه عَهدٌ، إِنْ شَاءَ عَذَّبَه، وَإِنْ

شَاءَ غَفَرَ لَه».

عوبادەی کوڕی صامیت ﵁ دەڵێت: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: «پێنج نوێژ خوا فەڕزی کردوون لەسەر بەندەکانی، جا هەر کەسێك بەتەواوی بیانکات و کەموکورتییان تێنەخات، بەوەی کە هەقیان بە سووک بزانێت، ئەوە بەڕاستی خوا پەیمانی داوە کە لە ڕۆژی قیامەتدا بیخاتە بەهەشتەوە، هەر کەسێك بەکەموکورتی و کەمتەرخەمی پێیان هەستێت، بەوەی هەقیان بە سووک بزانێت، ئەو کەسە هیچ پەیمانێکی لەلای خوا نییە، ئەگەر پێی خۆش بوو سزای دەدات و ئەگەر پێی خۆش بوو لێی خۆش دەبێت».

## بَابُ مَا جَاءَ فِي فَضْلِ الصَّلَاةِ فِي الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ وَمَسْجِدِ النَّبِيِّ ﷺ

## باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی پاداشتی نوێژ لە (مسجد الحرام) و مزگەوتی پێغەمبەردا ﷺ

٢١٦. عَنْ جَابِرٍ ﵁: أَنَّ رَسُولَ اللَّه ﷺ قَالَ: «صَلَاةٌ فِي مَسْجِدِي أَفْضَلُ مِنْ أَلْفِ صَلَاةٍ فِيمَا سِوَاه إِلَّا الْمَسْجِدَ الْحَرَامَ وَصَلَاةٌ فِي الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ أَفْضَلُ مِنْ مِائَةِ أَلْفِ صَلَاةٍ فِيمَا سِوَاه».

جابیر ﵁ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «نوێژێک لە مزگەوتەکەی مندا خێر و پاداشتی زیاترە لە هەزار نوێژی مزگەوتەکانی دیکە، تەنها (مسجد الحرام) نەبێت، نوێژێک لە (مسجد الحرام) خێری زیاترە لە سەد هەزار نوێژ لە مزگەوتەکانی دیکە».

## بَابُ مَا جَاءَ فِي الصَّلَاةِ فِي مَسْجِدِ قُبَاءَ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی نوێژکردن لە مزگەوتی قوبائدا

٢١٧. عَنْ سَهلِ بْنِ حُنَيْفٍ ﵁: قَالَ رَسُولُ اللَّه ﷺ: «مَنْ تَطهرَ فِي بَيْتِه ثُمَّ أَتَى مَسْجِدَ قُبَاءَ، فَصَلَّى فِيه صَلَاةً، كَانَ لَه كَأَجْرِ عُمْرَةٍ».

سەهلی کوڕی حونەیف ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «هەر کەسێک لەماڵەوە خۆی پاک بکاتەوە و دەستنوێژ بگرێت، پاشان بچێتە مزگەوتی قوباء، ئینجا نوێژێکی تێدا بکات، ئەوە پاداشتەکەی وەکوو پاداشتی عومڕەیەکە».

## بَابُ مَا جَاءَ فِي بَدْءِ شَأْنِ الْمِنْبَرِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی سەرەتای دروستکردنی دوانگە

٢١٨. عَنْ أَنَسٍ ﵁: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يَخْطُبُ إِلَى جِذْعٍ فَلَمَّا اتَّخَذَ الْمِنْبَرَ ذَهبَ إِلَى الْمِنْبَرِ فَحَنَّ الْجِذْعُ فَأَتَاه فَاحْتَضَنَه فَسَكَنَ فَقَالَ: «لَوْ لَمْ أَحْتَضِنْه لَحَنَّ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ».

ئەنەس ﵁ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ لەلای قەدی دارخورمایەک وتاری دەفەرموو، جا کاتێك کە دوانگەیان بۆ دروست کرد ڕۆیشتە لای دوانگەکەی، ئینجا قەدە دارخورماکە دەستی کرد بە ناڵەناڵکردن، پێغەمبەریش ﷺ هات و لەباوەشی گرت، ئیدی داکەوت و هێواش بۆوە، فەرمووی: «ئەگەر لە باوەشم نەگرتایە هەتا ڕۆژی دوای دەیناڵاند».

## بَابُ مَا جَاءَ فِي طُولِ الْقِيَامِ فِي الصَّلَوَاتِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی درێژکردنەوەی ڕاوەستان لە نوێژەکاندا

٢١٩. عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﵁ قَالَ: صَلَّيْتُ ذَاتَ لَيْلَةٍ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَلَمْ يَزَلْ قَائِمًا حَتَّى هَمَمْتُ بِأَمْرِ سَوْءٍ، قُلْتُ: وَمَا ذَاكَ الْأَمْرُ؟ قَالَ: هَمَمْتُ أَنْ أَجْلِسَ وَأَتْرُكَه.

عەبدوڵلا ﵁ دەڵێت: شەوێک لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ نوێژم کرد، هەر بەردەوام بەپێوە مایەوە هەتا خەیاڵی کارێکی نەشیاوم کرد، (ڕاوی دەڵێت:) گوتم: ئەو کارە نەشیاوە چی بوو؟ گوتی: خەیاڵم کرد کە دابنیشم و واز لە نوێژەکە بهێنم لەگەڵیدا.

٢٢٠. عَنِ الْمُغِيرَةَ ﵁ يَقُولُ: قَامَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ حَتَّى تَوَرَّمَتْ قَدَمَاه، فَقِيلَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ قَدْ غَفَرَ اللَّهُ لَكَ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِكَ وَمَا تَأَخَّرَ، قَالَ: «أَفَلَا أَكُونُ عَبْدًا شَكُورًا».



موغیرە ﵁ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوەندە بەپێوە وەستابوو (لە نوێژدا) هەتاکوو پێیەکانی ئاوسابوون، ئینجا پێیان گوت: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بێگومان خوا لە گوناهی پێشتر و پاشتریشت خۆش بووە (کەواتە بۆ ئاوا خۆت نارەحەت دەکەیت)! فەرمووی: «ئەی نابێت بەندەیەکی سوپاسگوزار بم!».

## بَابُ مَا جَاءَ فِي كَثْرَةِ السُّجُودِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی زۆر سوجدەبردن

٢٢١. عَنْ أَبِي فَاطِمَةَ ﵁ قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَخْبِرْنِي بِعَمَلٍ أَسْتَقِيمُ عَلَيْه وَأَعْمَلُه، قَالَ: «عَلَيْكَ بِالسُّجُودِ؛ فَإِنَّكَ لَا تَسْجُدُ لِلَّهِ سَجْدَةً إِلَّا رَفَعَكَ اللَّهُ بِهَا

دَرَجَةً، وَحَطَّ بِها عَنْكَ خَطِيئَةً».

ئەبو فاتیمە ﵁ دەڵێت: گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا، کردەوەیەکم پێ بڵێیت کە لەسەری بەردەوام بم و بیکەم، فەرمووی: «زۆر سوجدە ببە، بەڕاستی هەر سوجدەیەک کە تۆ دەیبەی (بۆ خوا) پلەیەکی پێ بەرز دەبیتەوە و هەڵە و تاوانێکت لێ ڕەش دەبێتەوە».

## بَابُ مَا جَاءَ فِي أَوَّلِ مَا يُحَاسَبُ بِهِ الْعَبْدُ الصَّلَاةُ

## باسی ئەوەی کە یەکەم لێپرسینەوە لەگەڵ بەندە دەکرێت لەسەر نوێژە

٢٢٢. عَنْ أَنَسِ بْنِ حَكِيمٍ الضَّبِّيِّ ﵁ قَالَ: قَالَ لِي أَبُو هرَيْرَةَ ﵁: إِذَا أَتَيْتَ أَهلَ مِصْرِكَ فَأَخْبِرْهمْ أَنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّه ﷺ يَقُولُ: «إِنَّ أَوَّلَ مَا يُحَاسَبُ بِه الْعَبْدُ الْمُسْلِمُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، الصَّلَاةُ الْمَكْتُوبَةُ، فَإِنْ أَتَمَّها، وَإِلَّا قِيلَ: انْظُرُوا هلْ لَه مِنْ تَطَوُّعٍ؟ فَإِنْ كَانَ لَه تَطَوُّعٌ أُكْمِلَتِ الْفَرِيضَةُ مِنْ تَطَوُّعِه، ثُمَّ يُفْعَلُ بِسَائِرِ الْأَعْمَالِ الْمَفْرُوضَةِ مِثْلُ ذَلِكَ».

ئەنەسی کوڕی حەکەمی زەبی ﵁ دەڵێت: ئەبو هوڕەیرە ﵁ پێی گوتم: ئەگەر چوویتەوە بۆ نێو خەڵکی شارەکەت پێیان ڕابگەیەنە کە من لە پێغەمبەری خو ﷺ بیستوومە دەیفەرموو: «بێگومان یەکەم شتێک کە بەندەی موسوڵمان لە ڕۆژی دوایی لێپرسینەوەی لەسەری دەکرێت نوێژە فەڕزەکانن، جا ئەگەر تەواو بوون ئەوە باشە، ئەگەرنا دەگوترێت: تەماشا بکەن ئایا نوێژی سوننەتی هەیە؟ جا ئەگەر نوێژی سوننەتی هەبوو ئەوا نوێژە فەڕزەکانی پێ کامڵ و تەواو دەکرێت، پاشان هەموو کردەوە فەڕزەکانی بەم شێوەیەیان لەگەڵ دەکرێت».

## بَابُ مَا جَاءَ فِي صَلَاةُ النَّافِلَةِ حَيْثُ تُصَلَّى الْمَكْتُوبَةُ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی کردنی نوێژی سوننەت لەو شوێنەی نوێژی فەرز دەکرێت

٢٢٣. عَنِ الْمُغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ ﵁: أَنَّ رَسُولَ اللَّه ﷺ قَالَ: «لَا يُصَلِّي الْإِمَامُ فِي مُقَامِه الَّذِي صَلَّى فِيه الْمَكْتُوبَةَ حَتَّى يَتَنَحَّى عَنْه».

موغیرەی کوڕی شوعبە ﵁ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «با ئیمام لەو شوێنەی کە نوێژی فەرزی تیدا کردووە، نوێژ (ە سوننەتەکە) نەکات تاکوو لە شوێنەکەی دوور دەکەوێتەوە و لادەدات».

# كِتَابُ الْجَنَائِزِ

## پەرتووکی بەڕێکردنی مردوو

### بَابُ مَا جَاءَ فِي عِيَادَةِ الْمَرِيضِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی سەردانکردنی نەخۆش

٢٢٤. عَنْ أَبِي هرَيْرَةَ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه ﷺ: «خَمْسٌ مِنْ حَقِّ الْمُسْلِمِ عَلَى الْمُسْلِمِ: رَدُّ التَّحِيَّةِ، وَإِجَابَةُ الدَّعْوَةِ، وَشُهودُ الْجِنَازَةِ، وَعِيَادَةُ الْمَرِيضِ، وَتَشْمِيتُ الْعَاطِسِ إِذَا حَمِدَ اللَّه».

ئەبو هوڕەیرە ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «پێنج شت هەیە کە مافی موسوڵمانە لەسەر موسوڵمان: وەڵامدانەوەی سڵاو، بەدەمەوەچوونی میواندارییەکەی، ئامادەبوون لەسەر جەنازەکەی، سەردانی نەخۆش، وەڵامدانەوەی پژمینەکەی ئەگەر گوتی: (الحمد لله)».

### بَابُ مَا جَاءَ فِي ثَوَابِ مَنْ عَادَ مَرِيضًا

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی پاداشتی سەردانکردنی نەخۆش

٢٢٥. عَنْ عَلِيٍّ ﵁ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّه ﷺ يَقُولُ: «مَنْ أَتَى أَخَاه الْمُسْلِمَ، عَائِدًا،

مَشَى فِي خَرَافَةِ الْجَنَّةِ حَتَّى يَجْلِسَ، فَإِذَا جَلَسَ غَمَرَتْه الرَّحْمَةُ، فَإِنْ كَانَ غُدْوَةً، صَلَّى عَلَيْه سَبْعُونَ أَلْفَ مَلَكٍ حَتَّى يُمْسِيَ، وَإِنْ كَانَ مَسَاءً، صَلَّى عَلَيْه سَبْعُونَ أَلْفَ مَلَكٍ حَتَّى يُصْبِحَ».

عەلی ﵁ دەڵێت: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: «هەر کەسێک بێتە لای برای موسوڵمانی بۆ سەردانکردنی، تا ئەو کاتەی کە دادەنیشێت میوەکانی بەهەشت دەچنێتەوە، جا کاتێک کە دانیشت، سۆز و میهرەبانی خوا دایدەپۆشێت، جا ئەگەر کاتەکە بەیانی بوو تاکوو ئێوارە حەفتا هەزار فریشتە نزای بۆ دەکەن، ئەگەر ئێوارەش بوو، حەفتا هەزار فریشتە تاکوو بەیانی دەبێتەوە نزای بۆ دەکەن».

## بَابُ مَا جَاءَ فِي تَلْقِينِ الْمَيِّتِ لَا إِلَه إِلَّا اللَّه

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی تەڵقینی مردوو بە وتەی: (لا إله إلا الله)

٢٢٦. عَنْ أَبِي هرَيْرَةَ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه ﷺ: «لَقِّنُوا مَوْتَاكُمْ لَا إِلَه إِلَّا اللَّه».

ئەبو هورەیرە ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «مردووەکانتان (ئەوانەی لە سەرەمەرگدان) تەڵقین بدەن بە: (لا إله إلا الله)».

## بَابُ مَا جَاءَ فِي الْمُؤْمِنِ يُؤْجَرُ فِي النَّزْعِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی پاداشتدانەوەی بڕوادار بەهۆی ڕووحکێشان

٢٢٧. عَنِ ابْنِ بُرَيْدَةَ، عَنْ أَبِيه ﵁: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «الْمُؤْمِنُ يَمُوتُ بِعَرَقِ الْجَبِينِ».

ئیبن بورەیدە لە باوکیەوە ﵁ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: «بڕوادار کاتێك دەمرێت نێوچاوانی عارەق دەکات (لە توندی ئازاری مردن یان بەهۆی

پاكبوونەوەی لە تاوان بەهۆی ئازاری مردنەوە)».

## بَابُ مَا جَاءَ فِي تَغْمِيضِ الْمَيِّتِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی چاوداخستنی مردوو

٢٢٨. عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ ﵂ قَالَتْ: دَخَلَ رَسُولُ اللَّه ﷺ عَلَى أَبِي سَلَمَةَ وَقَدْ شَقَّ بَصَرُه فَأَغْمَضَه، ثُمَّ قَالَ: «إِنَّ الرُّوحَ إِذَا قُبِضَ تَبِعَه الْبَصَرُ».

ئوم سەلەمە ﵂ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ چوو بۆ لای ئەبو سەلەمە (کاتی مردنەکەی)، ئەویش چاوەکانی کراوە بوون، (پێغەمبەر ﷺ) چاوەکانی بۆ داخست، پاشان فەرمووی: «کاتێ کە ڕووح دەردەچێت چاوەکان شوێنی دەکەون».



## بَابُ مَا جَاءَ فِي تَقْبِيلِ الْمَيِّتِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی ماچکردنی مردوو

٢٢٩. عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: قَبَّلَ رَسُولُ اللَّه ﷺ عُثْمَانَ بْنَ مَظْعُونٍ وَهوَ مَيِّتٌ، فَكَأَنِّي أَنْظُرُ إِلَى دُمُوعِه تَسِيلُ عَلَى خَدَّيْه.

عائیشە ﵂ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ عوسمانی کوڕی مەزعوونی ماچ کرد بە مردوویی، وەک ئێستا لەبەر چاومە، کە فرمێسک بەسەر ڕوومەتەکانیدا دەهاتە خوارێ.

٢٣٠. عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ وَعَائِشَةَ ﷺ: أَنَّ أَبَا بَكْرٍ ﵁ قَبَّلَ النَّبِيَّ ﷺ، وَهوَ مَيِّتٌ.

ئیبن عەبباس و عائیشە ﷺ دەگێڕنەوە: کە ئەبو بەکر ﵁ پێغەمبەری ﷺ ماچ کرد ئەوکاتەی کە وەفاتی کردبوو.

## بَابُ مَا جَاءَ فِي غَسْلِ الرَّجُلِ امْرَأَتَه وَغَسْلِ الْمَرْأَةِ زَوْجَها

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی شوشتنی ژن لەلایەن پیاویەوە و پیاو لەلایەن ژنیەوە

٢٣١. عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: لَوْ كُنْتُ اسْتَقْبَلْتُ مِنْ أَمْرِي مَا اسْتَدْبَرْتُ، مَا غَسَّلَ النَّبِيَّ ﷺ غَيْرُ نِسَائِه.

عائیشه ﵂ دەڵێت: ئەگەر پێشتر بمزانیبایە نەک دواتر (حوکمی شوشتنی پیاو لەلایەن ژنەکەیەوە)، ئەوە جگە لە هاوسەرەکانی کەسی دیکە پێغەمبەری ﷺ نەدەشوشت.

## بَابُ مَا جَاءَ فِي غُسْلِ النَّبِيِّ ﷺ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی شوشتنی پێغەمبەر ﷺ

٢٣٢. عَنْ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ ﵁ قَالَ: لَمَّا غَسَّلَ النَّبِيَّ ﷺ ذَهبَ يَلْتَمِسُ مِنْه مَا يُلْتَمَسُ مِنَ الْمَيِّتِ، فَلَمْ يَجِدْه، فَقَالَ: بِأَبِي الطَّيِّبُ، طِبْتَ حَيًّا، وَطِبْتَ مَيِّتًا.

عەلی کوڕی ئەبو تالیب ﵁ دەڵێت: کاتێک کە پێغەمبەری ﷺ شوشت، وای بۆ دەچوو کە وەک هەر کەسێکی دیکە ئەو شتانەی لێ دەردەچێت (کە لە کاتی مردندا بە هۆی شلبوونەوە دەردەچێت)، بەڵام هیچ شتێکی لێ نەدیت، ئەویش گوتی: بە باوکەوە فیدات بم، ئەی ئەو کەسەی کە بەپاکی ژیایت و بەپاکی مردیت.

## بَابُ مَا جَاءَ فِيمَا يُسْتَحَبُّ مِنَ الْكَفَنِ

## باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی ئەو شتانەی کە بۆ کفنکردن سوننەتن

٢٣٣. عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه ﷺ: «خَيْرُ ثِيَابِكُمُ الْبَيَاضُ، فَكَفِّنُوا فِيها مَوْتَاكُمْ، وَالْبَسُوها».

ئیبن عەبباس ﵄ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «باشترینی پۆشاکەکانتان پۆشاکی سپییە، مردووەکانتانی تێدا کفن بکەن و لەبەری بکەن».

## بَابُ مَا جَاءَ فِي شُهودِ الْجَنَائِزِ

## باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی ئامادەبوون لەسەر مردوو

٢٣٤. عَنْ أَبِي هرَيْرَةَ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه ﷺ: «أَسْرِعُوا بِالْجِنَازَةِ، فَإِنْ تَكُنْ صَالِحَةً فَخَيْرٌ تُقَدِّمُونها إِلَيْه، وَإِنْ تَكُنْ غَيْرَ ذَلِكَ فَشَرٌّ تَضَعُونَه عَنْ رِقَابِكُمْ».

ئەبو هورەیرە ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «پەلە بکەن لە شاردنەوەی مردوو، خۆ ئەگەر چاکەکار بێت، بۆ شوێنێکی باشتری دەبەن، ئەگەر واش نەبێت، ئەوە خراپەیەکە لە ئەستۆی خۆتان لادەبەن».

## بَابُ مَا جَاءَ فِيمَنْ صَلَّى عَلَيْه جَمَاعَةٌ مِنَ الْمُسْلِمِينَ

## باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی ئەو کەسەی کۆمەڵێک لە موسوڵمانان نوێژی لەسەر دەکەن

٢٣٥. عَنْ كُرَيْبٍ ﵁ مَوْلَى عَبْدِ اللَّه بْنِ عَبَّاسٍ ﵄ قَالَ: هلَكَ ابْنٌ لِعَبْدِ اللَّه بْنِ عَبَّاسٍ، فَقَالَ لِي يَا كُرَيْبُ قُمْ فَانْظُرْ هلِ اجْتَمَعَ لِابْنِي أَحَدٌ؟ فَقُلْتُ: نَعَمْ، فَقَالَ:

وَيْحَكَ كَمْ تَرَاهُمْ؟ أَرْبَعِينَ؟ قُلْتُ: لَا، بَلْ هُمْ أَكْثَرُ، قَالَ: فَاخْرُجُوا بِابْنِي، فَأَشْهَدُ لَسَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «مَا مِنْ أَرْبَعِينَ مِنْ مُؤْمِنٍ يَشْفَعُونَ لِمُؤْمِنٍ، إِلَّا شَفَّعَهُمُ اللَّهُ».

کوڕەیبی ﷺ خزمەتکاری عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس ﷺ دەڵێت: کوڕێکی عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس مرد، ئینجا پێی گوتم: ئەی کوڕەیب هەستە تەماشا بکە بزانە کەس بۆ کوڕەکەم کۆ بۆتەوە (بۆ نوێژ لەسەرکردن)، منیش گوتم: بەڵێ، ئەویش گوتی: هاوار بۆ تۆ چەند دەبن؟ چل (کەس دەبن)؟ گوتم: نەخێر بەڵکوو زیاترن، گوتی: کەواتە کوڕەکەم بێننە دەرێ (بۆ نوێژ لەسەرکردن)، شایەتی دەدەم کە بەڕاستی لە پێغەمبەری خوا ﷺ بیستوومە دەیفەرموو: «هیچ بڕوادارێک نییە کە چل کەس لە بڕواداران تکای بۆ بکەن مسۆگەر خوا تکاکەیان وەردەگرێت».

## بَابُ مَا جَاءَ فِي الثَّنَاءِ عَلَى الْمَيِّتِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی باسکردنی مردوو بەچاکە

٢٣٦. عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: مُرَّ عَلَى النَّبِيِّ ﷺ بِجِنَازَةٍ، فَأُثْنِيَ عَلَيْهَا خَيْرًا، فَقَالَ: «وَجَبَتْ»، ثُمَّ مُرَّ عَلَيْه بِجِنَازَةٍ، فَأُثْنِيَ عَلَيْهَا شَرًّا، فَقَالَ: «وَجَبَتْ»، فَقِيلَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ قُلْتَ لِهَذِه وَجَبَتْ، وَلِهَذِه وَجَبَتْ، فَقَالَ: «شَهَادَةُ الْقَوْمِ، وَالْمُؤْمِنُونَ شُهُودُ اللَّهِ فِي الْأَرْضِ».

ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێت: جەنازەیەک بەلای پێغەمبەردا ﷺ تێپەڕیی، جا ستاییشی (مردووەکەیان) دەکرد، فەرمووی: «پێویست بوو»، پاشان جەنازەیەکی دیکە بەلایدا تێپەڕیی، جا بەخراپە باسیان دەکرد، فەرمووی: «پێویست بوو»، گوترا: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ ئەوەیان فەرمووت: وەرگیرا، بۆ ئەوەشیان فەرمووت: وەرگیرا!! ئینجا فەرمووی: «شایەتی خەڵک بوو، بڕواداران شایەتیدەرانی خوان لەسەر زەوی».

## بَابُ مَا جَاءَ فِي الدُّعَاءِ فِي الصَّلَاةِ عَلَى الْجِنَازَةِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی دوعاکردن لەنێو نوێژی مردوو

٢٣٧. عَنْ أَبِي هرَيْرَةَ ﵁ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّه ﷺ إِذَا صَلَّى عَلَى جِنَازَةٍ يَقُولُ: «اللَّهمَّ اغْفِرْ لِحَيِّنَا وَمَيِّتِنَا، وَشَاهِدِنَا وَغَائِبِنَا، وَصَغِيرِنَا وَكَبِيرِنَا، وَذَكَرِنَا وَأُنْثَانَا، اللَّهمَّ مَنْ أَحْيَيْتَه مِنَّا فَأَحْيِه عَلَى الْإِسْلَامِ، وَمَنْ تَوَفَّيْتَه مِنَّا فَتَوَفَّه عَلَى الْإِيمَانِ، اللَّهمَّ لَا تَحْرِمْنَا أَجْرَه، وَلَا تُضِلَّنَا بَعْدَه».

ئەبو هورەیرە ﵁ دەڵێت: هەرکات پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی لەسەر جەنازە دەکرد دەیفەرموو: «خوایە لە زیندوو و مردووەکانمان خۆش بە، وە لە ئامادەبووان و ئەوانەشی کە ئامادە نین، وە لە گچکە و گەورەمان، وە لە نێر و مێینەمان، خوایە ئەوەی ژیانت پێ دا لە ئێمە ئەوە لەسەر ئیسلام بیژیێنە، وە ئەوەی ڕووحت لێ وەرگرتەوە، ئەوە بە ئیمان و بڕواوە بیمرێنە، خوایە لە پاداشتی بێبەشمان مەکە، وە لەدوای ئەو تووشی گومڕاییمان مەکە».

## بَابُ مَا جَاءَ فِي الصَّلَاةِ عَلَى الطِّفْلِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی نوێژکردن لەسەر منداڵی مردوو

٢٣٨. عَنِ الْمُغِيرَةَ بْنِ شُعْبَةَ ﵁ يَقُولُ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّه ﷺ يَقُولُ: «الطِّفْلُ يُصَلَّى عَلَيْه».

موغیرەی کوڕی شوعبە ﵁ دەڵێت: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: «منداڵ نوێژی لەسەر دەکرێت».

## بَابُ مَا جَاءَ فِي الصَّلَاةِ عَلَى الشُّهَدَاءِ وَدَفْنِهِمْ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی نوێژکردن لەسەر شەهیدان و کفنکردنیان

٢٣٩. عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﵄: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ يَجْمَعُ بَيْنَ الرَّجُلَيْنِ، وَالثَّلَاثَةِ مِنْ قَتْلَى أُحُدٍ فِي ثَوْبٍ وَاحِدٍ ثُمَّ يَقُولُ: «أَيُّهُمْ أَكْثَرُ أَخْذًا لِلْقُرْآنِ؟»، فَإِذَا أُشِيرَ لَه إِلَى أَحَدِهِمْ قَدَّمَه فِي اللَّحْدِ وَقَالَ: «أَنَا شَهِيدٌ عَلَى هَؤُلَاءِ، وَأَمَرَ بِدَفْنِهِمْ فِي دِمَائِهِمْ، وَلَمْ يُصَلِّ عَلَيْهِمْ، وَلَمْ يُغَسَّلُوا».

جابیری کوڕی عەبدوڵڵا ﵄ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ شەهیدەکانی ئوحودی دوو دانە بەیەکەوە، یان سێ دانە بەیەکەوە، لەنێو یەک پۆشاک و کفندا کۆ دەکردەوە، پاشان دەیفەرموو: «کامەیان زیاتر قورئانی لەبەرە؟»، جا ئەگەر ئاماژەیان بە یەکێک کردبایە، ئەوی پێش دەخست لە کاتی ناشتندا، وە دەیفەرموو: «من شایەتی بۆ ئەوانە دەدەم (کە لە ڕێگای خوا شەهید بوون)، فەرمانی کرد کە بە خوێنەکانیانەوە بنێژرێن، نوێژی لەسەر نەکردن و نەشۆردران».

## بَابُ مَا جَاءَ فِي الْأَوْقَاتِ الَّتِي لَا يُصَلَّى فِيهَا عَلَى الْمَيِّتِ وَلَا يُدْفَنُ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی ئەو کاتانەی نوێژی مردوو ناکرێت و ناشنێژرێت

٢٤٠. عَنْ عُقْبَةَ بْن عَامِرٍ الْجُهَنِيِّ ﵁ يَقُولُ: ثَلَاثُ سَاعَاتٍ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَنْهَانَا أَنْ نُصَلِّيَ فِيهِنَّ أَوْ نَقْبِرَ فِيهِنَّ مَوْتَانَا: حِينَ تَطْلُعُ الشَّمْسُ بَازِغَةً، وَحِينَ يَقُومُ قَائِمُ الظَّهِيرَةِ حَتَّى تَمِيلَ الشَّمْسُ، وَحِينَ تَضَيَّفُ لِلْغُرُوبِ حَتَّى تَغْرُبَ.

عوقبەی کوڕی عامیری جوهەنی ﵁ دەڵێت: سێ کات هەیە پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی کردووە کە نوێژی تێدا بکەین، یان مردووەکانمانی تێدا بنێژین: ئەو کاتەی کە خۆر هەڵدێت بەتەواوی، وە ئەو کاتەی کە خۆر دەگاتە کاتی نیوەڕۆ،

تاکوو (له نێوەڕاستی ئاسمان) لادەدات، وە ئەو کاتەی لار دەبێتەوە بەرەو ئاوابوون تاکوو ئاوا دەبێت.

## بَابُ مَا جَاءَ فِي الصَّلَاةِ عَلَى الْقَبْرِ

## باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی نوێژکردن لەسەر گۆڕ

٢٤١. عَنْ أَبِي هرَيْرَةَ ﵁: أَنَّ امْرَأَةً سَوْدَاءَ كَانَتْ تَقُمُّ الْمَسْجِدَ، فَفَقَدَها رَسُولُ اللَّه ﷺ، فَسَأَلَ عَنْها بَعْدَ أَيَّامٍ، فَقِيلَ لَه: إِنَّها مَاتَتْ، قَالَ: «فَهلَّا آذَنْتُمُونِي»، فَأَتَى قَبْرَها، فَصَلَّى عَلَيْها.

ئەبو هوڕەیرە ﵁ دەگێڕێتەوە: ئافرەتێکی ڕەشپێست هەبوو مزگەوتی خاوێن دەکردەوە، ئینجا پێغەمبەری خوا ﷺ ماوەیەک بوو نەیدەبینی، ئەویش دوای چەند ڕۆژێک پرسیاری دەربارەی کرد، پێیان گوت: ئەو ئافرەتە مردووە، فەرمووی: «ئەی نەدەبوو هەواڵم پێ بدەن!»، بۆیە هات بۆ سەر گۆڕەکەی و نوێژی لەسەر کرد.

## بَابُ مَا جَاءَ فِي الصَّلَاةِ عَلَى النَّجَاشِيِّ

## باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی نوێژکردن لەسەر نەجاشی

٢٤٢. عَنْ عِمْرَانَ بْنِ الْحُصَيْنِ ﵁: أَنَّ رَسُولَ اللَّه ﷺ قَالَ: «إِنَّ أَخَاكُمُ النَّجَاشِيَّ قَدْ مَاتَ، فَصَلُّوا عَلَيْه»، قَالَ: فَقَامَ فَصَلَّيْنَا خَلْفَه، وَإِنِّي لَفِي الصَّفِّ الثَّانِي، فَصَلَّى عَلَيْه صَفَّيْنِ.

عیمرانی کوڕی حوصەین ﵁ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: «بێگومان نەجاشی براتان مردووە و نوێژی لەسەر بکەن، گوتی: ئینجا هەڵسا و نوێژمان لە پشتیەوە کرد، وە من لە ڕیزی دووەم بووم، دوو ڕیز (نوێژخوێن) نوێژیان لەسەر کرد».

## بَابُ مَا جَاءَ فِي ثَوَابِ مَنْ صَلَّى عَلَى جِنَازَةٍ وَمَنِ انْتَظَرَ دَفْنَها

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی پاداشتی کەسێك نوێژی مردوو دەکات و چاوەڕێی ناشتنیەتی

٢٤٣. عَنْ أَبِي هرَيْرَةَ ﵁ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «مَنْ صَلَّى عَلَى جِنازَةٍ فَلَه قِيرَاطٌ، وَمَنِ انْتَظَرَ حَتَّى يُفْرَغَ مِنْها فَلَه قِيرَاطَانِ»، قَالُوا: وَمَا الْقِيرَاطَانِ؟ قَالَ: «مِثْلُ الْجَبَلَيْنِ».

ئەبو هوڕەیرە ﵁ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: «هەر کەسێک نوێژ لەسەر تەرمێک بکات، ئەوە پاداشتی دەدرێتەوە بەئەندازەی قیراتێک، هەر کەسێکیش چاوەڕێ بکات تاکوو دەنێژرێت، پاداشتی دەدرێتەوە بەئەندازەی دوو قیرات»، گوتیان: قیرات چییە؟ فەرمووی: «بەئەندازەی دوو کێوە».

## بَابُ مَا جَاءَ فِيمَا يُقَالُ إِذَا دَخَلَ الْمَقَابِرَ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی چ دەگوترێت لە کاتی چوونە گۆڕستان

٢٤٤. عَنْ سُلَيْمَانَ بْنِ بُرَيْدَةَ، عَنْ أَبِيه ﵁ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّه ﷺ يُعَلِّمُهمْ إِذَا خَرَجُوا إِلَى الْمَقَابِرِ، كَانَ قَائِلُهمْ يَقُولُ: «السَّلَامُ عَلَيْكُمْ أَهلَ الدِّيَارِ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ وَالْمُسْلِمِينَ، وَإِنَّا إِنْ شَاءَ اللَّه بِكُمْ لَاحِقُونَ، نَسْأَلُ اللَّه لَنَا وَلَكُمُ الْعَافِيَةَ».

سولەیمانی کوڕی بوڕەیدە لە باوکیەوە ﵁ دەگێڕێتەوە، گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فێری دەکردن کە چوونە گۆڕستان بڵێن: «سەلامی خواتان لێ بێت، ئەی خەڵکی مەنزڵگا لە بڕواداران و موسوڵمانان، ئێمەش بە ویستی خوا بە ئێوە دەگەین، داوای لێخۆشبوون بۆ خۆمان و بۆ ئێوەش لە خوا دەکەین».

## بَابُ مَا جَاءَ فِي الْجُلُوسِ فِي الْمَقَابِرِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی چۆنیەتی دانیشتن لە گۆڕستان

٢٤٥. عَنِ الْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ ﷺ قَالَ: خَرَجْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّه ﷺ فِي جِنَازَةٍ، فَانْتَهَيْنَا إِلَى الْقَبْرِ فَجَلَسَ، وَجَلَسْنَا، كَأَنَّ عَلَى رُءُوسِنَا الطَّيْرَ.

بەڕائی کوڕی عازیب ﷺ دەڵێت: لە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ جەنازەیەک دەرچووین تاکوو گەیشتینە سەر گۆڕەکە، ئینجا دانیشت، ئێمەش دانیشتین، بە جۆرێک وەکوو ئەوەی کە باڵندە لەسەر سەرمان بێت (واتە: زۆر بەئارامی دانیشتین).

## بَابُ مَا جَاءَ فِي إِدْخَالِ الْمَيِّتِ الْقَبْرَ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی مردوو خستنە نێو گۆڕ

٢٤٦. عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ إِذَا أُدْخِلَ الْمَيِّتُ الْقَبْرَ، قَالَ: «بِسْمِ اللَّه، وَعَلَى مِلَّةِ رَسُولِ اللَّه»، وَقَالَ أَبُو خَالِدٍ مَرَّةً: إِذَا وُضِعَ الْمَيِّتُ فِي لَحْدِهِ قَالَ: «بِسْمِ اللَّه، وَعَلَى سُنَّةِ رَسُولِ اللَّه»، وَقَالَ هِشَامٌ فِي حَدِيثِهِ: «بِسْمِ اللَّه، وَفِي سَبِيلِ اللَّه، وَعَلَى مِلَّةِ رَسُولِ اللَّه».

ئیبن عومەر ﷺ دەڵێت: کاتێک کە مردوو دەخرایە نێو گۆڕ، پێغەمبەر ﷺ دەیفەرموو: «بە ناوی خوا، لەسەر ئایینی پێغەمبەری خوا»، ئەبو خالید جارێک گوتی: کاتێک مردوو خرایە نێو گۆڕەکەی فەرمووی: «بە ناوی خوا، لەسەر سوننەت و ڕێبازی پێغەمبەری خوا»، هیشام لە گێڕانەوەکەیدا گوتی: «بە ناوی خوا، لەپێناو خوا و لەسەر ئایین و ڕێبازی پێغەمبەری خوا ﷺ (واتە: لە کاتی ناشتنی مردووەکەدا پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوەی دەفەرموو)».

## بَابُ مَا جَاءَ فِي حَفْرِ الْقَبْرِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی هەڵکەندنی گۆڕ

٢٤٧. عَنْ هِشَامِ بْنِ عَامِرٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «احْفِرُوا، وَأَوْسِعُوا، وَأَحْسِنُوا».

هیشامی کوڕی عامیر ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ (دەربارەی گۆڕ) فەرموویەتی: «هەڵیبکەنن و چاڵی بکەن و فراوانی بکەن و چاکی بکەن».

تێبینی:

(حفر القبر): واتە: چاڵکردنی نێوەڕاستی گۆڕەکە بەئەندازەی مردووەکە.



## بَابُ مَا جَاءَ فِي اتِّبَاعِ النِّسَاءِ الْجَنَائِزَ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی شوێنکەوتنی جەنازە بۆ ئافرەتان

٢٤٨. عَنْ أُمِّ عَطِيَّةَ ﷺ قَالَتْ: نُهِينَا عَنِ اتِّبَاعِ الْجَنَائِزِ، وَلَمْ يُعْزَمْ عَلَيْنَا.

ئوم عەتییە ﷺ دەڵێت: (ئێمەی ئافرەتان) شوێنکەوتنی جەنازەمان لێ قەدەغە کراوە، بەڵام قەدەغەکردنی یەکجارەکی نا (واتە: بەپێی ئەم فەرموودەیە حەرام نییە، بەڵکوو ناپەسندە).

## بَابُ مَا جَاءَ فِي النَّهْيِ عَنْ ضَرْبِ الْخُدُودِ، وَشَقِّ الْجُيُوبِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی ڕێگریکردن<br>لە لە دەموچاوی خۆدان و یەخەدادڕین

٢٤٩. عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَيْسَ مِنَّا مَنْ شَقَّ الْجُيُوبَ،

وَضَرَبَ الْخُدُودَ، وَدَعَا بِدَعْوَى الْجَاهِلِيَّةِ».

عەبدوڵلا ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «هەر کەسێک یەخەی دابدڕێت (لە کاتی بەڵا و گرفتاریدا) و لە ڕوخساری خۆی بدات، یان هاوار بکات بە هاوارکردنی سەردەمی نەفامی، لە ئێمە نییە».

## بَابُ مَا جَاءَ فِي الْبُكَاءِ عَلَى الْمَيِّتِ

## باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی گریان لەسەر مردوو

٢٥٠. عَنْ أُسَامَةَ بْنِ زَيْدٍ ﵁ قَالَ: كَانَ ابْنٌ لِبَعْضِ بَنَاتِ رَسُولِ اللَّه ﷺ يَقْضِي، فَأَرْسَلَتْ إِلَيْه أَنْ يَأْتِيَها، فَأَرْسَلَ إِلَيْها أَنَّ، لِلَّه مَا أَخَذَ، وَلَه مَا أَعْطَى، وَكُلُّ شَيْءٍ عِنْدَه إِلَى أَجَلٍ مُسَمًّى، فَلْتَصْبِرْ وَلْتَحْتَسِبْ، فَأَرْسَلَتْ إِلَيْه، فَأَقْسَمَتْ عَلَيْه، فَقَامَ رَسُولُ اللَّه ﷺ وَقُمْتُ مَعَه، وَمَعَه مُعَاذُ بْنُ جَبَلٍ، وَأُبَيُّ بْنُ كَعْبٍ، وَعُبَادَةُ بْنُ الصَّامِتِ، فَلَمَّا دَخَلْنَا نَاوَلُوا الصَّبِيَّ رَسُولَ اللَّه ﷺ، وَرُوحُه تَقَلْقَلُ فِي صَدْرِه، قَالَ: حَسِبْتُه قَالَ: كَأَنَّها شَنَّةٌ، قَالَ: فَبَكَى رَسُولُ اللَّه ﷺ، فَقَالَ لَه عُبَادَةُ بْنُ الصَّامِتِ: مَا هٰذَا يَا رَسُولَ اللَّه؟ قَالَ: «الرَّحْمَةُ الَّتِي جَعَلَها اللَّه فِي بَنِي آدَمَ، وَإِنَّمَا يَرْحَمُ اللَّه مِنْ عِبَادِه الرُّحَمَاءَ».

ئوسامەی کوڕی زەید ﵁ دەڵێت: یەکێک لە کچەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ کوڕێکی هەبوو، لە کاتی گیانکێشاندا بوو، ناردی بەشوێن پێغەمبەردا ﷺ بۆ ئەوەی بچێتە لای لەو کاتەدا، (پێغەمبەریش ﷺ) بۆ کچەکەی ناردەوە کە خوا مافی ئەوەی هەیە کە وەریبگرێتەوە، ئەوەی بەخشیویشیەتی هەر موڵکی خۆیەتی، هەموو شتێک لەلای خوا کاتی بۆ دیاریکراوە، بۆیە ئارام بگرە و لەبەر خوا خۆڕاگر بە (بۆ ئەو کۆسپە)، دیسان بەدوایدا ناردەوە و سوێندی لەسەر خوارد (کە دەبێت بچێت)، جا پێغەمبەری خوا ﷺ هەڵسا و منیش لەگەڵیدا هەڵسام و موعازی کوڕی جەبەل و ئوبەی کوڕی کەعب و عوبادەی کوڕی صامیتی لەگەڵدا بوو، جا کاتێک چووین

منداڵەكەیان بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ هێنا، لەو كاتەدا هەناسەی سوار بوو، دەڵێت: پێم وا بێت گوتی: وەكوو كوندەیەك وا بوو كە دەیهەژێنیت، گوتی: ئینجا پێغەمبەری خوا ﷺ گریا، عوبادەی كوڕی صامیتیش گوتی: ئەوە چییە ئەی پێغەمبەری خو ﷺ (ئەو گریانە)؟ فەرمووی: «ئەو سۆز و بەزەییە كە خوا دایناوە لەنێو دڵی هەموو مرۆڤێكدا، خوا تەنها لەگەڵ ئەوانە بەسۆز و میهرەبانە كە سۆز و میهرەبانییان هەیە».

## بَابُ مَا جَاءَ فِي الصَّبْرِ عَلَى الْمُصِيبَةِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی ئارامگرتن لەسەر بەڵا و ناخۆشی

٢٥١. عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه ﷺ: «إِنَّمَا الصَّبْرُ عِنْدَ الصَّدْمَةِ الْأُولَى».

ئەنەسی كوڕی مالیک ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «ئارامی و خۆڕاگری ئەوەیە كە لە سەرەتای كۆستەكەوە بێت».

## بَابُ مَا جَاءَ فِي ثَوَابِ مَنْ أُصِيبَ بِوَلَدِه

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی پاداشتی ئەو كەسەی منداڵی دەمرێت

٢٥٢. عَنْ أَبِي هرَيْرَةَ ﷺ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «لَا يَمُوتُ لِرَجُلٍ ثَلَاثَةٌ مِنَ الْوَلَدِ فَيَلِجَ النَّارَ، إِلَّا تَحِلَّةَ الْقَسَمِ».

ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: «هیچ پیاوێک نییە كە سێ منداڵی بمرێت و بچێتە دوزەخ، مەگەر كەمێكی زۆر كەم نەبێت (وەكوو دەڵێن: تەنها لەبەر خاتری سوێند نەبێت)».

تێبینی:

(إِلَّا تَحِلَّةَ الْقَسَمِ): بەکار دەهێنرێت بۆ شتێک کە زۆر کەم بێت، وەکوو لە کوردەواریدا دەڵێن: ئەو شتە ناکەم تەنها لەبەر سوێندەکە نەبێت، واتە: بەشی ئەوەندە کارەکە دەکەم کە سوێندەکە نەکەوێت و هیچی دیکە.

٢٥٣. عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رضي الله عنه عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «مَا مِنْ مُسْلِمَيْنِ يُتَوَفَّى لَهُمَا ثَلَاثَةٌ مِنَ الْوَلَدِ لَمْ يَبْلُغُوا الْحِنْثَ، إِلَّا أَدْخَلَهُمُ اللَّهُ الْجَنَّةَ، بِفَضْلِ رَحْمَةِ اللَّهِ إِيَّاهُمْ».

ئەنەسی کوڕی مالیک رضي الله عنه دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری ﷺ فەرموویەتی: «هەر دوو موسوڵمانێک کەوا سێ منداڵیان دەمرن و نەگەیشتوونە قۆناغی باڵغبوون، ئەوە مسۆگەر خوای میهرەبان بە فەزڵ و چاکە بۆیان دەیانخاتە نێو بەهەشتەوە».

## بَابُ مَا جَاءَ فِي الطَّعَامِ يُبْعَثُ إِلَى أَهْلِ الْمَيِّتِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی ناردنی خواردن بۆ خاوەن مردوو

٢٥٤. عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ جَعْفَرٍ رضي الله عنهما قَالَ: لَمَّا جَاءَ نَعْيُ جَعْفَرٍ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «اصْنَعُوا لِآلِ جَعْفَرٍ طَعَامًا، فَقَدْ أَتَاهُمْ مَا يَشْغَلُهُمْ، أَوْ أَمْرٌ يَشْغَلُهُمْ».

عەبدوڵڵای کوڕی جەعفەر رضي الله عنهما دەڵێت: کاتێ هەواڵی شەهیدبوونی جەعفەر هات، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: «بۆ خێزان و ماڵ و منداڵی جەعفەر خواردن ساز بکەن، چونکە بەڕاستی تووشی کۆستێك هاتوون سەرقاڵی کردوون، یان تووشی کارەساتێك بوون سەرقاڵیان دەکات».

## بَابٌ فِي النَّهْيِ عَنْ كَسْرِ عِظَامِ الْمَيِّتِ

### باسێك دەربارەی ڕێگریکردنی لە شکاندنی ئێسکی مردوو

٢٥٥. عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «كَسْرُ عَظْمِ الْمَيِّتِ كَكَسْرِهِ حَيًّا».

عائیشە ﵂ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «(گوناهی) شکاندنی ئێسکی مردوو وەک شکاندنیەتی بەزیندوویی».

## بَابُ مَا جَاءَ فِي ذِكْرِ مَرَضِ رَسُولِ اللَّه ﷺ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی نەخۆشکەوتنی پێغەمبەری خوا ﷺ

٢٥٦. عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يَتَعَوَّذُ بِهؤُلَاءِ الْكَلِمَاتِ: «أَذْهِبِ الْبَاسَ، رَبَّ النَّاسِ، وَاشْفِ أَنْتَ الشَّافِي، لَا شِفَاءَ إِلَّا شِفَاؤُكَ، شِفَاءً لَا يُغَادِرُ سَقَمًا»، فَلَمَّا ثَقُلَ النَّبِيُّ ﷺ فِي مَرَضِه الَّذِي مَاتَ فِيه، أَخَذْتُ بِيَدِه، فَجَعَلْتُ أَمْسَحُه وَأَقُولُها، فَنَزَعَ يَدَه مِنْ يَدِي، ثُمَّ قَالَ: «اللَّهمَّ اغْفِرْ لِي، وَأَلْحِقْنِي بِالرَّفِيقِ الْأَعْلَى»، قَالَتْ: فَكَانَ هذَا آخِرَ مَا سَمِعْتُ مِنْ كَلَامِه ﷺ.

عائیشە ﵂ دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ بەو چەند وشەگەلە پەنای بە خوا دەگرت: «ئەی پەروەردگار ناڕەحەتی و نەخۆشییەکەم لابە، چارەسەر بنێرە هەر تۆ شیفابەخشی، هیچ چارەسەرێک نییە جگە لەو چارەسەرەی کە لەلایەن تۆوەیە، چارەسەرێک کە نەخۆشی و ئازار بەجێ ناهێڵێت»، جا (عائیشە ﵂ دەڵێت:) کاتێک نەخۆشی پێغەمبەر ﷺ گران بوو، لەو نەخۆشییەی کە تێیدا وەفاتی کرد، دەستیم گرت و بە لاشەیمدا دەهێنا و ئەو وشانەشم دەگوت، دەستی لەنێو دەستم دەرهێنا و پاشان فەرمووی: «خوایە لێم خۆش ببە و بمگەیەنە بە ڕەفیقولئەعلا (ئەوانەی کە لەلای خوا پلەیان بەرزە)، دەڵێت: ئەوە کۆتا قسەیەک بوو کە لە پێغەمبەر ﷺ بیستم».

٢٥٧. عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّه ﷺ، يَقُولُ: «مَا مِنْ نَبِيٍّ يَمْرَضُ إِلَّا خُيِّرَ بَيْنَ الدُّنْيَا وَالْآخِرَةِ»، قَالَتْ: فَلَمَّا كَانَ مَرَضُه الَّذِي قُبِضَ فِيه، أَخَذَتْه بُحَّةٌ، فَسَمِعْتُه يَقُولُ: «{مَعَ الَّذِينَ أَنْعَمَ اللَّهُ عَلَيْهِمْ مِنَ النَّبِيِّينَ وَالصِّدِّيقِينَ وَالشُّهَدَاءِ وَالصَّالِحِينَ} النساء: ٦٩»، فَعَلِمْتُ أَنَّه خُيِّرَ.

عائیشه رضي الله عنها دەڵێت: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: «هیچ پێغەمبەرێک نییە کە کاتێک نەخۆش دەکەوێت ئیلا خوا هەڵبژاردنی دەداتێت لە نێوان دونیا و قیامەتدا»، گوتی: جا کاتێك نەخۆش کەوت بەو نەخۆشییەی کە تێیدا وەفاتی کرد، دەنگی گۆڕا و گوێشم لێ بوو دەیفەرموو: «{مَعَ الَّذِينَ أَنْعَمَ اللَّهُ عَلَيْهِمْ مِنَ النَّبِيِّينَ وَالصِّدِّيقِينَ وَالشُّهَدَاءِ وَالصَّالِحِينَ}، واتە: هەر کەسێک گوێڕایەڵی خوا و پێغەمبەر بکات، جا ئەوانە لەگەڵ کەسانێکن کە خوا فەزڵ و بەهرەی (خۆی) ڕشتووە بەسەریاندا لە پێغەمبەران و ڕاستگۆیان و شەهیدان و پیاوچاکان، جا زانیم کە خوا هەڵبژاردنی داوەتێ».

٢٥٨. عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ رضي الله عنها: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ يَقُولُ فِي مَرَضِهِ الَّذِي تُوُفِّيَ فِيهِ: «الصَّلَاةَ، وَمَا مَلَكَتْ أَيْمَانُكُمْ»، فَمَا زَالَ يَقُولُهَا، حَتَّى مَا يَفِيضُ بِهَا لِسَانُه.

ئوم سەلەمە رضي الله عنها دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ لە نەخۆشی وەفاتکردنەکەیدا فەرمووی: «ئاگاتان لە نوێژەکانتان بێت و بەزایەیان مەدەن، وە ئاگاتان لە سەروەت و سامانتان بێت و زەکاتی لێ بدەن»، (بەو شێوەیە ئەم فەرموودەیە شەرح کراوە، تاکوو هاوتەریب بێت لەگەڵ دواندنی قورئان کە هەمیشە نوێژ و زەکات بەدوای یەکدان، وە هەندێکی دیکە دەڵێن: مەبەستی پێ لە بەندە و کەنیزەکە، کە فەرمانی کردووە بە چاودێریکردنیان)، هەتاکوو زمانی گەڕا بەردەوام ئەوەی دووبارە کردەوە.

## بَابُ ذِكْرِ وَفَاتِهِ وَدَفْنِهِ ﷺ

### باسی مردن و ناشتنی پێغەمبەری خوا ﷺ

٢٥٩. عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رضي الله عنه قَالَ: لَمَّا وَجَدَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مِنْ كَرْبِ الْمَوْتِ مَا وَجَدَ، قَالَتْ: فَاطِمَةُ وَا كَرْبَ أَبَتَاه، فَقَالَ: رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا كَرْبَ عَلَى أَبِيكِ بَعْدَ الْيَوْمِ، إِنَّه قَدْ حَضَرَ مِنْ أَبِيكِ مَا لَيْسَ بِتَارِكٍ مِنْه أَحَدًا، الْمُوَافَاةُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ».

ئەنەسی کوڕی مالیک ﵁ دەڵێت: کاتێك کە پێغەمبەری خوا ﷺ تووشی ناخۆشی و ئازاری مردن بوو لەوەی کە تووشی بوو، فاتیمە گوتی: وای بۆ ئەو ناڕەحەتییەی کە تووشی باوکم بووە، ئینجا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: «لەمڕۆ بەولاوە ئازار و ناڕەحەتی لەسەر باوکت نامێنێت، لەڕاستیدا ئەو شتە ئامادەی بەردەمی باوکتە کە هیچ کەس بەجێ ناهێڵێت، کە گەیشتنە بە ڕۆژی قیامەت».

٢٦٠. عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﵁ قَالَ: قَالَتْ لِي فَاطِمَةُ: يَا أَنَسُ كَيْفَ سَخَتْ أَنْفُسُكُمْ أَنْ تَحْثُوا التُّرَابَ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ؟

ئەنەسی کوڕی مالیک ﵁ دەڵێت: فاتیمە ﵂ پێی گوتم: ئەی ئەنەس، چۆن توانیتان و دەستتان ڕۆیشت کە خۆڵ بکەن بەسەر (لاشەی) پێغەمبەری خوادا ﷺ (لە کاتی ناشتنیدا)؟

٢٦١. عَنْ أَنَسٍ ﵁: أَنَّ فَاطِمَةَ ﵂ قَالَتْ: حِينَ قُبِضَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، وَا أَبَتَاه، إِلَى جِبْرَائِيلَ أَنْعَاه، وَا أَبَتَاه، مِنْ رَبِّه مَا أَدْنَاه، وَا أَبَتَاه، جَنَّةُ الْفِرْدَوْسِ مَأْوَاه، وَا أَبَتَاه أَجَابَ رَبًّا دَعَاه. قَالَ حَمَّادٌ فَرَأَيْتُ ثَابِتًا حِينَ حَدَّثَ بِهذَا الْحَدِيثِ بَكَى حَتَّى رَأَيْتُ أَضْلَاعَه تَخْتَلِفُ.

ئەنەس ﵁ دەگێڕێتەوە: کاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ وەفاتی کرد، فاتیمە ﵂ (بەئارامی و نەرمی) هاواری کرد: ئای باوکە هەواڵی مردنت بە جیبریل دەگەیەنین، ئای باوکە چەند لە پەروەردگاری نزیک بوویەوە، وای باوکە بەهەشتی فیردەوس شوێنی تۆیە، وای باوکە وەڵامی پەروەردگاری دایەوە کاتێك بانگی کرد. حەماد دەڵێت: بینیم سابیت کە ئەو هەواڵەی گێڕایەوە بە جۆرێک گریا تاکوو پەراسووەکانی دەجووڵانەوە.

٢٦٢. عَنْ أَنَسٍ ﵁ قَالَ: لَمَّا كَانَ الْيَوْمُ الَّذِي دَخَلَ فِيه رَسُولُ اللَّهِ ﷺ الْمَدِينَةَ أَضَاءَ مِنْهَا كُلُّ شَيْءٍ، فَلَمَّا كَانَ الْيَوْمُ الَّذِي مَاتَ فِيه أَظْلَمَ مِنْهَا كُلُّ شَيْءٍ، وَمَا

نَفَضْنَا عَنِ النَّبِيِّ ﷺ الْأَيْدِيَ حَتَّى أَنْكَرْنَا قُلُوبَنَا.

ئەنەس ﵁ دەڵێت: لەو ڕۆژەدا کە پێغەمبەری خوا ﷺ تەشریفی هاتە نێو مەدینە هەموو شتێک بە هاتنی ڕووناک بوو و درەوشایەوە، ئینجا لەو ڕۆژەوە کە تێیدا وەفاتی کرد هەموو شتێک تاریک بوو، لە ناشتنی پێغەمبەر ﷺ نەبووینەوە کە دڵەکان گۆڕان و وەک پێشوو نەمان.

٢٦٣. عَنْ أَنَسٍ ﵁ قَالَ: قَالَ أَبُو بَكْرٍ بَعْدَ وَفَاةِ رَسُولِ اللَّه ﷺ لِعُمَرَ: انْطَلِقْ بِنَا إِلَى أُمِّ أَيْمَنَ نَزُورُها، كَمَا كَانَ رَسُولُ اللَّه ﷺ يَزُورُها، قَالَ: فَلَمَّا انْتَهَيْنَا إِلَيْها بَكَتْ، فَقَالَا لَها: مَا يُبْكِيكِ؟ فَمَا عِنْدَ اللَّه خَيْرٌ لِرَسُولِه، قَالَتْ: إِنِّي لَأَعْلَمُ أَنَّ مَا عِنْدَ اللَّه خَيْرٌ لِرَسُولِه، وَلَكِنْ أَبْكِي لِأَنَّ الْوَحْيَ قَدِ انْقَطَعَ مِنَ السَّمَاءِ، قَالَ: فَهَيَّجَتْهُمَا عَلَى الْبُكَاءِ، فَجَعَلَا يَبْكِيَانِ مَعَها.

ئەنەس ﵁ دەڵێت: لەدوای وەفاتی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەبو بەکر بە عومەری گوت: بڕۆ با بچین سەردانی ئوم ئەیمەن بکەین، هەر وەکوو چۆن پێغەمبەری خو ﷺ سەردانی دەکرد، دەڵێت: کاتێک گەیشتینە لای گریا، گوتیان: بۆ دەگریت؟ خۆ ئەوەی کە لەلای خوایە باشترە بۆ پێغەمبەرەکەی، گوتی: منیش دەزانم ئەوەی کە لەلای خوایە باشترە بۆ پێغەمبەرەکەی، بەڵام بۆ پچڕانی وەحی لە ئاسمانەوە دەگریم، گوتی: بەهۆی ئەوەوە هەردووکیانی گریاند، ئیدی وای کرد کە هەردووکیان لەگەڵیدا گریان.

# كِتَابُ الصِّيَامِ

## پەرتووکی ڕۆژوو

### بَابُ مَا جَاءَ فِي فَضْلِ الصِّيَامِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی گەورەیی ڕۆژوو

٢٦٤. عَنْ أَبِي هرَيْرَةَ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه ﷺ: «كُلُّ عَمَلِ ابْنِ آدَمَ يُضَاعَفُ، الْحَسَنَةُ بِعَشْرِ أَمْثَالِها إِلَى سَبْعِمائَةِ ضِعْفٍ إِلَى مَا شَاءَ اللَّه، يَقُولُ اللَّه: إِلَّا الصَّوْمَ؛ فَإِنَّه لِي وَأَنَا أَجْزِي بِه، يَدَعُ شَهوَتَه وَطَعَامَه مِنْ أَجْلِي، لِلصَّائِمِ فَرْحَتَانِ: فَرْحَةٌ عِنْدَ فِطْرِه، وَفَرْحَةٌ عِنْدَ لِقَاءِ رَبِّه، وَلَخُلُوفُ فَمِ الصَّائِمِ أَطْيَبُ عِنْدَ اللَّه مِنْ رِيحِ الْمِسْكِ».

ئەبو هوڕەیرە ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «هەموو کردەوە (چاکەکانی) ئادەمیزاد پاداشتیان بە بەرانبەر دەدرێتەوە، یەک بە دە هەتا یەک بە حەوت سەد بەرانبەر، ئەوەندەی خوا ویستی لەسەر بێت، خوا دەفەرموێت: جگە لە ڕۆژوو، چونکە ڕۆژوو بۆ منە و هەر خۆشم پاداشتی (ڕۆژووەوان) دەدەمەوە، لەبەر من واز لە خواردن و خواردنەوە و ئارەزووی دێنێت، ڕۆژووەوان دوو جار دڵی خۆش دەبێت: یەکەمیان: کاتێك ڕۆژووەکەی دەشکێنێت، دووەمیان: کاتێك دەگات بە دیداری پەروەردگاری (چونکە بە ڕۆژووەکەی فەرمانی خوای بەجێ هێناوە)، وە سوێند بە خوا بۆنی دەمی

ڕۆژووەوان لای خوا لە بۆنی میسک خۆشترە».

٢٦٥. عَنْ سَعِيدِ بْنِ أَبِي هِنْدٍ ﵁: أَنَّ مُطَرِّفًا، مِنْ بَنِي عَامِرِ بْنِ صَعْصَعَةَ، حَدَّثَه أَنَّ عُثْمَانَ بْنَ أَبِي الْعَاصِ الثَّقَفِيَّ دَعَا لَه بِلَبَنٍ يَسْقِيه، فَقَالَ مُطَرِّفٌ: إِنِّي صَائِمٌ، فَقَالَ عُثْمَانُ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّه ﷺ يَقُولُ: «الصِّيَامُ جُنَّةٌ مِنَ النَّارِ، كَجُنَّةِ أَحَدِكُمْ مِنَ الْقِتَالِ».

سەعیدی کوڕی ئەبو هیند ﵁ دەگێڕێتەوە: موتەرریف لە بەنو عامیری کوڕی صەعصەعەوە بۆی گێڕاوەتەوە، عوسمانی کوڕی ئەبو عاصی سەقەفی داوای کرد شیر بۆ موتەرریف بێنن بۆ ئەوەی بیخواتەوە، موتەرریفیش گوتی: من بەڕۆژووم، جا عوسمان گوتی: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: «ڕۆژوو قەڵغانە لە ئاگر، هەر وەکوو قەڵغان و پەناگەی یەکێکتان لە جەنگدا».

## بَابُ مَا جَاءَ فِي فَضْلِ شَهرِ رَمَضَانَ

## باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی گەورەیی مانگی ڕەمەزان



٢٦٦. عَنْ أَبِي هرَيْرَةَ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه ﷺ: «مَنْ صَامَ رَمَضَانَ إِيمَانًا وَاحْتِسَابًا، غُفِرَ لَه مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِه».

ئەبو هوڕەیرە ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «هەر کەسێک مانگی ڕەمەزان بەڕۆژوو بێت، بە جۆرێک بڕوای پێ بێت و چاوەڕوانی پاداشت بێت، لە گوناهەکانی ڕابردووی دەبووردرێت».

٢٦٧. عَنْ أَبِي هرَيْرَةَ ﵁ عَنْ رَسُولِ اللَّه ﷺ قَالَ: «إِذَا كَانَتْ أَوَّلُ لَيْلَةٍ مِنْ رَمَضَانَ، صُفِّدَتِ الشَّيَاطِينُ، وَمَرَدَةُ الْجِنِّ، وَغُلِّقَتْ أَبْوَابُ النَّارِ، فَلَمْ يُفْتَحْ مِنْها بَابٌ، وَفُتِحَتْ أَبْوَابُ الْجَنَّةِ، فَلَمْ يُغْلَقْ مِنْها بَابٌ، وَنَادَى مُنَادٍ: يَا بَاغِيَ الْخَيْرِ أَقْبِلْ، وَيَا بَاغِيَ الشَّرِّ أَقْصِرْ، وَلِلَّه عُتَقَاءُ مِنَ النَّارِ، وَذَلِكَ فِي كُلِّ لَيْلَةٍ».

ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «کاتێك یەکەم شەوی ڕەمەزان دێت، شەیتانەکان و جنۆکە زیانبەخشەکان زنجیر دەکرێن و دوور دەخرێنەوە، وە دەرگاکانی دۆزەخ دادەخرێن و هیچ دەرگایەکیان ناکرێنەوە، وە هەروەها دەرگاکانی بەهەشت دەکرێنەوە و هیچ دەرگایەکیان داناخرێنەوە، جا بانگەوازکارێک بانگەواز دەکات: ئەی ئەو کەسەی بەدوای چاکەدا دەگەڕێیت بەرەو پیری ڕەمەزان وەرە، وە ئەی خراپەکاران واز بهێنن، وە خوا چەندان کەس لە ئاگر ڕزگار دەکات، ئەوەش لە هەموو شەوێکی ڕەمەزاندا دووبارە دەبێتەوە».

## بَابُ مَا جَاءَ فِي صُومُوا لِرُؤْيَتِهِ وَأَفْطِرُوا لِرُؤْيَتِهِ

باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی فەرموودەی: بەڕۆژوو بن و بیشکێنن بە بینینی مانگ

٢٦٨. عَنْ أَبِي هرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه ﷺ: «إِذَا رَأَيْتُمُ الْهِلَالَ فَصُومُوا، وَإِذَا رَأَيْتُمُوه فَأَفْطِرُوا، فَإِنْ غُمَّ عَلَيْكُمْ فَصُومُوا ثَلَاثِينَ يَوْمًا».

ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «ئەگەر مانگتان بینی بەڕۆژوو بن، وە ئەگەر دووبارە مانگتان (لە مانگی شەوالدا) بینی دەست هەڵگرن لە ڕۆژووگرتن، وە ئەگەر هەور بوو نەتانبینی، ئەوە سی ڕۆژ بەڕۆژوو بن».

## بَابُ مَا جَاءَ فِي الصَّوْمِ فِي السَّفَرِ

باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی بەڕۆژووبوون لە گەشتدا

٢٦٩. عَنْ عَائِشَةَ ﷺ قَالَتْ: سَأَلَ حَمْزَةُ الْأَسْلَمِيُّ رَسُولَ اللَّه ﷺ فَقَالَ: إِنِّي أَصُومُ، أَفَأَصُومُ فِي السَّفَرِ؟ فَقَالَ ﷺ: «إِنْ شِئْتَ فَصُمْ، وَإِنْ شِئْتَ فَأَفْطِرْ».

عائیشە ﷺ دەڵێت: حەمزەی ئەسلەمی پرسیاری لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد،

گوتی: من ڕۆژوو دەگرم، ئایا لە گەشتیشدا بەڕۆژوو بم؟ فەرمووی: «ئەگەر ویستت بەڕۆژوو بە، وە ئەگەر ویستت بیشکێنە (بەڕۆژوو مەبە)».

## بَابُ مَا جَاءَ فِي قَضَاءِ رَمَضَانَ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی گێڕانەوەی ڕۆژووی ڕەمەزان

٢٧٠. عَنْ أَبِي سَلَمَةَ ﵁ قَالَ: سَمِعْتُ عَائِشَةَ ﵂ تَقُولُ: إِنْ كَانَ لَيَكُونُ عَلَيَّ الصِّيَامُ مِنْ شَهرِ رَمَضَانَ، فَمَا أَقْضِيه حَتَّى يَجِيءَ شَعْبَانُ.

ئەبو سەلەمە ﵁ دەڵێت: گوێم لە عائیشە ﵂ بوو دەیگوت: ئەگەر ڕۆژووی ڕەمەزانم لەسەر بووایە، هەتا مانگی شەعبان دەهات نەمدەگرتەوە.

## بَابُ مَا جَاءَ فِيمَنْ أَفْطَرَ نَاسِيًا

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی ئەو کەسەی بە لەبیرچوون ڕۆژووی شکاندووە

٢٧١. عَنْ أَبِي هرَيْرَةَ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه ﷺ: «مَنْ أَكَلَ نَاسِيًا وَهوَ صَائِمٌ فَلْيُتِمَّ صَوْمَه، فَإِنَّمَا أَطْعَمَه اللَّه وَسَقَاه».

ئەبو هورەیرە ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «هەر کەسێک لەبیری نەبوو کە بەڕۆژووە، وە شتێکی خوارد، با ڕۆژووەکەی تەواو بکات (نەیشکێنێت)، چونکە خوا ئەو خواردن و خواردنەوەیەی پێ داوە».

٢٧٢. عَنْ أَسْمَاءَ بِنْتِ أَبِي بَكْرٍ ﵄ قَالَتْ: أَفْطَرْنَا عَلَى عَهدِ رَسُولِ اللَّه ﷺ فِي يَوْمِ غَيْمٍ، ثُمَّ طَلَعَتِ الشَّمْسُ، قُلْتُ لِهشَامٍ: أُمِرُوا بِالْقَضَاءِ؟ قَالَ: فَلَا بُدَّ مِنْ ذَلِكَ.

ئەسمائی کچی ئەبو بەکر ﵄ دەڵێت: لە ڕۆژێکی هەوراویدا لە سەردەمی پێغەمبەری

خوا ﷺ ڕۆژوومان شکاند (وایان زانیوە کە خۆرئاوا بووە و کاتی بەربانگە)، پاشان خۆر دەرکەوت، بە هیشامم گوت: ئایا فەرمان بە خەڵک کرا ڕۆژووەکە بگرنەوە؟ گوتی: بێگومان فەرمانیان پێ کراوە کە بیگرنەوە.

## بَابُ مَا جَاءَ فِي الْقُبْلَةِ لِلصَّائِمِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی ماچکردن بۆ ڕۆژووەوان

٢٧٣. عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: يُقَبِّلُ وَهوَ صَائِمٌ، وَأَيُّكُمْ يَمْلِكُ إِرْبَه، كَمَا كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَمْلِكُ إِرْبَه.

عائیشە رضي الله عنها دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ بە زمانی بەڕۆژووەوە خێزانەکانی ماچ دەکرد، وە کامتان دەتوانێت جڵەوی ئارەزووی خۆی بگرێت، هەر وەکوو چۆن پێغەمبەری خوا ﷺ جڵەوی ئارەزووی خۆی دەگرت.

٢٧٤. عَنْ أَبِي هرَيْرَةَ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه ﷺ: «رُبَّ صَائِمٍ لَيْسَ لَه مِنْ صِيَامِه إِلَّا الْجُوعُ، وَرُبَّ قَائِمٍ لَيْسَ لَه مِنْ قِيَامِه إِلَّا السَّهرُ».

ئەبو هورەیرە رضي الله عنه دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «ڕۆژووەوانی وا هەیە کە لە ڕۆژووەکەی هیچی بۆ نامێنێتەوە جگە لە برسییەتی، هەندێك شەونوێژکەر هەیە کە لە شەونوێژەکەی هیچی بۆ نامێنێتەوە جگە لە شەونخوونی».

## بَابُ مَا جَاءَ فِي السُّحُورِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی پارشێوکردن

٢٧٥. عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه ﷺ: «تَسَحَّرُوا؛ فَإِنَّ فِي السُّحُورِ بَرَكَةً».

ئەنەسی کوڕی مالیک ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «پارشێو بکەن، چونکە بێگومان پارشێو بەرەکەتی تێدایە».

## بَابُ مَا جَاءَ فِي تَعْجِيلِ الْإِفْطَارِ

باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی پەلەکردن لە بەربانگکردن

٢٧٦. عَنْ سَهلِ بْنِ سَعْدٍ ﵁: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «لَا يَزَالُ النَّاسُ بِخَيْرٍ مَا عَجَّلُوا الْإِفْطَارَ».

سەهلی کوڕی سەعد ﵁ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: «بەردەوام خەڵک لە خێر و چاکەدان هەتا زوو بەربانگ بکەنەوە».

## بَابُ مَا جَاءَ فِي فَرْضِ الصَّوْمِ مِنَ اللَّيْلِ، وَالْخِيَارِ فِي الصَّوْمِ

باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی نییەتی ڕۆژوو و سەرپشکبوون تێیدا

٢٧٧. عَنْ حَفْصَةَ ﵂ قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّه ﷺ: «لَا صِيَامَ لِمَنْ لَمْ يَفْرِضْه مِنَ اللَّيْلِ».

حەفصە ﵂ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «هەر کەسێک لە شەوەوە نییەتی ڕۆژووگرتنی نەبێت، ئەوە ڕۆژووەکەی بەر ناکەوێت».

## بَابُ مَا جَاءَ فِي صِيَامِ الدَّهرِ

باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی بەڕۆژووبوون بەدرێژایی ساڵ

٢٧٨. عَنْ عَبْدِ اللَّه بْنِ عَمْرٍو ﵄ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه ﷺ: «لَا صَامَ مَنْ صَامَ الْأَبَدَ».

عەبدوڵڵای کوڕی عەمر رضي الله عنهما دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «بەڕۆژوو نەبووە ئەو کەسەی کە ساڵ دوازدە مانگە بەڕۆژوو بێت (واتە: هیچ پاداشتی بۆ نییە)».

## بَابُ مَا جَاءَ فِي صِيَامِ ثَلَاثَةِ أَيَّامٍ مِنْ كُلِّ شَهْرٍ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی بەڕۆژووبوونی سێ ڕۆژ لە هەر مانگێکدا

٢٧٩. عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَصُومُ ثَلَاثَةَ أَيَّامٍ مِنْ كُلِّ شَهْرٍ، قُلْتُ: مِنْ أَيِّهِ؟ قَالَتْ: لَمْ يَكُنْ يُبَالِي مِنْ أَيِّهِ كَانَ.

عائیشە رضي الله عنها دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ هەموو مانگێک سێ ڕۆژ بەڕۆژوو دەبوو، (ڕاوی) گوتم: لە کام بەشی مانگە (واتە: لە سەرەتای یان لە نێوەڕاستی یان لە کۆتایی مانگەکە)؟ گوتی: گوێی پێ نەدەدا لە هەر بەشێکی مانگەکەدا بووبا.

## بَابُ مَا جَاءَ فِي صِيَامِ دَاوُدَ عليه السلام

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی بەڕۆژووبوونی پێغەمبەر داود عليه السلام

٢٨٠. عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو رضي الله عنه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَحَبُّ الصِّيَامِ إِلَى اللَّهِ صِيَامُ دَاوُدَ عليه السلام، فَإِنَّهُ كَانَ يَصُومُ يَوْمًا، وَيُفْطِرُ يَوْمًا، وَأَحَبُّ الصَّلَاةِ إِلَى اللَّهِ صَلَاةُ دَاوُدَ عليه السلام، كَانَ يَنَامُ نِصْفَ اللَّيْلِ، وَيُصَلِّي ثُلُثَهُ، وَيَنَامُ سُدُسَهُ».

عەبدوڵڵای کوڕی عەمر رضي الله عنه دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «پەسندترین ڕۆژوو لەلای خوا ڕۆژووی (پێغەمبەر) داودە عليه السلام، بە جۆرێک ڕۆژێک نا ڕۆژێک بەڕۆژوو دەبوو، پەسندترین نوێژ لەلای خوا نوێژی (پێغەمبەر) داودە عليه السلام، نیوەی شەو دەخەوت، وە یەک لەسەر سێی شەو شەونوێژی دەکرد، وە یەک لەسەر

شەشەکەی دیکەی دەخەوتەوە».

## بَابُ صِيَامِ سِتَّةِ أَيَّامٍ مِنْ شَوَّالٍ

### باسی بەڕۆژووبوونی شەش ڕۆژ لە مانگی شەوالدا

٢٨١. عَنْ ثَوْبَانَ ﵁ مَوْلَى رَسُولِ اللَّه ﷺ، عَنْ رَسُولِ اللَّه ﷺ أَنَّه قَالَ: «مَنْ صَامَ سِتَّةَ أَيَّامٍ بَعْدَ الْفِطْرِ كَانَ تَمَامَ السَّنَةِ، {مَنْ جَاءَ بِالْحَسَنَةِ فَلَه عَشْرُ أَمْثَالِها} الأنعام: ١٦٠».

سەوبان ﵁ خزمەتکاری پێغەمبەری خوا ﷺ لە پێغەمبەری خواوە ﷺ گێڕاویەتەوە، فەرموویەتی: «هەر کەسێک شەش ڕۆژ لەدوای مانگی ڕەمەزان بەڕۆژوو بێت، وەکوو ئەوە وایە تەواوی ساڵەکە بەڕۆژوو بوو بێت، {مَنْ جَاءَ بِالْحَسَنَةِ فَلَه عَشْرُ أَمْثَالِها}، واتە: هەر کەسێک چاکە بکات ئەوە (لە ڕۆژی دواییدا) دە هێندەی چاکەکەی پاداشتی بۆ هەیە».

٢٨٢. عَنْ أَبِي أَيُّوبَ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه ﷺ: «مَنْ صَامَ رَمَضَانَ، ثُمَّ أَتْبَعَه بِسِتٍّ مِنْ شَوَّالٍ، كَانَ كَصَوْمِ الدَّهرِ».

ئەبو ئەییووب ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «هەر کەسێک مانگی ڕەمەزان بەڕۆژوو بێت، پاشان شەش ڕۆژی دیکەش لە مانگی شەوال بەڕۆژوو بێت، وەکوو ئەوە وایە تەواوی ساڵەکە بەڕۆژوو بوو بێت».

## بَابُ فِي صِيَامِ يَوْمٍ فِي سَبِيلِ اللَّه

### باسێك دەربارەی بەڕۆژووبوونی یەک ڕۆژ لەپێناوی خوادا

٢٨٣. عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه ﷺ: «مَنْ صَامَ يَوْمًا فِي

سَبِيلِ اللَّه، بَاعَدَ اللَّه بِذَلِكَ الْيَوْمِ النَّارَ مِنْ وَجْهه سَبْعِينَ خَرِيفًا».

ئەبو سەعیدی خودری ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «هەر کەسێک ڕۆژێک لەپێناوی خوا بەڕۆژوو بێت، خوا بە هۆی ئەو ڕۆژووەوە حەفتا پاییز ئاگر لە ڕووی دوور دەخاتەوە».

## بَابٌ فِي صِيَامِ يَوْمِ الْجُمُعَةِ

## باسێك دەربارەی بەڕۆژووبوون لە ڕۆژی جومعەدا

٢٨٤. عَنْ أَبِي هرَيْرَةَ ﵁ قَالَ: نَهى رَسُولُ اللَّه ﷺ عَنْ صَوْمِ يَوْمِ الْجُمُعَةِ إِلَّا بِيَوْمٍ قَبْلَه، أَوْ يَوْمٍ بَعْدَه.

ئەبو هورەیرە ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ بەڕۆژووبوونی ڕۆژی هەینی قەدەغە کردووە، تەنها مەگەر ڕۆژێک پێشی یان ڕۆژێک دوایی بەڕۆژوو بێت.

## بَابُ مَا جَاءَ فِي صِيَامِ يَوْمِ السَّبْتِ

## باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی بەڕۆژووبوون لە ڕۆژی شەممەدا

٢٨٥. عَنْ عَبْدِ اللَّه بْنِ بُسْرٍ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه ﷺ: «لَا تَصُومُوا يَوْمَ السَّبْتِ إِلَّا فِيمَا افْتُرِضَ عَلَيْكُمْ، فَإِنْ لَمْ يَجِدْ أَحَدُكُمْ إِلَّا عُودَ عِنَبٍ، أَوْ لِحَاءَ شَجَرَةٍ فَلْيَمُصَّه».

عەبدوڵڵای کوڕی بوسر ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «لە ڕۆژی شەممەدا بەڕۆژوو مەبن، مەگەر ئەو ڕۆژووانەی لەسەرتان واجبە بکەوێتە ئەو ڕۆژەوە (واتە: مانگی ڕەمەزان)، ئەگەر کەسێک هیچی دەست نەکەوت تەنیا لاسکەمێو یان توێکڵی دار نەبێت، ئەوە با بیمژێت».

## بَابُ صِيَامِ يَوْمِ عَرَفَةَ

### باسی ڕۆژووگرتنی ڕۆژی عەرەفە

٢٨٦. عَنْ أَبِي قَتَادَةَ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه ﷺ: «صِيَامُ يَوْمِ عَرَفَةَ، إِنِّي أَحْتَسِبُ عَلَى اللَّه أَنْ يُكَفِّرَ السَّنَةَ الَّتِي قَبْلَه، وَالَّتِي بَعْدَه».

ئەبو قەتادە رضي الله عنه دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «بەڕۆژووبوونی ڕۆژی عەرەفە، من ئومێدەوارم کە خوا بەهۆیەوە لە گوناهی ساڵێک پێش خۆی و ساڵێک دوای خۆی خۆش بێت».

## بَابُ صِيَامِ يَوْمِ عَاشُورَاءَ

### باسی ڕۆژووگرتنی ڕۆژی عاشووڕاء

٢٨٧. عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قَالَ: قَدِمَ النَّبِيُّ ﷺ الْمَدِينَةَ، فَوَجَدَ الْيَهودَ صُيَّامًا، فَقَالَ: «مَا هذَا؟»، قَالُوا: هذَا يَوْمٌ أَنْجَى اللَّه فِيه مُوسَى، وَأَغْرَقَ فِيه فِرْعَوْنَ، فَصَامَه مُوسَى شُكْرًا، فَقَالَ رَسُولُ اللَّه ﷺ: «نَحْنُ أَحَقُّ بِمُوسَى مِنْكُمْ، فَصَامَه، وَأَمَرَ بِصِيَامِه».

ئیبن عەبباس رضي الله عنهما دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ کاتێك هات بۆ مەدینە، تەماشای کرد جووولەکەکان بەڕۆژوو بوون، جا فەرمووی: «ئەم ڕۆژووە چییە؟»، گوتیان: ئەمە ئەو ڕۆژەیە کە خوا مووسای تێدا ڕزگار کرد، وە هەر لەو ڕۆژەشدا فیرعەونی نغرۆ کرد، جا مووسا وەکوو سوپاسگوزاری لەو ڕۆژەدا بەڕۆژوو دەبوو، ئینجا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: «ئێمە لە ئێوە لەپێشترین بۆ مووسا، جا هەم بۆ خۆی بەڕۆژوو بوو هەم فەرمانیشی کرد بە موسوڵمانان کە ئەم ڕۆژە بەڕۆژوو بن».

٢٨٨. عَنْ أَبِي قَتَادَةَ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «صِيَامُ يَوْمِ عَاشُورَاءَ، إِنِّي أَحْتَسِبُ عَلَى اللَّهِ أَنْ يُكَفِّرَ السَّنَةَ الَّتِي قَبْلَه».

ئەبو قەتادە ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «بەڕۆژووبوونی ڕۆژی عاشووڕاء، ئومێدەوارم کە خوا بە هۆیەوە لە گوناهی ساڵێک پێش خۆی خۆش بێت».

## بَابُ صِيَامِ يَوْمِ الِاثْنَيْنِ وَالْخَمِيسِ

### باسی بەڕۆژووبوون لە ڕۆژانی دووشەممە و پێنجشەممەدا

٢٨٩. عَنْ أَبِي هرَيْرَةَ ﵁: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يَصُومُ الِاثْنَيْنِ وَالْخَمِيسَ، فَقِيلَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّكَ تَصُومُ الِاثْنَيْنِ وَالْخَمِيسَ؟ فَقَالَ: «إِنَّ يَوْمَ الِاثْنَيْنِ وَالْخَمِيسَ يَغْفِرُ اللَّهُ فِيهِمَا لِكُلِّ مُسْلِمٍ، إِلَّا مُتَهَاجِرَيْنِ، يَقُولُ: دَعْهمَا حَتَّى يَصْطَلِحَا».

ئەبو هوڕەیرە ﵁ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ دووشەممە و پێنجشەممان بەڕۆژوو دەبوو، جا گوترا: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ تۆ ڕۆژانی دووشەممە و پێنجشەممە بەڕۆژوو دەبیت؟! فەرمووی: «بەڕاستی لە ڕۆژانی دووشەممە و پێنجشەممەدا خوا لە هەموو موسوڵمانێک خۆش دەبێت، تەنیا ئەوانە نەبێت کە دەنگیان لەیەک بڕیوە، خوا دەفەرموێت: وازیان لێ بێنن (کار و کردەوەیان ڕابگرن) تاوەکوو ئاشت دەبنەوە».

## بَابُ فِي ثَوَابِ مَنْ فَطَّرَ صَائِمًا

### باسێك دەربارەی پاداشتی کەسێک کە ڕۆژووەوانێک لەلای ڕۆژوو دەشکێنێت

٢٩٠. عَنْ زَيْدِ بْنِ خَالِدٍ الْجُهَنِيِّ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ فَطَّرَ صَائِمًا كَانَ

لَه مِثْلُ أَجْرِهِمْ، مِنْ غَيْرِ أَنْ يَنْقُصَ مِنْ أُجُورِهِمْ شَيْئًا».

زەیدی کوڕی خالیدی جوهەنی ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «هەر کەسێک خواردن و خۆراکی ڕۆژووەوانێک بدات، بەئەندازەی ڕۆژووی ڕۆژووەوانەکە پاداشتی بۆ دەنووسرێت، بەبێ ئەوەی هیچ شتێک لە پاداشتی ئەوان کەم ببێتەوە».

٢٩١.عَنْ عَبْدِ اللَّه بْنِ الزُّبَيْرِ ﷺ قَالَ: أَفْطَرَ رَسُولُ اللَّه ﷺ عِنْدَ سَعْدِ بْنِ مُعَاذٍ، فَقَالَ: «أَفْطَرَ عِنْدَكُمُ الصَّائِمُونَ، وَأَكَلَ طَعَامَكُمُ الْأَبْرَارُ، وَصَلَّتْ عَلَيْكُمُ الْمَلَائِكَةُ».

عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیر ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ لەلای سەعدی کوڕی موعاز بەربانگی کردەوە، ئینجا فەرمووی: «ڕۆژووەوانان لەلای ئێوە بەربانگیان بکەنەوە، چاکەکاران لە خواردنی ئێوە بخۆن و فریشتەکان دووعای چاکەتان بۆ بکەن».

## بَابٌ فِي الْأَكْلِ يَوْمَ الْفِطْرِ قَبْلَ أَنْ يَخْرُجَ

باسێك دەربارەی خواردن لە ڕۆژی جەژنی ڕەمەزاندا پێش دەرچوون لە ماڵ

٢٩٢.عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ لَا يَخْرُجُ يَوْمَ الْفِطْرِ حَتَّى يَطْعَمَ تَمَرَاتٍ.

ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ لە ڕۆژی جەژنی ڕەمەزاندا لە ماڵ دەرنەدەچوو تاوەکوو چەند دەنکە خورمایەکی دەخوارد.

## بَابُ مَنْ مَاتَ وَعَلَيْهِ صِيَامٌ مِنْ نَذْرٍ

باسی کەسێک مردبێت و ڕۆژووی ڕەمەزانی<br>قەرزدار بێت، بەکەمتەرخەمی نەیگرتبێت

٢٩٣.عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ قَالَ: جَاءَتِ امْرَأَةٌ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّه إِنَّ

أُخْتِي مَاتَتْ وَعَلَيْها صِيَامُ شَهرَيْنِ مُتَتَابِعَيْنِ، قَالَ: «أَرَأَيْتِ لَوْ كَانَ عَلَى أُخْتِكِ دَيْنٌ، أَكُنْتِ تَقْضِينه؟»، قَالَتْ: بَلَى، قَالَ: «فَحَقُّ اللهِ أَحَقُّ».

ئیبن عەبباس رضي الله عنهما دەڵێت: ئافرەتێک هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ، گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا خوشکەکەم مردووە و ڕۆژووی دوو مانگی لەدوای یەکی لەسەرە، فەرمووی: «ئایا ئەگەر خوشکەکەت قەرزێکی لەسەر بایە لەجیاتی ئەو دەتدایەوە؟»، گوتی: بەڵێ، فەرمووی: «جا هەقی خوا لەپێشترە بدرێتەوە».

## بَابٌ فِي الْمَرْأَةِ تَصُومُ بِغَيْرِ إِذْنِ زَوْجِها

### باسی بەڕۆژووبوونی ئافرەت بەبێ مۆڵەتی مێردەکەی

٢٩٤. عَنْ أَبِي هرَيْرَةَ رضي الله عنه عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «لَا تَصُومُ الْمَرْأَةُ وَزَوْجُها شَاهِدٌ يَوْمًا مِنْ غَيْرِ شَهرِ رَمَضَانَ إِلَّا بِإِذْنِه».

ئەبو هورەیرە رضي الله عنه دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: «ئەگەر ئافرەت مێردەکەی لە ماڵەوە بێت، بۆی نییە بەبێ مۆڵەتی ئەو بەڕۆژوو بێت (ڕۆژووی سوننەت)، جگە لە مانگی ڕەمەزان».

## بَابٌ فِيمَنْ قَالَ: الطَّاعِمُ الشَّاكِرُ كَالصَّائِمِ الصَّابِرِ

### باسێك دەربارەی فەرمایشتی: ئەوەی بەڕۆژوو نییە و سوپاسگوزارە وەك ڕۆژووەوانێکی ئارامگرە

٢٩٥. عَنْ سِنَانِ بْنِ سَنَّةَ الْأَسْلَمِيِّ رضي الله عنه صَاحِبِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: «الطَّاعِمُ الشَّاكِرُ لَه مِثْلُ أَجْرِ الصَّائِمِ الصَّابِرِ».

سینانی کوڕی سەنەی ئەسلەمی رضي الله عنه هاوەڵی پێغەمبەر ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خو

ﷺ فەرموویەتی: «ئەو کەسەی کە لەسەر خواردن سوپاس و ستاییشی خوا دەکات، پاداشتی وەک ئەو کەسەیە کە بەڕۆژوو دەبێت و ئارام دەگرێت لەسەری».

## بَابُ مَا جَاءَ فِي الِاعْتِكَافِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی ئیعتیکاف

٢٩٦. عَنْ أَبِي هرَيْرَةَ ؓ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ، يَعْتَكِفُ كُلَّ عَامٍ عَشَرَةَ أَيَّامٍ، فَلَمَّا كَانَ الْعَامُ الَّذِي قُبِضَ فِيه اعْتَكَفَ عِشْرِينَ يَوْمًا، وَكَانَ يُعْرَضُ عَلَيْه الْقُرْآنُ فِي كُلِّ عَامٍ مَرَّةً، فَلَمَّا كَانَ الْعَامُ الَّذِي قُبِضَ فِيه عُرِضَ عَلَيْه مَرَّتَيْنِ.

ئەبو هورەیرە ؓ دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ هەموو ساڵێک دە ڕۆژ لە مزگەوتدا دەمایەوە، بەڵام لەو ساڵەدا کە کۆچی دوایی کرد بیست ڕۆژ مایەوە، هەروەها ساڵی جارێک دەوری قوڕئانی پێ دەکرایەوە (لەلایەن جیبریلەوە)، بەڵام ئەو ساڵەی کە کۆچی دوایی کرد، دوو جار دەوری قوڕئانی پێ کرایەوە.

٢٩٧. عَنْ أُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ ؓ: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يَعْتَكِفُ الْعَشْرَ الْأَوَاخِرَ مِنْ رَمَضَانَ، فَسَافَرَ عَامًا، فَلَمَّا كَانَ مِنَ الْعَامِ الْمُقْبِلِ اعْتَكَفَ عِشْرِينَ يَوْمًا.

ئوبەی کوڕی کەعب ؓ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ لە دە ڕۆژی کۆتایی مانگی ڕەمەزاندا دەمایەوە، ساڵێکیان (لە مانەوەیدا) گەشتی کرد، جا لە ساڵی دواتردا بیست ڕۆژ مایەوە.

## بَابُ الِاعْتِكَافِ فِي خَيْمَةِ الْمَسْجِدِ

### باسی ئیعتیکافکردن لە چادری مزگەوتدا

٢٩٨. عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ؓ: أَنَّ رَسُولَ اللّٰه ﷺ: اعْتَكَفَ فِي قُبَّةٍ تُرْكِيَّةٍ، عَلَى

سُدَّتِها قِطْعَةُ حَصِيرٍ، قَالَ: فَأَخَذَ الحَصِيرَ بِيَدِه، فَنَحَّاها فِي نَاحِيَةِ الْقُبَّةِ، ثُمَّ أَطْلَعَ رَأْسَه فكَلَّمَ النَّاسَ.

ئەبو سەعیدی خودری ﵁ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ لەنێو چادرێکی تورکیدا دەمایەوە کە پارچە حەسیرێک لەسەر دەرگاکەی دانرابوو (بۆ ئەوەی خەڵکی نەیبینێت)، (ڕاوی) دەڵێت: جا پێغەمبەر ﷺ حەسیرەکەی هەڵگرت و لە گۆشەیەکی چادرەکەی دانا، پاشان سەری هێنایە دەرەوە و قسەی بۆ خەڵکەکە کرد.

## بَابٌ فِي الْمُعْتَكِفِ يَزُورُه أَهلُه فِي الْمَسْجِدِ

### باسێك دەربارەی ئەو کەسەی لە ئیعتیکافە لە مزگەوت و خێزانی سەردانی دەکات

٢٩٩. عَنْ صَفِيَّةَ بِنْتِ حُيَيٍّ ﵂ زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ: أَنَّها جَاءَتْ إِلَى رَسُولِ اللَّه ﷺ تَزُورُه وَهوَ مُعْتَكِفٌ فِي الْمَسْجِدِ فِي الْعَشْرِ الْأَوَاخِرِ مِنْ شَهرِ رَمَضَانَ، فَتَحَدَّثَتْ عِنْدَه سَاعَةً مِنَ الْعِشَاءِ، ثُمَّ قَامَتْ تَنْقَلِبُ، فَقَامَ مَعَها رَسُولُ اللَّه ﷺ يَقْلِبُها، حَتَّى إِذَا بَلَغَتْ بَابَ الْمَسْجِدِ الَّذِي كَانَ عِنْدَ مَسْكَنِ أُمِّ سَلَمَةَ، زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ، فَمَرَّ بِهمَا رَجُلَانِ مِنَ الْأَنْصَارِ، فَسَلَّمَا عَلَى رَسُولِ اللَّه ﷺ، ثُمَّ نَفَذَا، فَقَالَ لَهمَا رَسُولُ اللَّه ﷺ، «عَلَى رِسْلِكُمَا، إِنَّها صَفِيَّةُ بِنْتُ حُيَيٍّ»، قَالَا: سُبْحَانَ اللَّه يَا رَسُولَ اللَّه وَكَبُرَ عَلَيْهمَا ذَلِكَ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّه ﷺ: «إِنَّ الشَّيْطَانَ يَجْرِي مِنَ ابْنِ آدَمَ مَجْرَى الدَّمِ، وَإِنِّي خَشِيتُ أَنْ يَقْذِفَ فِي قُلُوبِكُمَا شَيْئًا».

صەفیەی کچی حویەی ﵂ خێزانی پێغەمبەر ﷺ دەگێڕێتەوە: سەردانی پێغەمبەری خوای ﷺ کرد لە کاتێکدا کە پێغەمبەر ﷺ لەنێو مزگەوتدا لە دە ڕۆژی کۆتایی ڕەمەزاندا لە خەڵوەکێشاندا بوو، جا ماوەیەک لە شەو قسەی لەگەڵ کرد، پاشان هەڵسا کە بگەڕێتەوە، ئینجا پێغەمبەری خوا ﷺ هەڵسا بۆ ئەوەی بیگەڕێنێتەوەماڵەوە،

تا گەیشتە ئەو دەرگایەی مزگەوت کە کەوتبووە لای شوێنی مانەوەی ئوم سەلەمەی خێزانی پێغەمبەر ﷺ، لەو کاتەدا دوو پیاو لە ئەنصارِ بەلایاندا تێپەڕین و سەلامیان لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد، پاشان بەخێرایی تێپەڕین، ئینجا پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموون: «هێواش بن بوەستن ئەوە صەفیەی کچی حویەیە (لەگەڵمدایە)»، گوتیان: پاکی و بێگەردی بۆ خوا، ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، ئەو قسەیان بەلاوە قورس بوو (چونکە وایان زانی کە پێغەمبەر ﷺ پێی وایە کە گومانی خراپی پێ دەبەن)، ئینجا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: «بێگومان شەیتان بەنێو لاشەی مرۆڤدا هاتوچۆ دەکات وەک هاتن و چوونی خوێن، منیش ترسام کە شتێک لە ناختاندا دروست ببێت».

# كِتَابُ الزَّكَاةِ

## پەرتووکی زەکات

### بَابُ فَرْضِ الزَّكَاةِ

### باسی فەڕزی زەکات

٣٠٠. عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ بَعَثَ مُعَاذًا إِلَى الْيَمَنِ، فَقَالَ: «إِنَّكَ تَأْتِي قَوْمًا أَهلَ كِتَابٍ، فَادْعُهمْ إِلَى شَهادَةِ أَنْ لَا إِلَه إِلَّا اللَّه، وَأَنِّي رَسُولُ اللَّه، فَإِنْ همْ أَطَاعُوا لِذَلِكَ، فَأَعْلِمْهمْ أَنَّ اللَّه افْتَرَضَ عَلَيْهمْ خَمْسَ صَلَوَاتٍ فِي كُلِّ يَوْمٍ وَلَيْلَةٍ، فَإِنْ همْ أَطَاعُوا لِذَلِكَ، فَأَعْلِمهمْ أَنَّ اللَّه افْتَرَضَ عَلَيْهمْ صَدَقَةً فِي أَمْوَالِهمْ، تُؤْخَذُ مِنْ أَغْنِيَائِهمْ فَتُرَدُّ فِي فُقَرَائِهمْ، فَإِنْ همْ أَطَاعُوا لِذَلِكَ، فَإِيَّاكَ وَكَرَائِمَ أَمْوَالِهمْ، وَاتَّقِ دَعْوَةَ الْمَظْلُومِ؛ فَإِنَّها لَيْسَ بَيْنَها وَبَيْنَ اللَّه حِجَابٌ».

ئیبن عەبباس رضي الله عنهما دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ موعازی کوڕی جەبەلی نارد بۆ یەمەن پێی فەرموو: «تۆ دەچییە لای خەڵکێک خاوەن کتێبی ئاسمانین، سەرەتا داوایان لێ بکە کە شایەتی بدەن هیچ پەرستراوێکی بەهەق نییە جگە لە خوا، منیش پێغەمبەر و نێردراوی ئەوم، ئەگەر لەوەدا گوێڕایەڵ بوون، جا پێیان بڵێ: خودا لە هەر شەو و ڕۆژێکدا پێنج نوێژی لەسەریان واجب کردووە، ئەگەر لەوەشدا گوێڕایەڵ

بوون، پێیان بڵێ: خودا زەکاتی لەسەریان واجب کردووە کە لە دەوڵەمەندەکانیان وەردەگیرێت و دەدرێتەوە بە هەژارەکانیان، ئەگەر لەوەشدا گوێڕایەڵ بوون، نەکەیت بچیت نایابی ماڵەکانیان هەڵبژێریت و لەبری زەکات وەریبگریت، وە خۆشت بپارێزە لە نزای ستەملێکراو، چونکە بەڕاستی نزای ستەملێکراو هیچ شتێک پێشی پێ ناگرێت تاکوو خۆی دەگەیەنێتە بارەگای پەروەردگار (پەردە لە نێوانی پاڕانەوەی ستەملێکراو و خوادا نییە)».

## بَابُ مَا جَاءَ فِي مَنْعِ الزَّكَاةِ

## باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی نەدانی زەکات

٣٠١. عَنْ عَبْدِ اللَّه بْنِ مَسْعُودٍ ﵁ عَنْ رَسُولِ اللَّه ﷺ قَالَ: «مَا مِنْ أَحَدٍ لَا يُؤَدِّي زَكَاةَ مَالِه، إِلَّا مُثِّلَ لَه يَوْمَ الْقِيَامَةِ شُجَاعًا أَقْرَعَ حَتَّى يُطَوِّقَ عُنُقَه»، ثُمَّ قَرَأَ عَلَيْنَا رَسُولُ اللَّه ﷺ مِصْدَاقَه مِنْ كِتَابِ اللَّه تَعَالَى: «{وَلَا يَحْسَبَنَّ الَّذِينَ يَبْخَلُونَ بِمَا آتَاهُمُ اللَّهُ مِنْ فَضْلِهِ} آل عمران: ١٨٠، الْآيَةَ».

عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود ﵁ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «هەر کەسێک زەکاتی ماڵەکەی نەدات، لە ڕۆژی دواییدا ماڵەکەی بۆ دەکرێت بە مارێکی کەچەڵی ژەهراوی، تاکوو خۆی لە ملی دەئاڵێنێت»، پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ وەکوو بەڕاستدانانی فەرماییشتەکەی لە کتێبی خوا ئەم ئایەتەی خوێندەوە: «{وَلَا يَحْسَبَنَّ الَّذِينَ يَبْخَلُونَ بِمَا آتَاهُمُ اللَّهُ مِنْ فَضْلِهِ}، واتە: هەرگیز وا گومان نەبەن ئەو کەسانەی کە چروکی دەکەن بەوەی کە خوا پێی بەخشیوون لە ڕێز و بەهرەی خۆی».

٣٠٢. عَنْ أَبِي ذَرٍّ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه ﷺ: «مَا مِنْ صَاحِبِ إِبِلٍ، وَلَا غَنَمٍ، وَلَا بَقَرٍ، لَا يُؤَدِّي زَكَاتَها، إِلَّا جَاءَتْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ أَعْظَمَ مَا كَانَتْ وَأَسْمَنَه، تَنْطَحُه بِقُرُونِها، وَتَطَؤُه بِأَخْفَافِها، كُلَّمَا نَفِدَتْ أُخْرَاها، عَادَتْ عَلَيْه أُولَاها، حَتَّى يُقْضَى بَيْنَ النَّاسِ».

ئەبو زەر ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «هەر کەسێک مەڕ و بزن و مانگا و وشتری هەبێت و زەکاتیان لێ نەدات، لە ڕۆژی دواییدا ئەوانە دەهێنرێن کە لەوەی دونیا بەهێزترن و قەڵەوتریشن، جا لە خاوەنەکانیان هەڵدەدەن و بە شاخەکانیان و سمەکانیان دەیشێلن، هەر کاتێك کۆتا دانەیان بەسەریدا تێدەپەڕێت یەکەمەکەیان دەگەڕێتەوە سەری، هەتا ئەو کاتەی کە خوا دادوەری دەکات لە نێوان خەڵکدا».

## بَابُ زَكَاةِ الْوَرِقِ وَالذَّهبِ

### باسی زەکاتی زێڕ و زیو

٣٠٣. عَنِ ابْنِ عُمَرَ وَعَائِشَةَ ﷺ: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ، كَانَ يَأْخُذُ مِنْ كُلِّ عِشْرِينَ دِينَارًا فَصَاعِدًا نِصْفَ دِينَارٍ، وَمِنَ الْأَرْبَعِينَ دِينَارًا دِينَارًا.

ئیبن عومەر و عائیشە ﷺ دەگێڕنەوە، پێغەمبەر ﷺ لە هەر بیست دینارێک نیو دیناری (وەکوو زەکات) وەردەگرت، لە هەر چل دینار دینارێکی (وەکوو زەکات) وەردەگرت.

## بَابُ مَا تَجِبُ فِيه الزَّكَاةُ مِنَ الْأَمْوَالِ

### باسی ئەو ماڵ و سامانەی زەکاتیان تێدایە

٣٠٤. عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ: أَنَّه سَمِعَ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ: «لَا صَدَقَةَ فِيمَا دُونَ خَمْسَةِ أَوْسَاقٍ مِنَ التَّمْرِ، وَلَا فِيمَا دُونَ خَمْسِ أَوَاقٍ، وَلَا فِيمَا دُونَ خَمْسٍ مِنَ الْإِبِلِ».

ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەگێڕێتەوە: گوێی لێ بوو پێغەمبەر ﷺ دەیفەرموو: «خورما تاوەکوو ئەندازەی نەگاتە پێنج ویسق زەکاتی تێدا نییە، زیو تاوەکوو ئەندازەی نەگاتە پێنج ئۆقیە زەکاتی تێدا نییە، وشتر ئەگەر ژمارەی لە پێنج کەمتر

بێت زەکاتی تێدا نییە».

## بَابُ صَدَقَةِ الْبَقَرِ

### باسی زەکاتی مانگا

٣٠٥. عَنْ مُعَاذِ بْنِ جَبَلٍ ﷺ قَالَ: بَعَثَنِي رَسُولُ اللّٰه ﷺ إِلَى الْيَمَنِ، وَأَمَرَنِي أَنْ آخُذَ مِنَ الْبَقَرِ، مِنْ كُلِّ أَرْبَعِينَ مُسِنَّةً، وَمِنْ كُلِّ ثَلَاثِينَ تَبِيعًا، أَوْ تَبِيعَةً.

موعازی کوڕی جەبەل ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ ناردمی بۆ یەمەن و فەرمانی پێ کردم کە لە زەکاتی مانگادا لە هەر چل سەر مێیینەیەکی دووساڵە و لە هەر سی سەر نێرینە یان مێیینەیەکی یەکساڵە وەربگرم.

## بَابُ صَدَقَةِ الْغَنَمِ

### باسی زەکاتی مەڕ و بزن

٣٠٦. عَنْ سَالِمِ بْنِ عَبْدِ اللّٰه، عَنْ أَبِيه ﷺ: عَنْ رَسُولِ اللّٰه ﷺ قَالَ: أَقْرَأَنِي سَالِمٌ كِتَابًا كَتَبَه رَسُولُ اللّٰه ﷺ فِي الصَّدَقَاتِ، قَبْلَ أَنْ يَتَوَفَّاه اللّٰه، فَوَجَدْتُ فِيه: «فِي أَرْبَعِينَ شَاةً شَاةٌ إِلَى عِشْرِينَ وَمِائَةٍ، فَإِذَا زَادَتْ وَاحِدَةً، فَفِيها شَاتَانِ إِلَى مِائَتَيْنِ، فَإِنْ زَادَتْ وَاحِدَةً، فَفِيها ثَلَاثُ شِيَاه إِلَى ثَلَاثِمِائَةٍ، فَإِذَا كَثُرَتْ، فَفِي كُلِّ مِائَةٍ شَاةٌ»، وَوَجَدْتُ فِيه: «لَا يُجْمَعُ بَيْنَ مُتَفَرِّقٍ، وَلَا يُفَرَّقُ بَيْنَ مُجْتَمِعٍ»، وَوَجَدْتُ فِيه: «لَا يُؤْخَذُ فِي الصَّدَقَةِ تَيْسٌ، وَلَا هرِمَةٌ، وَلَا ذَاتُ عَوَارٍ».

(ئیبن شیهاب دەڵێ) سالیمی کوڕی عەبدوڵلا لە باوکیەوە ﷺ دەگێڕێتەوە: لە پێغەمبەری خواوە ﷺ گێڕاویەتیەوە و گوتوویەتی: سالیم نووسراوێکی بۆ خوێندمەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ نووسیبووی دەربارەی زەکاتدان پێش ئەوەی

وەفات بکات، لە نووسراوەکەدا ئەوە هاتبوو: «لە چل سەر مەڕ و بزن تاوەکوو سەد و بیست سەر، مەڕێک زەکاتە، ئەگەر یەک سەر زیادی کرد تاوەکوو دوو سەد سەر دوو مەڕ زەکاتە، جا ئەگەر یەک سەر زیادی کرد تاوەکوو سێ سەد سەر سێ مەڕ زەکاتە، وە ئەگەر لەوە زیاتر بوو هەر سەد سەرێك مەڕێک زەکاتیەتی»، وە ئەوەشی تێدا هاتبوو: «نابێت ئاژەڵی جیا کۆ بکرێتەوە، ناشبێت کۆمەڵێک جیا بکرێتەوە، وە ئەوەشی تێدا نووسرابوو: نێری و پیر و عەیبدار وەرناگیرێت».

## بَابُ صَدَقَةِ الزُّرُوعِ وَالثِّمَارِ

### باسی زەکاتی کشتوکاڵ و میوە

٣٠٧. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «فِيمَا سَقَتِ السَّمَاءُ وَالْعُيُونُ الْعُشْرُ، وَفِيمَا سُقِيَ بِالنَّضْحِ نِصْفُ الْعُشْرِ».

ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «ئەوەی کە بە باران و سەرچاوە سروشتییەکان ئاو دەدرێت دەیەکی زەکات لێ دەکەوێت، ئەوەشی کە مرۆڤ ئاوی دەدات نیوەی دەیەکی زەکات لێ دەکەوێت».

## بَابُ صَدَقَةِ الْفِطْرِ

### باسی سەرفیترە

٣٠٨. عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ قَالَ: فَرَضَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ صَدَقَةَ الْفِطْرِ صَاعًا مِنْ شَعِيرٍ، أَوْ صَاعًا مِنْ تَمْرٍ، عَلَى كُلِّ حُرٍّ أَوْ عَبْدٍ، ذَكَرٍ أَوْ أُنْثَى مِنَ الْمُسْلِمِينَ.

ئیبن عومەر ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ مەنێک خورما، یان مەنێک جۆ سەرفترەی دانا لەسەر هەموو موسوڵمانێك، ئیتر بەندە بێت یان ئازاد بێت، نێر بێت یان مێ.

## بَابُ الصَّدَقَةِ عَلَى ذِي قَرَابَةٍ

### باسی زەكاتدان بە خزم و كەسی نزیک

٣٠٩. عَنْ زَيْنَبَ امْرَأَةِ عَبْدِ اللَّه ﵄ قَالَتْ: سَأَلْتُ رَسُولَ اللَّه ﷺ: أَيُجْزِئُ عَنِّي مِنَ الصَّدَقَةِ النَّفَقَةُ عَلَى زَوْجِي، وَأَيْتَامٍ فِي حِجْرِي؟ قَالَ رَسُولُ اللَّه ﷺ: «لَها أَجْرَانِ: أَجْرُ الصَّدَقَةِ، وَأَجْرُ الْقَرَابَةِ».

زەینەبی خێزانی عەبدوڵڵا ﵄ دەڵێت: پرسیارم لە پێغەمبەری خوا ﷺ كرد ئایا دروستە كە لە زەكاتەكەم خەرجی ژیانی پیاوەكەم و ئەو هەتیوانەش كە لە ماڵی منن بكێشم؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: «دوو پاداشتی هەیە، یەكیان هیی دەركردنی زەكاتەكە، یەكیشیان هیی بەجێگەیاندنی پەیوەندیی خزمایەتی».

## بَابُ مَنْ سَأَلَ عَنْ ظَهرِ غِنًى

### باسی كەسێک كە دەوڵەمەند بێت و داواش لە خەڵک بكات

٣١٠. عَنْ أَبِي هرَيْرَةَ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه ﷺ: «مَنْ سَأَلَ النَّاسَ أَمْوَالَهمْ تَكَثُّرًا، فَإِنَّمَا يَسْأَلُ جَمْرَ جَهنَّمَ، فَلْيَسْتَقِلَّ مِنْه أَوْ لِيُكْثِرْ».

ئەبو هورەیرە ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «هەر كەس داوای ماڵ لە خەڵكی بكات بۆ ئەوەی ماڵی خۆی پێ زیاتر بكات (واتە پێویستیی پێ نەبێت)، داوای پشكۆی ئاگری دۆزەخ دەكات، جا با (ئاگری دۆزەخ بۆ خۆی) كەم بكاتەوە، یان با زۆری بكات».

## بَابُ مَنْ تَحِلُّ لَه الصَّدَقَةُ

### باسی ئەو کەسەی شاییستەی زەکاتپێدانە

٣١١. عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه ﷺ: «لَا تَحِلُّ الصَّدَقَةُ لِغَنِيٍّ إِلَّا لِخَمْسَةٍ: لِعَامِلٍ عَلَيْهَا، أَوْ لِغَازٍ فِي سَبِيلِ اللَّه، أَوْ لِغَنِيٍّ اشْتَرَاهَا بِمَالِه، أَوْ فَقِيرٍ تُصُدِّقَ عَلَيْه فَأَهْدَاهَا لِغَنِيٍّ، أَوْ غَارِمٍ».

ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «دەوڵەمەند زەکاتی پێ ناشێت مەگەر لەم پێنج کەسە بێت: بۆ ئەو کەسەی کە کاری کۆکردنەوەی زەکات دەکات، یان ئەو کەسەی کە غەزا دەکات لە ڕێی خوادا، یان ئەو کەسەی کە بە پارەی خۆی زەکاتەکە دەکڕێتەوە، یان هەژارێک زەکاتی پێ بدرێت و ئەویش بە دیاری بیداتە دەوڵەمەندێک، یان قەرزدار بێت (بە جۆرێک کە ئەگەر قەرزەکانی بداتەوە بەئەندازەی نیصابی زەکات پارەی نەمێنێت)».

## بَابُ فَضْلِ الصَّدَقَةِ

### باسی گەورەیی بەخشین

٣١٢. عَنْ عَدِيِّ بْنِ حَاتِمٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه ﷺ: «مَا مِنْكُمْ مِنْ أَحَدٍ إِلَّا سَيُكَلِّمُه رَبُّه، لَيْسَ بَيْنَه وَبَيْنَه تَرْجُمَانٌ، فَيَنْظُرُ أَمَامَه فَتَسْتَقْبِلُه النَّارُ، وَيَنْظُرُ عَنْ أَيْمَنَ مِنْه فَلَا يَرَى إِلَّا شَيْئًا قَدَّمَه، وَيَنْظُرُ عَنْ أَشْأَمَ مِنْه فَلَا يَرَى إِلَّا شَيْئًا قَدَّمَه، فَمَنِ اسْتَطَاعَ مِنْكُمْ أَنْ يَتَّقِيَ النَّارَ وَلَوْ بِشِقِّ تَمْرَةٍ فَلْيَفْعَلْ».

عەدی کوڕی حاتیم ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «هەر یەکێک لە ئێوە بەدڵنیایی لە ڕۆژی دواییدا پەروەردگاری قسەی لەگەڵدا دەکات، لە کاتێکدا کە لە بەینی ئەو و پەروەردگاردا وەرگێڕ نییە، ئینجا ئەو کەسە تەماشای پێش خۆی

دەکات ئاگر لە پێشیەتی، تەماشای ڕاستی خۆی دەکات هیچ شتێک نابینێت جگە لەو کردەوەیە نەبێت کە لەپێش خۆی ناردوویەتی، تەماشای لای چەپی دەکات، هیچ شتێک نابینێت جگە لەوەی کە پێش خۆی خستووە لە دونیادا، جا هەر یەکێکتان کە توانای هەیە ئەگەر بە لەتە خورمایەکیش بێت، با خۆی لە ئاگری دۆزەخ بپارێزێت».

٣١٣. عَنْ سَلْمَانَ بْنِ عَامِرٍ الضَّبِّيِّ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه ﷺ: «الصَّدَقَةُ عَلَى الْمِسْكِينِ صَدَقَةٌ، وَعَلَى ذِي الْقَرَابَةِ اثْنَتَانِ: صَدَقَةٌ وَصِلَةٌ».

سەلمانی کوڕی عامیری زەببی ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «خێرکردن بە کەسی هەژار چاکەیە، خێرکردن بە کەسی نزیک دوو شتە: هەم خێرکردنە، وە هەم بەجێگەیاندنی پەیوەندیی خزمایەتییە».

# كِتَابُ النِّكَاحِ

## پەرتووکی هاوسەرگیری

### بَابُ مَا جَاءَ فِي فَضْلِ النِّكَاحِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی گەورەیی هاوسەرگیری

٣١٤. عَنْ عَلْقَمَةَ بْنِ قَيْسٍ، قَالَ: كُنْتُ مَعَ عَبْدِ اللَّه بْنِ مَسْعُودٍ رضي الله عنه بِمِنًى، فَخَلَا بِه عُثْمَانُ فَجَلَسْتُ قَرِيبًا مِنْه، فَقَالَ لَه عُثْمَانُ: هَلْ لَكَ أَنْ أُزَوِّجَكَ جَارِيَةً بِكْرًا تُذَكِّرُكَ مِنْ نَفْسِكَ بَعْضَ مَا قَدْ مَضَى؟ فَلَمَّا رَأَى عَبْدُ اللَّه أَنَّه لَيْسَ لَه حَاجَةٌ سِوَى هٰذَا، أَشَارَ إِلَيَّ بِيَدِه، فَجِئْتُ وَهوَ يَقُولُ: لَئِنْ قُلْتَ ذٰلِكَ، لَقَدْ قَالَ رَسُولُ اللَّه صلى الله عليه وسلم: «يَا مَعْشَرَ الشَّبَابِ، مَنِ اسْتَطَاعَ مِنْكُمُ الْبَاءَةَ فَلْيَتَزَوَّجْ، فَإِنَّه أَغَضُّ لِلْبَصَرِ، وَأَحْصَنُ لِلْفَرْجِ، وَمَنْ لَمْ يَسْتَطِعْ، فَعَلَيْه بِالصَّوْمِ، فَإِنَّه لَه وِجَاءٌ».

عەلقەمەی کوڕی قەیس دەڵێت: لەگەڵ عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود رضي الله عنه بووم لە مینا، جا لەگەڵ عوسمان دانیشتن و منیش لە نزیکیانەوە دانیشتم، ئینجا عوسمان پێی گوت: ئایا دەتەوێت کەنیزەکێکی کچت لێ مارە ببڕم کە ڕۆژانی ڕابردووت لە گەنجیدا بۆ قەرەبوو بکاتەوە؟ جا کاتێک عەبدوڵڵا زانی کە تەنها ئیشی ئەوەی پێ بوو، ئاماژەی بۆ من کرد (مەبەستی ئەوە بوو کە من گەنجم و فەرمانەکەشی

بۆ گەنجە)، منیش هاتم و ئەویش گوتی: ئەگەر تۆ ئەوە دەڵێیت، پێغەمبەری خو ﷺ فەرموویەتی: «ئەی کۆمەڵی گەنجان هەر یەکێک لە ئێوە ئەگەر توانای هەیە با ژن بهێنێت، چونکە بێگومان ژنهێنان باشتر و پارێزەرترە بۆ پاراستنی چاو لە تەماشاکردنی حەرام، وە پارێزەری دامێنیشە لە کاری نەشیاو، هەر کەسێک نەیتوانی با بەڕۆژوو بێت، چونکە بێگومان ڕۆژوو دەبێتە قەڵغان بۆی».

٣١٥. عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَمْ نَرَ -يُرَ- لِلْمُتَحَابَّيْنِ مِثْلُ النِّكَاحِ».

ئیبن عەبباس رضي الله عنهما دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «هیچ چارەسەرێک نابینین -نابینرێت- باشتر بێت لە هاوسەرگیری بۆ دوو کەس کە یەکدییان خۆش بوێت».

## بَابُ حَقِّ الْمَرْأَةِ عَلَى الزَّوْجِ

### باسی مافی ژن لەسەر مێرد

٣١٦. عَنْ حَكِيمِ بْنِ مُعَاوِيَةَ، عَنْ أَبِيهِ رضي الله عنه: أَنَّ رَجُلاً سَأَلَ النَّبِيَّ ﷺ مَا حَقُّ الْمَرْأَةِ عَلَى الزَّوْجِ؟ قَالَ: «أَنْ يُطْعِمَهَا إِذَا طَعِمَ، وَأَنْ يَكْسُوَهَا إِذَا اكْتَسَى، وَلَا يَضْرِبِ الْوَجْه، وَلَا يُقَبِّحْ، وَلَا يَهجُرْ إِلَّا فِي الْبَيْتِ».

حەکیمی کوڕی موعاویە لە باوکیەوە رضي الله عنه دەگێڕێتەوە: پیاوێک پرسیاری لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد ئایا مافی ئافرەت بەسەر مێردەکەیەوە چییە؟ فەرمووی: «ئەگەر پێویستی بە خواردن بوو خواردنی بداتێ، وە ئەگەر پێویستی بە پۆشاک بوو پۆشاکی بۆ دابین بکات، وە لە ڕوخساری نەدات، وە ڕوخساری ناشیرین نەکات (یان قسەی ناشیرین و نەشیاوی پێ نەڵێت)، وە پشتی تێ نەکات و لێی دوور نەکەوێتەوە تەنها لە ماڵەوە نەبێت (واتە: نە دەریبکات و نە خۆشی لە ماڵ دەربچێت و بچێتە شوێنێکی دیکە)».

## بَابُ أَفْضَلِ النِّسَاءِ

### باسی باشترینی ئافرەتان

٣١٧. عَنْ عَبْدِ اللَّه بْنِ عَمْرٍو ﵄: أَنَّ رَسُولَ اللَّه ﷺ قَالَ: «إِنَّمَا الدُّنْيَا مَتَاعٌ، وَلَيْسَ مِنْ مَتَاعِ الدُّنْيَا شَيْءٌ أَفْضَلَ مِنَ الْمَرْأَةِ الصَّالِحَةِ».

عەبدوڵڵای کوڕی عەمر ﵄ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «دونیا بریتییە لە هەندێك خۆشی و خۆشگوزەرانی، وە هیچ شتێک لە خۆشییەکانی دونیا باشتر نییە لە ئافرەتێکی چاکەکار».

## بَابُ تَزْوِيجِ ذَاتِ الدِّينِ

### باسی مارەبڕین و هاوسەرگیری ئافرەتی دیندار



٣١٨. عَنْ أَبِي هرَيْرَةَ ﵁: أَنَّ رَسُولَ اللَّه ﷺ قَالَ: «تُنْكَحُ النِّسَاءُ لِأَرْبَعٍ: لِمَالِها، وَلِحَسَبِها، وَلِجَمَالِها، وَلِدِينِها، فَاظْفَرْ بِذَاتِ الدِّينِ، تَرِبَتْ يَدَاكَ».

ئەبو هورەیرە ﵁ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «ئافرەت لەپێناو چوار شت داخوازی دەکرێت: لەبەر ماڵەکەی یان لەبەر نەژاد و بنەماڵەکەی یان لەبەر جوانییەکەی یان لەبەر دینداریيەکەی، ئینجا تۆ خاوەن دینەکە هەڵبژێرە، دەستت بە خۆڵدا بچێت».

✎ تێبینی:

(تربت يداك): چەمکێکە مەبەستی دوعا نییە، عەرەب بەکاری هێناوە بۆ نکوولیکردن، یان سەرسوڕمان یان گەورەیی شتەکە، بەپێی شوێن و بەکارهێنانی، جار هەیە بۆ ستاییشکردنە و جاریش هەیە بۆ سەرزەنشتکردنە.

## بَابُ النَّظَرِ إِلَى الْمَرْأَةِ إِذَا أَرَادَ أَنْ يَتَزَوَّجَها

### باسی ڕوانین بۆ ئافرەت بە مەبەستی داخوازیکردنی

٣١٩. عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ مَسْلَمَةَ ﷺ قَالَ: خَطَبْتُ امْرَأَةً، فَجَعَلْتُ أَتَخَبَّأُ لَها، حَتَّى نَظَرْتُ إِلَيْها فِي نَخْلٍ لَها، فَقِيلَ لَه: أَتَفْعَلُ هذَا وَأَنْتَ صَاحِبُ رَسُولِ اللهِ ﷺ؟ فَقَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ، يَقُولُ: «إِذَا أَلْقَى اللَّهُ فِي قَلْبِ امْرِئٍ خِطْبَةَ امْرَأَةٍ، فَلَا بَأْسَ أَنْ يَنْظُرَ إِلَيْها».

موحەممەدی کوڕی مەسلەمە ﷺ دەڵێت: خوازبێنیی ئافرەتێکم کرد، سەرەتا چووم لەنێو باخێکی خورما خۆم شاردەوە بۆ ئەوەی بتوانم تەماشای بکەم، ئینجا پێیان گوت: لە کاتێکدا کە تۆ هاوەڵی پێغەمبەری خوای ﷺ چۆن ئەو کارە دەکەی؟ ئەویش گوتی: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: «ئەگەر خوا خستیە دڵی کەسێکەوە کە داخوازیی ئافرەتێک بکات، هیچ کێشەیەک نییە کە تەماشای بکات».

## بَابُ اسْتِئْمَارِ الْبِكْرِ وَالثَّيِّبِ

### باسی ڕاوێژ و پرسکردن بە کچ و بێوەژن

٣٢٠. عَنْ أَبِي هرَيْرَةَ ﷺ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «لَا تُنْكَحُ الثَّيِّبُ حَتَّى تُسْتَأْمَرَ، وَلَا الْبِكْرُ حَتَّى تُسْتَأْذَنَ، وَإِذْنُها الصُّمُوتُ».

ئەبو هوڕەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «بێوەژن بەبێ پرسکردن و بڕیاردانی ڕاستەوخۆ لەلایەن خۆیەوە مارە ناکرێت، وە کچیش بەبێ مۆڵەت لێوەرگرتنی مارە ناکرێت، وە مۆڵەتدانی کچ بێدەنگبوونیەتی».

## بَابُ مَنْ زَوَّجَ ابْنَتَه وَهِيَ كَارِهَةٌ

### باسی ئەوەی (باوکێك) کچەکەی بەشوو بدات و کچەکەش پێیناخۆش بێت

٣٢١. عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄: أَنَّ جَارِيَةً بِكْرًا أَتَتِ النَّبِيَّ ﷺ، فَذَكَرَتْ لَه أَنَّ أَبَاهَا زَوَّجَهَا وَهِيَ كَارِهَةٌ، فَخَيَّرَهَا النَّبِيُّ ﷺ.

ئیبن عەبباس ﵄ دەگێڕێتەوە: کچێکی گەنج هات بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ، ئینجا باسی ئەوەی بۆ کرد کە باوکی بەشووی داوە لە کاتێکدا کە ئەو بۆخۆی پێیخۆش نییە و ڕازی نییە، ئینجا پێغەمبەر ﷺ سەرپشکی کرد (بڕیارەکەی دایە دەست خۆی، بە ڕازیبوون و ڕازینەبوون).

## بَابُ لَا نِكَاحَ إِلَّا بِوَلِيٍّ

### باسی هاوسەرگیری دروست نییە بەبێ سەرپەرشتیار

٣٢٢. عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: «أَيُّمَا امْرَأَةٍ لَمْ يُنْكِحْهَا الْوَلِيُّ، فَنِكَاحُهَا بَاطِلٌ، فَنِكَاحُهَا بَاطِلٌ، فَنِكَاحُهَا بَاطِلٌ، فَإِنْ أَصَابَهَا، فَلَهَا مَهْرُهَا بِمَا أَصَابَ مِنْهَا، فَإِنِ اشْتَجَرُوا، فَالسُّلْطَانُ وَلِيُّ مَنْ لَا وَلِيَّ لَه».

عائیشە ﵂ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «هەر ئافرەتێک کە سەرپەرشتیارەکەی مارەی نەبڕێت، هاوسەرگیرییەکە دانەمەزراوە، هاوسەرگیرییەکە دانەمەزراوە، هاوسەرگیرییەکە دانەمەزراوە، ئەگەر مارەی بڕی و چووە لای، مارەیی دەکەوێتە سەر ئەو کەسە، بەهۆی چوونە لای ئافرەتەکە (لەگەڵ ئەوەشدا کە مارەبڕینەکە دانامەزرێت بەپێی ئەم فەرموودەیە)، ئەگەر کێشە کەوتە نێوانیان، فەرمانڕەوا سەرپەرشتیاری هەر کەسێکە کە سەرپەرشتیاری نەبێت».

## بَابُ النَّهيِ عَنِ الشِّغَارِ

### باسی ڕێگریکردن لە ژن بە ژنە

٣٢٣. عَنِ ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما قَالَ: نَهى رَسُولُ اللَّه صلى الله عليه وسلم عَنِ الشِّغَارِ، وَالشِّغَارُ أَنْ يَقُولَ الرَّجُلُ لِلرَّجُلِ: زَوِّجْنِي ابْنَتَكَ أَوْ أُخْتَكَ، عَلَى أَنْ أُزَوِّجَكَ ابْنَتِي أَوْ أُخْتِي، وَلَيْسَ بَيْنَهمَا صَدَاقٌ.

ئیبن عومەر رضي الله عنهما دەڵێت: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم ژن بە ژنەی قەدەغە کردووە. ژن بە ژنەش ئەوەیە کە پیاوێک بە پیاوێک بڵێت: کچەکەی خۆت، یان خوشکەکەتم لێ مارە بکە، لەبری ئەوە منیش کچەکەی خۆم یان خوشکەکەمت لێ مارە دەکەم، وە هیچ مارەییان لە نێواندا نییە.

## بَابُ صَدَاقِ النِّسَاءِ

### باسی مارەیی ئافرەتان

٣٢٤. عَنْ سَهلِ بْنِ سَعْدٍ رضي الله عنه قَالَ: جَاءَتِ امْرَأَةٌ إِلَى النَّبِيِّ صلى الله عليه وسلم، قَالَ: «مَنْ يَتَزَوَّجُها؟»، فَقَالَ رَجُلٌ: أَنَا، فَقَالَ لَه النَّبِيُّ صلى الله عليه وسلم: «أَعْطِها وَلَوْ خَاتَمًا مِنْ حَدِيدٍ»، فَقَالَ: لَيْسَ مَعِي، قَالَ: «قَدْ زَوَّجْتُكَها عَلَى مَا مَعَكَ مِنَ الْقُرْآنِ».

سەهلی کوڕی سەعد رضي الله عنه دەڵێت: ئافرەتێک هات بۆ خزمەت پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم، فەرمووی: «کێ مارەی دەکات؟»، جا پیاوێک گوتی: من، ئینجا پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم پێی فەرمووی: «شتێکی پێ بدە (وەک مارەیی) ئەگەر ئەنگوستیلەیەکی ئاسنیش بێت»، ئەویش گوتی: هیچم نییە، فەرمووی: «کەواتە ئەوە مارەم بڕیی لە تۆ لەسەر ئەوەی کە فێری ئەوەندە قورئانەی بکەیت کە دەیزانیت».

## بَابُ الْغِنَاءِ وَالدُّفِّ

### باسی گۆرانیگوتن و دەفلێدان (لە کاتی هاوسەرگیری)

٣٢٥. عَنْ أَبِي الْحُسَيْنِ اسْمُه الْمَدَنِيُّ، قَالَ: كُنَّا بِالْمَدِينَةِ يَوْمَ عَاشُورَاءَ، وَالْجَوَارِي يَضْرِبْنَ بِالدُّفِّ، وَيَتَغَنَّيْنَ، فَدَخَلْنَا عَلَى الرُّبَيِّعِ بِنْتِ مُعَوِّذٍ، فَذَكَرْنَا ذَلِكَ لَها، فَقَالَتْ: دَخَلَ عَلَيَّ رَسُولُ اللَّه ﷺ صَبِيحَةَ عُرْسِي، وَعِنْدِي جَارِيَتَانِ يَتَغَنَّيَانِ، وَتَنْدُبَانِ آبَائِي الَّذِينَ قُتِلُوا يَوْمَ بَدْرٍ، وَتَقُولَانِ، فِيمَا تَقُولَانِ: وَفِينَا نَبِيٌّ يَعْلَمُ مَا فِي غَدٍ، فَقَالَ: «أَمَّا هذَا فَلَا تَقُولُوه، مَا يَعْلَمُ مَا فِي غَدٍ إِلَّا اللَّه».

ئەبولحوسەین کە ناوی خالیدی مەدەنی بوو دەڵێت: لە ڕۆژی عاشووڕائدا لە مەدینە بووین، لەو کاتەدا کەنیزەکەکان دەفیان لێ دەدا و گۆرانییان دەگوت، ئێمەش چووین بۆ لای ڕوبەیعی کچی موعەویز و باسەکەمان بۆ گێڕایەوە، ئەویش گوتی: پێغەمبەری خوا ﷺ بەیانی ڕۆژی بوکێنیم هات بۆ لام، لەو کاتەدا دوو کەنیزەکم لەلا بوون گۆرانییان دەگوت، بە باوانی منیاندا هەڵدەدا کە لە بەدردا کوژرابوون، وە لە گوتنەکەیاندا ئەوەشیان دەگوت: پێغەمبەرێک لەنێوماندایە کە ئاگاداری سبەینێشە، (پێغەمبەریش ﷺ) فەرمووی: «ئەوەیان مەڵێن، چونکە ئەوەی کە بەیانی ڕوو دەدات تەنها خوا دەیزانێت، (واتە: زانینی غەیب تەنها تایبەتە بە خوا، تەنانەت پێغەمبەرەکەشی ﷺ نایزانێت)».

٣٢٦. عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها قَالَتْ: دَخَلَ عَلَيَّ أَبُو بَكْرٍ، وَعِنْدِي جَارِيَتَانِ مِنْ جَوَارِي الْأَنْصَارِ تُغَنِّيَانِ بِمَا تَقَاوَلَتْ بِه الْأَنْصَارُ فِي يَوْمِ بُعَاثٍ، قَالَتْ: وَلَيْسَتَا بِمُغَنِّيَتَيْنِ، فَقَالَ أَبُو بَكْرٍ: أَبِمَزْمُورِ الشَّيْطَانِ فِي بَيْتِ النَّبِيِّ ﷺ؟ وَذَلِكَ فِي يَوْمِ عِيدِ الْفِطْرِ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «يَا أَبَا بَكْرٍ، إِنَّ لِكُلِّ قَوْمٍ عِيدًا، وَهذَا عِيدُنَا».

عائیشه رضي الله عنها دەڵێت: جارێکیان ئەبو بەکر هاتە لام (لەماڵەکەی خۆم) لەو کاتەدا دوو کەنیزەک لە کەنیزەکە ئەنصارییەکانم لەلا بوون کە گۆرانییان دەگوت بەو

دروشمانەی کە ئەنصارییەکان لە شەڕی بوعاسدا دەیانگوت، دەڵێت: ئەو دوو کەنیزەکە گۆرانیبێژی پیشەی ئەوان نەبوو، ئینجا ئەبو بەکر گوتی: ئایا ئاواز و ئامرازی شەیتان لە ماڵی پێغەمبەر ﷺ؟! ئەو ڕۆژە ڕۆژی جەژنی ڕەمەزان بوو، ئینجا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: «ئەی ئەبو بەکر هەموو گەلێک جەژنی تایبەت بە خۆی هەیە، وە ئەوەش (کە جەژنی ڕەمەزانە) جەژنی ئێمەیە».

٣٢٧. عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رضي الله عنه: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ مَرَّ بِبَعْضِ الْمَدِينَةِ، فَإِذَا هوَ بِجَوَارٍ يَضْرِبْنَ بِدُفِّهنَّ، وَيَتَغَنَّيْنَ، وَيَقُلْنَ:

نَحْنُ جَوَارٍ مِنْ بَنِي النَّجَّارِ ... يَا حَبَّذَا مُحَمَّدٌ مِنْ جَارِ

فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «اللَّه يَعْلَمُ إِنِّي لَأُحِبُّكُنَّ».

ئەنەسی کوڕی مالیک رضي الله عنه دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ بە بەشێک لە شاری مەدینەدا تێپەڕ بوو، بینی کە چەند کەنیزەکێک دەف لێ دەدەن و گۆرانی دەڵێن و دەڵێن:

ئێمە کەنیزەکین لە هۆزی بەنو نەجار ... باشترین دراوسێمان هەیە کە موحەممەدە

ئینجا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: «خوا دەزانێت کە منیش ئێوەم خۆش دەوێت».

## بَابٌ فِي الْمُخَنَّثِينَ

### باسێك دەربارەی پیاوی ژنانی (و ژنی خۆچوێن بە پیاو)

٣٢٨. عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ لَعَنَ الْمُتَشَبِّهينَ مِنَ الرِّجَالِ بِالنِّسَاءِ، وَلَعَنَ الْمُتَشَبِّهاتِ مِنَ النِّسَاءِ بِالرِّجَالِ.

ئیبن عەبباس رضي الله عنهما دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ نەفرینی کردووە لەو پیاوانەی کە خۆیان بە ئافرەتان دەچوێنن، نەفرینیشی کردووە لەو ئافرەتانەی کە خۆیان بە پیاوان دەچوێنن.

## بَابُ تهنِئَةِ النِّكَاحِ

### باسی پیرۆزبایی هاوسەرگیریکردن

٣٢٩. عَنْ أَبِي هرَيْرَةَ ﵁: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ إِذَا رَفَّأَ، قَالَ: «بَارَكَ اللَّه لَكُمْ، وَبَارَكَ عَلَيْكُمْ، وَجَمَعَ بَيْنَكُمَا فِي خَيْرٍ».

ئەبو هورەیرە ﵁ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ کاتێ پیرۆزبایی دەکرد (لە کەسێك کە هاوسەرگیری کردبوو) دەیفەرموو: «خوا فەڕ و بەرەکەت بڕێژێت بەسەرتاندا و لەسەر خێر و چاکە کۆتان بکاتەوە».

٣٣٠. عَنْ عَقِيلِ بْنِ أَبِي طَالِبٍ ﵁: أَنَّه تَزَوَّجَ امْرَأَةً مِنْ بَنِي جُشَمَ، فَقَالُوا: بِالرَّفَاءِ، وَالْبَنِينَ، فَقَالَ: لَا تَقُولُوا هكَذَا، وَلَكِنْ قُولُوا كَمَا قَالَ رَسُولُ اللَّه ﷺ: «اللَّهمَّ بَارِكْ لَهمْ، وَبَارِكْ عَلَيْهمْ».

عەقیلی کوڕی ئەبو تالیب ﵁ دەگێڕێتەوە: کە ژنێکی مارە کرد لە هۆزی بەنو جوشەم، ئینجا گوتیان: بەیەکەوە بژین و ئاسوودە بن و کوڕتان لێ پاش بکەوێت، ئەویش گوتی: ئاوا مەڵێن، بەڵکوو ئەوە بڵێن کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «خوایە بەرەکەتداریان بکەیت، خوایە خێر و فەڕ بڕژێنە بەسەریاندا».

## بَابُ الْوَلِيمَةِ

### باسی خواردنی شایی (هاوسەرگیری)

٣٣١. عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﵁: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ رَأَى عَلَى عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَوْفٍ أَثَرَ صُفْرَةٍ، فَقَالَ: «مَا هذَا؟ أَوْ مَه»، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّه، إِنِّي تَزَوَّجْتُ امْرَأَةً عَلَى وَزْنِ نَوَاةٍ مِنْ ذَهبٍ، فَقَالَ: «بَارَكَ اللَّه لَكَ، أَوْلِمْ وَلَوْ بِشَاةٍ».

ئەنەسی کوڕی مالیك ﵁ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ شوێنەواری زاوایەتیی بینی بەسەر عەبدوڕڕەحمانی کوڕی عەوفەوە، فەرمووی: «ئەوە چییە؟»، گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ژنم مارە کردووە لەسەر کێشی دەنکە خورمایەک لە زێڕ (سێ درهەم یان پێنج درهەم)، ئینجا فەرمووی: «خوا بەرەکەتداری بکات بۆت، داوەتێک بکە ئەگەر بە مەڕێکیش بێت».

## بَابُ إِجَابَةِ الدَّاعِي

### باسی چوون بۆ بانگهێشتی خواردنی هاوسەرگیری

٣٣٢. عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﵄ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «إِذَا دُعِيَ أَحَدُكُمْ إِلَى وَلِيمَةِ عُرْسٍ فَلْيُجِبْ».

ئیبن عومەر ﵄: دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «هەر یەکێک لە ئێوە ئەگەر بۆ نانخواردنی زەماوەند و ژن گواستنەوە بانگ کرا، با بچێت».

## بَابُ الْإِقَامَةِ عَلَى الْبِكْرِ وَالثَّيِّبِ

### باسی (ماوەی) شەومانەوە لەلای کچ و بێوەژن

٣٣٣. عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ ﵂: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ لَمَّا تَزَوَّجَ أُمَّ سَلَمَةَ أَقَامَ عِنْدَهَا ثَلَاثًا، وَقَالَ: «لَيْسَ بِكِ عَلَى أَهْلِكِ هَوَانٌ، إِنْ شِئْتِ سَبَّعْتُ لَكِ، وَإِنْ سَبَّعْتُ لَكِ سَبَّعْتُ لِنِسَائِي».

ئوم سەلەمە ﵂ دەگێڕێتەوە: کاتێک پێغەمبەری خوا ﷺ هاوسەرگیریی کرد لەگەڵ ئوم سەلەمەدا سێ شەو لەلای مایەوە و پێی فەرموو: «لەلام بەزەحمەت نییە و تۆ بەکەم نازانم (کە هەر سێ شەو لەلات دەمێنمەوە)، خۆ ئەگەر پێت خۆشە ئەوە

حەوت شەو دەمێنمەوە، بەڵام ئەگەر حەوت شەو لەلای تۆ بم، هەر خێزانە و حەوت شەو لەلای دەبم».

## بَابُ مَا يَقُولُ الرَّجُلُ إِذَا دَخَلَتْ عَلَيْه أَهلُه

### باسی ئەو دوعایەی پیاو دەیڵێت کاتێک دەچێت بۆ لای هاوسەرەکەی

٣٣٤. عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «لَوْ أَنَّ أَحَدَكُمْ إِذَا أَتَى امْرَأَتَه، قَالَ: اللَّهمَّ جَنِّبْنِي الشَّيْطَانَ، وَجَنِّبِ الشَّيْطَانَ مَا رَزَقْتَنِي، ثُمَّ كَانَ بَيْنَهمَا وَلَدٌ، لَمْ يُسَلِّطِ اللَّه عَلَيْه الشَّيْطَانَ، أَوْ لَمْ يَضُرَّه».

ئیبن عەبباس ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: «هەر یەکێک لە ئێوە کاتێک دەچێتە لای خێزانەکەی ئەگەر بڵێت: خوایە بمپارێزە لە شەیتان و لێم دوور بخەیتەوە، وە شەیتان دوور بخەیتەوە لەوەی کە پێمی دەبەخشیت، ئینجا (دوای ئەوە) ئەگەر منداڵێکیان لە نێواندا پەیدا بوو، خوا لێناگەڕێت شەیتان بەسەریدا زاڵ بێت، یان زەرەر و زیانی پێ بگەیەنێت».

## بَابُ النَّهيِ عَنْ إِتْيَانِ النِّسَاءِ فِي أَدْبَارِهنَّ

### باسی ڕێگریکردن لە چوونە لای ئافرەت لە دواوە

٣٣٥. عَنْ خُزَيْمَةَ بْنِ ثَابِتٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه ﷺ: «إِنَّ اللَّه لَا يَسْتَحْيِي مِنَ الْحَقِّ، ثَلَاثَ مَرَّاتٍ، لَا تَأْتُوا النِّسَاءَ فِي أَدْبَارِهنَّ».

خوزەیمەی کوڕی سابیت ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «خوا لە ئاست هەق شەرم ناکات، سێ جار وای فەرموو، مەچنە لای خێزانەکانتان لە دواوە».

## بَابُ الْعَزْلِ

### باسی ڕێگریکردن لە منداڵبوون (لەلایەن ژن و مێرد)

٣٣٦. عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﵁ قَالَ: سَأَلَ رَجُلٌ رَسُولَ اللّٰه ﷺ عَنِ الْعَزْلِ، فَقَالَ: «أَوَتَفْعَلُونَ؟ لَا عَلَيْكُمْ أَنْ لَا تَفْعَلُوا، فَإِنَّه لَيْسَ مِنْ نَسَمَةٍ قَضَى اللّٰه لَها أَنْ تَكُونَ، إِلَّا هِيَ كَائِنَةٌ».

ئەبو سەعیدی خودری ﵁ دەڵێت: پیاوێک پرسیاری لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد دەربارەی ڕێگریکردن لە منداڵبوون، ئەویش فەرمووی: «بۆ ئەم کارە دەکەن؟ زیانی نابێت بۆتان ئەگەر نەیکەن، چونکە هەر کەسێك خوا بڕیاری لەسەر دابێت کە ببێت ئەوە شتێکی حەتمییە و دەبێت (یان مانای: (لَا عَلَيْكُمْ أَنْ لَا تَفْعَلُوا)، واتە: هیچ زەرەرێکی نییە ئەگەر ڕێگری لە منداڵبوون بکەن، ئەوە لە کاتێکدا کە بڵێین پیتی -لا- زیادەیە)».

٣٣٧. عَنْ جَابِرٍ ﵁ قَالَ: كُنَّا نَعْزِلُ عَلَى عَهدِ رَسُولِ اللّٰه ﷺ، وَالْقُرْآنُ يَنْزِلُ.

جابیر ﵁ دەڵێت: ئێمە لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا ﷺ ڕێگریمان دەکرد لە منداڵبوون، لە کاتێکدا قورئانیش دادەبەزی (واتە: ئەگەر قەدەغە بووایە قورئان قەدەغەی دەکرد).

## بَابُ الرَّجُلِ يُطَلِّقُ امْرَأَتَه ثَلَاثًا فَتَزَوَّجُ فَيُطَلِّقُها قَبْلَ أَنْ يَدْخُلَ بِها، أَتَرْجِعُ إِلَى الْأَوَّلِ؟

### باسی پیاوێک سێ جار ژنی تەڵاق داوە و (ژنەکە) شوو دەکاتەوە و تەڵاق دەدرێتەوە پێش ئەوەی مێردی دووەمی لەگەڵی جووت بێت، ئایا دروستە بگەڕێتەوە بۆ لای مێردی یەکەمی؟

٣٣٨. عَنْ عَائِشَةَ ﵂: أَنَّ امْرَأَةَ رِفَاعَةَ الْقُرَظِيِّ جَاءَتْ إِلَى رَسُولِ اللّٰه ﷺ، فَقَالَتْ:

إِنِّي كُنْتُ عِنْدَ رِفَاعَةَ فَطَلَّقَنِي فَبَتَّ طَلَاقِي، فَتَزَوَّجْتُ عَبْدَ الرَّحْمَنِ بْنَ الزَّبِيرِ، وَإِنَّ مَا مَعَه مِثْلُ هدْبَةِ الثَّوْبِ، فَتَبَسَّمَ النَّبِيُّ ﷺ، فَقَالَ: «أَتُرِيدِينَ أَنْ تَرْجِعِي إِلَى رِفَاعَةَ؟ لَا، حَتَّى تَذُوقِي عُسَيْلَتَه، وَيَذُوقَ عُسَيْلَتَكِ».

عائیشه ﵂ دەگێڕێتەوە: کە خێزانی ریفاعەی قوڕەزی هات بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ، گوتی: لەلای ریفاعە بووم، بەڵام تەڵاقی داوم، بە تەڵاقی یەکجاری و کۆتایی (سێ بە سێ)، جا شووم کردەوە بە عەبدوڕڕەحمانی کوڕی زوبەیر، (لایەکی کراسەکەی گرت و گوتی) ئەویش هەر پەڕۆیە، (واتە: توانای جووتبوونی نییە)، ئینجا پێغەمبەر ﷺ زەردەخەنەیەکی کرد، فەرمووی: «دەتەوێت بگەڕێیتەوە بۆ لای ریفاعە؟! نەخێر، نابێت تاکوو چێژی ژن و مێردایەتی لە (عەبدوڕڕەحمان) دەبینیت و ئەویش چێژ لە تۆ دەبینێت».

## بَابُ الْمُحَلِّلِ وَالْمُحَلَّلِ لَه

### باسی مارەبەجاش

٣٣٩. عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄ قَالَ: لَعَنَ رَسُولُ اللَّه ﷺ الْمُحَلِّلَ، وَالْمُحَلَّلَ لَه.

ئیبن عەبباس ﵄ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ نەفرینی کردووە لەو کەسەی کە ئافرەتێک مارە دەکاتەوە بە نییەتی ئەوەی کە بۆ مێردی پێشووی حەڵاڵ ببێتەوە و تەڵاقی دەداتەوە، ئەو کەسەش کە ئافرەتەکەی بۆ حەڵاڵ دەکرێتەوە (مێردی یەکەمی).

✎ تێبینی:

مارەبەجاش: بریتییە لەوەی کەسێک ئافرەتی تەڵاقدراو مارە بکات، بە نییەتی تەڵاقدانەوە تاکوو بۆ مێردی یەکەمی حەڵاڵ ببێتەوە، بێ ئەوەی لەگەڵی جووت بێت.

## بَابُ يَحْرُمُ مِنَ الرَّضَاعِ مَا يَحْرُمُ مِنَ النَّسَبِ

### باسی هەر شتێک بەهۆی ڕەچەڵەکەوە حەرام بێت، بەهۆی شیرپێدانیشەوە حەرام دەبێت

٣٤٠. عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «يَحْرُمُ مِنَ الرَّضَاعِ مَا يَحْرُمُ مِنَ النَّسَبِ».

عائیشە ﵂ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «هەر شتێک بەهۆی ڕەچەڵەکەوە حەرام بێت، بەهۆی شیرپێدانیشەوە حەرام دەبێت».

٣٤١. عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ أُرِيدَ عَلَى بِنْتِ حَمْزَةَ بْنِ عَبْدِ الْمُطَّلِبِ، فَقَالَ: «إِنَّهَا ابْنَةُ أَخِي مِنَ الرَّضَاعَةِ، وَإِنَّه يَحْرُمُ مِنَ الرَّضَاعَةِ مَا يَحْرُمُ مِنَ النَّسَبِ».

ئیبن عەبباس ﵄ دەگێڕێتەوە: پێشنیاری کچی حەمزەی کوڕی عەبدولموتەلیبیان کرد بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ، ئەویش فەرمووی: «ئەو کچە برازای شیریمە (واتە: من و حەمزە لە یەک کەس شیرمان خواردووە)، وە بێگومان بەهۆی شیرەوە حەرام دەبێت هەر شتێک یان هەر کەسێک بەهۆی ڕەچەڵەکەوە حەرام بێت».

## بَابُ لَا تُحَرِّمُ الْمَصَّةُ وَلَا الْمَصَّتَانِ

### باسی ئەوەی کە مژێک یان دوو مژ شیر نابێتە هۆی حەرامبوون لەیەکدی

٣٤٢. عَنْ عَائِشَةَ ﵂ أَنَّها قَالَتْ: كَانَ فِيمَا أَنْزَلَ اللَّه مِنَ الْقُرْآنِ ثُمَّ سَقَطَ، لَا يُحَرِّمُ إِلَّا عَشْرُ رَضَعَاتٍ، أَوْ خَمْسٌ مَعْلُومَاتٌ.

عائیشە ﵂ دەڵێت: یەکێک لەوانەی کە کاتی خۆی لەنێو قورئاندا دابەزیوە، پاشان (حوکمەکەی هەڵوەشایەوە و) نەماوە، ئەوە بوو کە: ئەوەی دەبێتە هۆی حەرامبوون

ده جار شیرخواردنه یان پێنج جاری زانراو و دیار.

## بَابُ الرَّجُلِ يُسْلِمُ وَعِنْدَه أَكْثَرُ مِنْ أَرْبَعِ نِسْوَةٍ

### باسی ئەو پیاوەی موسوڵمان دەبێت و زیاتر لە چوار هاوسەری هەیە

٣٤٣. عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﵄ قَالَ: أَسْلَمَ غَيْلَانُ بْنُ سَلَمَةَ وَتَحْتَه عَشْرُ نِسْوَةٍ، فَقَالَ لَه النَّبِيُّ ﷺ: «خُذْ مِنْهنَّ أَرْبَعًا».

ئیبن عومەر ﵄ دەڵێت: غەیلانی کوڕی سەلەمە موسوڵمان بوو لە کاتێکدا کە دە ژنی هەبوو، ئینجا پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو: «چوار دانەیان لێ بگێڕەوە (ئەوانی دیکە واز لێ بێنە)».

## بَابُ الشَّرْطِ فِي النِّكَاحِ

### باسی مەرجدانان لە هاوسەرگیری

٣٤٤. عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ ﵁ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «إِنَّ أَحَقَّ الشَّرْطِ أَنْ يُوفَى بِه، مَا اسْتَحْلَلْتُمْ بِه الْفُرُوجَ».

عوقبەی کوڕی عامیر ﵁ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: «بەڕاستی شایستەترین مەرجێک کە دەبێت جێبەجێ بکرێت، ئەو مەرجەیە کە بەهۆیەوە دامێنتان بۆ حەڵاڵ بووە».

## بَابُ الرَّجُلِ يُعْتِقُ أَمَتَه ثُمَّ يَتَزَوَّجُها

### باسی پیاوێک کەنیزەکەکەی خۆی ئازاد بکات، پاشان لە خۆی مارەی بکات

٣٤٥. عَنْ أَبِي مُوسَى ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه ﷺ: «مَنْ كَانَتْ لَه جَارِيَةٌ فَأَدَّبَها

فَأَحْسَنَ أَدَبَها، وَعَلَّمَها فَأَحْسَنَ تَعْلِيمَها، ثُمَّ أَعْتَقَها وَتَزَوَّجَها، فَلَه أَجْرَانِ، وَأَيُّمَا رَجُلٍ مِنْ أَهلِ الْكِتَابِ آمَنَ بِنَبِيِّه، وَآمَنَ بِمُحَمَّدٍ، فَلَه أَجْرَانِ، وَأَيُّمَا عَبْدٍ مَمْلُوكٍ أَدَّى حَقَّ اللَّه عَلَيْه، وَحَقَّ مَوَالِيه، فَلَه أَجْرَانِ».

ئەبو مووسا ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «هەر کەسێک کەنیزەکێکی هەبێت و بەجوانترین شێوە پەروەردەی بکات و بەباشترین شێوە زانستی فێر بکات، پاشان ئازادی بکات و خۆی مارەی بکاتەوە، دوو پاداشتی بۆ هەیە، هەر پیاوێک لە ئەهلی کتێب بڕوای بە پێغەمبەرەکەی خۆی هێنابێت و بڕوایشی بە موحەممەد ﷺ هێنا، ئەوا دوو پاداشتی بۆ هەیە، هەر بەندەیەک هەقی خوا بدات و هەقی گەورەکەشی بدات، ئەوا دوو پاداشتی بۆ هەیە».

## بَابُ الْقِسْمَةِ بَيْنَ النِّسَاءِ

### باسی دابەشکردنی کاتی مانەوە لە نێوان هاوسەراندا

٣٤٦. عَنْ أَبِي هرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه ﷺ: «مَنْ كَانَتْ لَه امْرَأَتَانِ، يَمِيلُ مَعَ إِحْدَاهمَا عَلَى الْأُخْرَى، جَاءَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَأَحَدُ شِقَّيْه سَاقِطٌ».

ئەبو هوڕەیڕە ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «هەر کەسێک دوو ژنی هەبێت و دادگەر نەبێت لە نێوانیاندا و مەیلی بەلای یەکێکیاندا زیاتر بێت، لە ڕۆژی قیامەتدا بەلار و لەنگی دێت».

٣٤٧. عَنْ عَائِشَةَ ﷺ: أَنَّ رَسُولَ اللَّه ﷺ كَانَ إِذَا سَافَرَ أَقْرَعَ بَيْنَ نِسَائِه.

عائیشە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ ئەگەر گەشتی دەکرد لە نێوان هاوسەرانیدا تیروپشکی دەکرد (بۆ ئەوەی کامەیان لەگەڵ خۆی ببات).

## بَابُ حُسْنِ مُعَاشَرَةِ النِّسَاءِ

### باسی جوان مامەڵەکردن لەگەڵ هاوسەرەکاندا

٣٤٨. عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «خَيْرُكُمْ خَيْرُكُمْ لِأَهْلِهِ، وَأَنَا خَيْرُكُمْ لِأَهْلِي».

ئیبن عەبباس ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: «باشترینتان باشترینتانە بۆ خانەوادەکەی، من باشترینی ئێوەم بۆ خانەوادەکەم».

## بَابُ ضَرْبِ النِّسَاءِ

### باسی لێدانی ئافرەتان

٣٤٩. عَنْ عَائِشَةَ ﷺ قَالَتْ: مَا ضَرَبَ رَسُولُ اللَّه ﷺ خَادِمًا لَه، وَلَا امْرَأَةً، وَلَا ضَرَبَ بِيَدِه شَيْئًا.

عائیشە ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ هەرگیز لە خزمەتکارێکی نەداوە، لە هیچ ژنێکیشی نەداوە، بە دەستی خۆی لە هیچ شتێکی نەداوە (واتە: لەماڵەوە یان لە موسوڵمان، ئەگەرنا لە شەڕدا جیاوازە).

٣٥٠. عَنْ إِيَاسِ بْنِ عَبْدِ اللَّه بْنِ أَبِي ذُبَابٍ ﷺ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «لَا تَضْرِبُنَّ إِمَاءَ اللَّه»، فَجَاءَ عُمَرُ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّه، قَدْ ذَئِرَ النِّسَاءُ عَلَى أَزْوَاجِهِنَّ، فَأْمُرْ بِضَرْبِهِنَّ، فَضُرِبْنَ، فَطَافَ بِآلِ مُحَمَّدٍ ﷺ طَائِفُ نِسَاءٍ كَثِيرٍ، فَلَمَّا أَصْبَحَ، قَالَ: «لَقَدْ طَافَ اللَّيْلَةَ بِآلِ مُحَمَّدٍ سَبْعُونَ امْرَأَةً، كُلُّ امْرَأَةٍ تَشْتَكِي زَوْجَها، فَلَا تَجِدُونَ أُولَئِكَ خِيَارَكُمْ».

ئیاسی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی ئەبو زوباب ﷺ دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ

فەرموویەتی: «لە ژنەکانتان مەدەن»، ئینجا عومەر هات بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ و گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئافرەتان بەرانبەر پیاوەکانیان شەرمیان شکاوە، بۆیە فەرمان بفەرموو بە تەمبێکردنیان، ئینجا ئافرەتان هەندێکیان لێیان دەدرا، بۆیە ئافرەتانێکی زۆر دەهاتنە لای خانەوادەی پێغەمبەر ﷺ سکاڵایان دەکرد لە پیاوەکانیان، جا کاتێك بەیانی داهات فەرمووی: «ئەمشەو حەفتا ئافرەت هاتووە بۆ لای خانەوادەی موحەممەد ﷺ، هەر ئافرەتێک لەوانە شکایەتی هەبووە لە مێردەکەی، بەڕاستی ئەو پیاوانە لە پیاوە باشەکانتان نین».

## بَابُ الْغَيْرَةِ

## باسی ئیرەیی و غیرەکردن

٣٥١. عَنِ الزُّهرِيِّ رضي الله عنه قَالَ: أَخْبَرَنِي عَلِيُّ بْنُ الْحُسَيْنِ، أَنَّ الْمِسْوَرَ بْنَ مَخْرَمَةَ، أَخْبَرَه، أَنَّ عَلِيَّ بْنَ أَبِي طَالِبٍ خَطَبَ بِنْتَ أَبِي جهلٍ، وَعِنْدَه فَاطِمَةُ بِنْتُ النَّبِيِّ ﷺ، فَلَمَّا سَمِعَتْ بِذَلِكَ فَاطِمَةُ أَتَتِ النَّبِيَّ ﷺ، فَقَالَتْ: إِنَّ قَوْمَكَ يَتَحَدَّثُونَ أَنَّكَ لَا تَغْضَبُ لِبَنَاتِكَ، وَهذَا عَلِيٌّ نَاكِحًا ابْنَةَ أَبِي جهلٍ، قَالَ الْمِسْوَرُ: فَقَامَ النَّبِيُّ ﷺ، فَسَمِعْتُه حِينَ تَشَهدَ، ثُمَّ قَالَ: «أَمَّا بَعْدُ، فَإِنِّي قَدْ أَنْكَحْتُ أَبَا الْعَاصِ بْنَ الرَّبِيعِ فَحَدَّثَنِي فَصَدَقَنِي، وَإِنَّ فَاطِمَةَ بِنْتَ مُحَمَّدٍ بَضْعَةٌ مِنِّي، وَأَنَا أَكْرَه أَنْ تَفْتِنُوها، وَإِنَّها وَاللَّه لَا تَجْتَمِعُ بِنْتُ رَسُولِ اللَّه وَبِنْتُ عَدُوِّ اللَّه عِنْدَ رَجُلٍ وَاحِدٍ أَبَدًا». قَالَ: فَنَزَلَ عَلِيٌّ عَنِ الْخِطْبَةِ.

زوهری رضي الله عنه دەڵێت: عەلی کوڕی حوسەین هەواڵی پێ دام کە میسوەری کوڕی مەخرەمە هەواڵی پێ داوە کە عەلی کوڕی ئەبو تالیب داخوازی کچی ئەبو جەهلی کرد، لە کاتێکدا کە فاتیمەی کچی پێغەمبەری ﷺ لەلا بوو، جا کاتێک فاتیمە گوێبیستی ئەو هەواڵە بوو هات بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ و پێی گوت: گەل و هۆزەکەت باسی ئەوە دەکەن کە تۆ لەسەر کچەکانت تورە نابیت و نایەیتە وەلام، ئەوەتا عەلی داوای کچی ئەبو جەهل دەکات، میسوەر گوتی: ئینجا پێغەمبەر ﷺ

هەڵسا و (لەسەر مینبەر) گوێم لێ بوو کە شایەتمانی هێنا، پاشان فەرمووی: «لەدوای ئەوە، لە ڕاستیدا من ژنم دا بە ئەبولعاصی کوڕی ڕەبیع ئەوەی کە پێی گوتم و پەیمانی پێ دام ڕاستی کرد، فاتیمەی کچی موحەممەد ﷺ پارچەیەکە لە من و پێمناخۆشە کە ئەزیەتی بدەن و ناڕەحەتی بکەن، بێگومان و سوێند بە خوا کچی پێغەمبەری خوا ﷺ و کچی دوژمنی خوا هەرگیز بەیەکەوە کۆ نابنەوە لەلای پیاوێک». ڕاوی دەڵێت: ئینجا عەلیش وازی لە داخوازییەکە هێنا.

## بَابُ الَّتِي وَهبَتْ نَفْسَها لِلنَّبِيِّ ﷺ

### باسی ئەو ئافرەتەی خۆی پێشکەشی پێغەمبەر ﷺ کرد

٣٥٢. عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها أَنَّها كَانَتْ تَقُولُ: أَمَا تَسْتَحِي الْمَرْأَةُ أَنْ تَهبَ نَفْسَها لِلنَّبِيِّ ﷺ؟ حَتَّى أَنْزَلَ اللَّه: {تُرْجِي مَنْ تَشَاءُ مِنهنَّ وَتُؤْوِي إِلَيْكَ مَنْ تَشَاءُ} الأحزاب: ٥١، قَالَتْ: فَقُلْتُ: إِنَّ رَبَّكَ لَيُسَارِعُ فِي هوَاكَ.

عائیشە رضي الله عنها گووتویەتی: ئایا ئافرەت شەرم ناکات کە خۆی پێشکەشی پێغەمبەر ﷺ دەکات؟ تاکوو خوا ئەو ئایەتەی دابەزاند: {تُرْجِي مَنْ تَشَاءُ مِنهنَّ وَتُؤْوِي إِلَيْكَ مَنْ تَشَاءُ}، واتە: (ئەی موحەممەد ﷺ) سەرەی هەر یەکێک لە خێزانەکانت ویست دوای بخە و هەر یەکێك لەوانت ویست (پێشی بخە و) بیهێنە بۆ لای خۆت»). (عائیشە) گوتی: گوتم: (ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ) بەڕاستی خوا هەمیشە لەگەڵ ئاواتەکانی تۆدایە.

## بَابُ الرَّجُلُ يَشُكُّ فِي وَلَدِه

### باسی پیاو کە لە منداڵەکەی دەکەوێتە گومانەوە (ئایا لە خۆیەتی، یان نا)

٣٥٣. عَنْ أَبِي هرَيْرَةَ رضي الله عنه قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ مِنْ بَنِي فَزَارَةَ إِلَى رَسُولِ اللَّه ﷺ، فَقَالَ:

يَا رَسُولَ اللَّه، إِنَّ امْرَأَتِي وَلَدَتْ غُلَامًا أَسْوَدَ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّه ﷺ: «هلْ لَكَ مِنْ إِبِلٍ؟»، قَالَ: نَعَمْ، قَالَ: «فَمَا أَلْوَانُها؟»، قَالَ: حُمْرٌ، قَالَ: «هلْ فِيها مِنْ أَوْرَقَ؟»، قَالَ: إِنَّ فِيها لَوُرْقًا، قَالَ: «فَأَنَّى أَتَاها ذَلِكَ؟»، قَالَ: عَسَى عِرْقٌ نَزَعَها قَالَ: «وَهذَا لَعَلَّ عِرْقًا نَزَعَه».

ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێت: پیاوێک لە بەنو فەزارە هات بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ، جا گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا خێزانەکەم منداڵێکی ڕەشی بووە (دیارە بۆ خۆیان سپیپێست بوون و منداڵەکەش ڕەشپێست)، ئینجا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: «ئایا تۆ وشترت هەیە؟»، گوتی: بەڵێ، فەرمووی: «ڕەنگیان چۆنە؟»، گوتی: سوورن، فەرمووی: «ئایا ڕەشتاڵەیان تێدایە؟»، گوتی: بەڵێ ڕەشتاڵەیان تێدایە، فەرمووی: «ئەو ڕەشتاڵە لەکوێوە هاتووە؟»، گوتی: دەگونجێت یەکێك لە ڕەچەڵەک و ئەسڵی وشترەکە ڕەشتاڵە بووبێت، فەرمووی: «لەوانەیە ئەو منداڵەش بچێتەوە سەر بنەچەکەی».



## بَابُ الزَّوْجَيْنِ يُسْلِمُ أَحَدُهمَا قَبْلَ الْآخَرِ

### باسی ژن و مێرد کە یەکێکیان لەپێش ئەوی دیکە موسوڵمان دەبێت

٣٥٤. عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ: أَنَّ رَسُولَ اللَّه ﷺ رَدَّ ابْنَتَه عَلَى أَبِي الْعَاصِ بْنِ الرَّبِيعِ بَعْدَ سَنَتَيْنِ بِنِكَاحِها الْأَوَّلِ.

ئیبن عەبباس ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ کچەکەی خۆی دوای دوو ساڵ بۆ ئەبولعاصی کوڕی ڕەبیع گێڕایەوە هەر بە مارەکردنی یەکەمجار.

## بَابٌ فِي الْمَرْأَةِ تُؤْذِي زَوْجَها

### باسێك دەربارەی ئەو ژنەی کە مێردەکەی ئەزیەت دەدات

٣٥٥. عَنْ مُعَاذِ بْنِ جَبَلٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه ﷺ: «لَا تُؤْذِي امْرَأَةٌ زَوْجَها

إِلَّا قَالَتْ زَوْجَتُه مِنَ الْحُورِ الْعِينِ: لَا تُؤْذِيه، قَاتَلَكِ اللَّه، فَإِنَّمَا هوَ عِنْدَكِ دَخِيلٌ، أَوْشَكَ أَنْ يُفَارِقَكِ إِلَيْنَا».

موعازی کوڕی جەبەل ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «هیچ ئافرەتێک مێردەکەی ئەزیەت نادات مەگەر ئەوەی کە خێزانەکەی لە حۆرییەکان دەڵێت: ئەزیەتی مەدە خوا بتکوژێت، بەڕاستی ئەو پیاوە (ئێستا) لای تۆ میوانە و نزیکە (مردن) لێت جیا بکاتەوە و بێت بۆ لای ئێمە».

# كِتَابُ الطَّلَاقِ

## پەرتووکی تەڵاق

### بَابُ حَدَّثَنَا سُوَيْدُ بْنُ سَعِيدٍ

باسی سوەیدی کوڕی سەعید بۆی گێڕاینەوە

٣٥٦. عَنْ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ ﷺ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ طَلَّقَ حَفْصَةَ، ثُمَّ رَاجَعَهَا.

عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ حەفصەی خێزانی (بە تەڵاقێك) تەڵاق دا، پاشان گەڕاندیەوە.

### بَابُ طَلَاقِ السُّنَّةِ

باسی تەڵاقدان لەسەر سوننەت (ی پێغەمبەر ﷺ)

٣٥٧. عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ قَالَ: طَلَّقْتُ امْرَأَتِي وَهِيَ حَائِضٌ، فَذَكَرَ ذَلِكَ عُمَرُ لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَ: «مُرْه فَلْيُرَاجِعْها حَتَّى تَطْهرَ، ثُمَّ تَحِيضَ، ثُمَّ تَطْهرَ، ثُمَّ إِنْ شَاءَ طَلَّقَها قَبْلَ أَنْ يُجَامِعَها، وَإِنْ شَاءَ أَمْسَكَها، فَإِنَّها الْعِدَّةُ الَّتِي أَمَرَ اللَّه».

ئیبن عومەر ﵁ دەڵێت: ژنەکەم تەڵاق دابوو لە کاتێکدا کە لە حەیزدا بوو، جا عومەر ئەوەی بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ باس کرد، ئەویش فەرمووی: «فەرمانی پێ بکە با بیگێڕێتەوە هەتا پاک دەبێتەوە، پاشان دەکەوێتەوە سووڕی مانگانە، پاشان پاک بێتەوە، ئینجا ئەگەر پێی خۆش بوو با تەڵاقی بدات پێش ئەوەی سەرجێیی لەگەڵدا بکات، ئەگەر پێشی خۆش بوو با لەلای خۆی بیهێڵێتەوە، ئەوە ئەو ماوەیەیە کە خوا فەرمانی پێ کردووە».

٣٥٨. عَنْ عَبْدِ اللَّه ﵁ قَالَ: فِي طَلَاقِ السُّنَّةِ: يُطَلِّقُها عِنْدَ كُلِّ طُهرٍ تَطْلِيقَةً، فَإِذَا طَهرَتِ الثَّالِثَةَ، طَلَّقَها، وَعَلَيْها بَعْدَ ذَلِكَ حَيْضَةٌ.

عەبدوڵلا ﵁ دەڵێت: تەڵاقی سوننی (یان ڕێگەپێدراو و شەرعی ئەوەیە) لەدوای هەر پاکبوونەوەیەك تەڵاقێکی بدات، جا ئەگەر سێیەم جار پاك بۆیەوە، تەڵاقی (سێیەمی) دەدات، ئینجا لەدوای ئەوە ئافرەتەکە حەیزێکی لەسەرە (چاوەڕێ دەکات).

## بَابُ مَنْ طَلَّقَ ثَلَاثًا فِي مَجْلِسٍ وَاحِدٍ

## باسی کەسێک کە لە دانیشتنێکدا ژنەکەی سێ بە سێ تەڵاق دەدات

٣٥٩. عَنْ عَامِرٍ الشَّعْبِيِّ ﵁ قَالَ: قُلْتُ لِفَاطِمَةَ بِنْتِ قَيْسٍ ﵂: حَدِّثِينِي عَنْ طَلَاقِكِ، قَالَتْ: طَلَّقَنِي زَوْجِي ثَلَاثًا، وَهوَ خَارِجٌ إِلَى الْيَمَنِ، فَأَجَازَ ذَلِكَ رَسُولُ اللَّه ﷺ.

عامیری شەعبی ﵁ دەڵێت: بە فاتیمەی کچی قەیسم ﵂ گوت: باسی تەڵاقدانەکەتم بۆ بکە، ئەویش گوتی: مێردەکەم سێ جار تەڵاقی دام، لە کاتێکدا لە دەرەوە لە یەمەن بوو، جا ئەو جۆرە تەڵاقەش پێغەمبەری خوا ﷺ ڕێگەی پێ دا و پەسندی کرد.

## بَابُ الرَّجْعَةِ

### باسی گەڕاندنەوە (ی ژن، دوای تەڵاقدان)

٣٦٠. عَنْ مُطَرِّفِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ الشِّخِّيرِ ﵁: أَنَّ عِمْرَانَ بْنَ الْحُصَيْنِ، سُئِلَ عَنْ رَجُلٍ يُطَلِّقُ امْرَأَتَه، ثُمَّ يَقَعُ بِها وَلَمْ يُشْهِدْ عَلَى طَلَاقِها، وَلَا عَلَى رَجْعَتِها، فَقَالَ عِمْرَانُ: طَلَّقْتَ بِغَيْرِ سُنَّةٍ، وَرَاجَعْتَ بِغَيْرِ سُنَّةٍ، أَشْهِدْ عَلَى طَلَاقِها، وَعَلَى رَجْعَتِها.

موتەرریفی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی شیخخیر ﵁ دەگێڕێتەوە: پرسیار کرا لە عیمڕانی کوڕی حوصەین ﵁ دەربارەی پیاوێک کە ژنەکەی تەڵاق داوە (بە تەڵاقی ڕەجعی)، پاشان دەچێتەوە لای بێ ئەوەی شایەدی گرتبێت لەسەر تەڵاقەکەی، یان لەسەر گێڕانەوەکەشی، عیمڕان گوتی: بە جۆرێك تەڵاقت داوە کە لەسەر سوننەت نییە و گێڕانەوەکەشت بەپێی سوننەت نییە، لەسەر تەڵاقدان و گێڕانەوەکەشی شایەد بگرە (بۆ ئەوەی نەبێتە جێگەی توانج و گومان).

## بَابُ الْحَامِلِ الْمُتَوَفَّى عَنها زَوْجُها إِذَا وَضَعَتْ حَلَّتْ لِلْأَزْوَاجِ

### باسی ئافرەتی دووگیانی مێردمردوو، هەرکات منداڵەکەی بوو بۆی هەیە شوو بکاتەوە

٣٦١. عَنْ أَبِي السَّنَابِلِ، قَالَ: وَضَعَتْ سُبَيْعَةُ الْأَسْلَمِيَّةُ بِنْتُ الْحَارِثِ ﵂ حَمْلَها بَعْدَ وَفَاةِ زَوْجِها بِبِضْعٍ وَعِشْرِينَ لَيْلَةً، فَلَمَّا تَعَلَّتْ مِنْ نِفَاسِها تَشَوَّفَتْ، فَعِيبَ ذَلِكَ عَلَيْها، وَذُكِرَ أَمْرُها لِلنَّبِيِّ ﷺ، فَقَالَ: «إِنْ تَفْعَلْ فَقَدْ مَضَى أَجَلُها».

ئەبو سەنابیل، دەڵێت: سوبەیعەی ئەسلەمی کچی حاریس ﵂ بیست و هەندێک شەو لەدوای وەفاتی مێردەکەی منداڵی بوو، جا کاتێک پاک بۆیەوە لە خوێنی منداڵبوون، حەزی ئەوەی کرد کە کەسێک داخوازیی بکات، بەڵام ڕەخنەیان لێ

گرت (و توانجیان لێ دا) لەسەر ئەوە، ئینجا باسەکەیان بۆ پێغەمبەر ﷺ باس کرد، ئەویش فەرمووی: «ئەگەر ئەو کارەش بکات (مێرد بکاتەوە) ئاساییە، چونکە ماوەی عیدەکەی بەسەرچووە (بە منداڵبوونەکە)».

## بَابُ أَيْنَ تَعْتَدُّ الْمُتَوَفَّى عَنها زَوْجُها

### باسی ئەگەر ئافرەتێک مێردی مرد عیدەکەی لەکوێ بەسەر دەبات

٣٦٢. عَنْ زَيْنَبَ بِنْتِ كَعْبِ بْنِ عُجْرَةَ رضي الله عنهما -وَكَانَتْ تَحْتَ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ رضي الله عنه-: أَنَّ أُخْتَه الْفُرَيْعَةَ بِنْتَ مَالِكٍ، قَالَتْ: خَرَجَ زَوْجِي فِي طَلَبِ أَعْلَاجٍ لَه، فَأَدْرَكَهمْ بِطَرَفِ الْقَدُومِ، فَقَتَلُوه، فَجَاءَ نَعْيُ زَوْجِي وَأَنَا فِي دَارٍ مِنْ دُورِ الْأَنْصَارِ، شَاسِعَةٍ عَنْ دَارِ أَهلِي، فَأَتَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللّه، إِنَّه جَاءَ نَعْيُ زَوْجِي وَأَنَا فِي دَارٍ شَاسِعَةٍ عَنْ دَارِ أَهلِي، وَدَارِ إِخْوَتِي، وَلَمْ يَدَعْ مَالاً يُنْفِقُ عَلَيَّ، وَلَا مَالاً وَرِثْتُه، وَلَا دَارًا يَمْلِكُها، فَإِنْ رَأَيْتَ أَنْ تَأْذَنَ لِي فَأَلْحَقَ بِدَارِ أَهلِي، وَدَارِ إِخْوَتِي فَإِنَّه أَحَبُّ إِلَيَّ، وَأَجْمَعُ لِي فِي بَعْضِ أَمْرِي، قَالَ: «فَافْعَلِي إِنْ شِئْتِ»، قَالَتْ: فَخَرَجْتُ قَرِيرَةً عَيْنِي لِمَا قَضَى اللّه لِي عَلَى لِسَانِ رَسُولِ اللّه ﷺ، حَتَّى إِذَا كُنْتُ فِي الْمَسْجِدِ، أَوْ فِي بَعْضِ الْحُجْرَةِ دَعَانِي، فَقَالَ: «كَيْفَ زَعَمْتِ؟»، قَالَتْ: فَقَصَصْتُ عَلَيْه، فَقَالَ: «امْكُثِي فِي بَيْتِكِ الَّذِي جَاءَ فِيه نَعْيُ زَوْجِكِ حَتَّى يَبْلُغَ الْكِتَابُ أَجَلَه»، قَالَتْ: فَاعْتَدَدْتُ فِيه أَرْبَعَةَ أَشْهرٍ وَعَشْراً.

زەینەبی کچی کەعبی کوڕی عوجرە رضي الله عنهما دەگێڕێتەوە: -کە لەژێر نیکاحی ئەبو سەعیدی خودریدا رضي الله عنه بوو-: خوشکەکەی فوڕەیعەی کچی مالیک گوتی: مێردەکەم بەدوای بەندە هەڵاتووەکانیدا ڕۆیشت، جا لە نزیک قەدووم پێیان گەیشت، بەندەکانیش کوشتیان، هەواڵی مردنی مێردەکەمیان پێ دام لە کاتێکدا کە لە یەکێک لە خانووەکانی ئەنصارڕدا بووم کە دوور بوو لە کەسوکارم، لەبەر ئەوە هاتمە خزمەت پێغەمبەر ﷺ و گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا، هەواڵی مردنی مێردەکەم پێ گەیشت و

منیش له ماڵێکدام که دووره له ماڵی کەسوکارم و براکانم، وه هیچ ماڵێکی ئەوتۆی جێ نەهێشتووه که پێی بژیم و سامانی نییه به میراتی وەریبگرم و خانوویەکیشی نییه، جا ئەگەر ڕێگەم پێ بدەی بچمەوه نێو کەسوکارم و براکانم، بۆ من خۆشتره و بۆ کاروبارم باشتره، فەرمووی: «ئەگەر پێتخۆشه وا بکه (بچۆوه نێو خزم و کەسانت)»، منیش ڕۆیشتم و بڕیارەکەی خوام لەسەر زمانی پێغەمبەرەکەی ﷺ زۆر پێخۆش بوو، تا ئەو کاتەی که له مزگەوتدا بووم، یان له یەکێک له حوجرەکان بووم بانگی کردم و فەرمووی: «چۆنت گوت؟»، منیش چیرۆکەکەم بۆ گێڕایەوه، ئەویش فەرمووی: «هەر لەو ماڵەدا بمێنەوه که تیایدا هەواڵی مردنی مێردەکەت پێ گەیشت تاکوو عیدەت بەسەر دەچێت»، گوتی: منیش چوار مانگ و ده ڕۆژ تێیدا مامەوه.

## بَابُ الْمُطَلَّقَةِ ثَلَاثًا هَلْ لَهَا سُكْنَى وَنَفَقَةٌ؟

### باسی ئافرەتێک سێ جار تەڵاق درابێت، ئایا مافی شوێنی مانەوه و خەرجی هەیه؟

٣٦٣. عَنِ الشَّعْبِيِّ رضي الله عنه قَالَ: قَالَتْ فَاطِمَةُ بِنْتُ قَيْسٍ: طَلَّقَنِي زَوْجِي عَلَى عَهدِ رَسُولِ اللَّه ﷺ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّه ﷺ: «لَا سُكْنَى لَكِ، وَلَا نَفَقَةَ».

شەعبی رضي الله عنه دەڵێت: فاتیمەی کچی قەیس گوتی: له سەردەمی پێغەمبەری خوادا ﷺ مێردەکەم به سێ جار تەڵاقدان تەڵاقی دام، ئینجا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: «مافی شوێنی مانەوه و بژێوی ژیانت لەسەر مێردەکەت نییه».

## بَابُ مَنْ طَلَّقَ فِي نَفْسِهِ وَلَمْ يَتَكَلَّمْ بِهِ

### باسی کەسێک که له دڵدا ژنەکەی تەڵاق بدات بەڵام به زمان نەیڵێت

٣٦٤. عَنْ أَبِي هرَيْرَةَ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه ﷺ: «إِنَّ اللَّه تَجَاوَزَ لِأُمَّتِي عَمَّا

حَدَّثَتْ بِهِ أَنْفُسَها، مَا لَمْ تَعْمَلْ بِهِ، أَوْ تَكَلَّمْ بِهِ».

ئەبو هورەیرە ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «بێگومان خوا چاوپۆشی کردووە لە ئوممەتەکەم لەوەی کە بە دڵیدا دێت (بە خەیاڵ) مادام بە کردەوە کاری پێ نەکات، یان بە زمانی نەیڵێت».

## بَابُ طَلَاقِ الْمَعْتُوهِ وَالصَّغِيرِ وَالنَّائِمِ

### باسی تەڵاقی شێتەڵۆکە و گچکە و خەوتوو

٣٦٥. عَنْ عَائِشَةَ ﵂: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «رُفِعَ الْقَلَمُ عَنْ ثَلَاثَةٍ: عَنِ النَّائِمِ حَتَّى يَسْتَيْقِظَ، وَعَنِ الصَّغِيرِ حَتَّى يَكْبَرَ، وَعَنِ الْمَجْنُونِ حَتَّى يَعْقِلَ، أَوْ يُفِيقَ». قَالَ أَبُو بَكْرٍ فِي حَدِيثِهِ: وَعَنِ الْمُبْتَلَى حَتَّى يَبْرَأَ.

عائیشە ﵂ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «پێنووس هەڵگیراوە لەسەر سێ کەس: خەوتوو تاکوو بەئاگا دێتەوە، بچووک تاکوو گەورە دەبێت (باڵغ دەبێت)، شێت تاکوو هۆشی دێتەوە». ئەبو بەکر (ی کوڕی ئەبو شەیبە) لە گێڕانەوەکەیدا گوتوویەتی: دەردەدارێک (کە بەهۆیەوە ئەقڵ لەدەست بدات) تاکوو چاک دەبێتەوە.

## بَابُ كَرَاهِيَةِ الْخُلْعِ لِلْمَرْأَةِ

### باسی ناپەسندی خولع بۆ ئافرەت

٣٦٦. عَنْ ثَوْبَانَ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَيُّمَا امْرَأَةٍ سَأَلَتْ زَوْجَها الطَّلَاقَ فِي غَيْرِ مَا بَأْسٍ، فَحَرَامٌ عَلَيْهَا رَائِحَةُ الْجَنَّةِ».

سەوبان ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «هەر ئافرەتێک داوای تەڵاق

له مێردەکەی بکات، بێ ئەوەی هیچ کێشەیەکی (شایەن بە جیابوونەوەی) هەبێت، بۆنی بەهەشتی لێ حەرامە».

## بَابُ اللِّعَانِ

### باسی لیعان (کەسێک ژنەکەی خۆی بە زینا تۆمەتبار بکات)

٣٦٧. عَنِ ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما: أَنَّ رَجُلاً لَاعَنَ امْرَأَتَه وَانْتَفَى مِنْ وَلَدِها، فَفَرَّقَ رَسُولُ اللَّه ﷺ بَيْنَهما، وَأَلْحَقَ الْوَلَدَ بِالْمَرْأَةِ.

ئیبن عومەر رضي الله عنهما دەگێڕێتەوە: پیاوێک لیعانی لەگەڵ ژنەکەی کرد و نکووڵیی کرد لە منداڵەکەی، ئینجا پێغەمبەری خوا ﷺ لەیەکدی جیا کردنەوە و منداڵەکەی دایە ژنەکە.

## بَابُ كَرَاهِيَةِ الزِّينَةِ لِلْمُتَوَفَّى عَنْها زَوْجُها

### باسی ناپەسندی خۆڕازاندنەوەی ئافرەتی مێردمردوو

٣٦٨. عَنْ حُمَيْدِ بْنِ نَافِعٍ: أَنَّه سَمِعَ زَيْنَبَ ابْنَةَ أُمِّ سَلَمَةَ رضي الله عنها تُحَدِّثُ أَنَّها سَمِعَتْ أُمَّ سَلَمَةَ وَأُمَّ حَبِيبَةَ رضي الله عنهما تَذْكُرَانِ أَنَّ امْرَأَةً أَتَتِ النَّبِيَّ ﷺ، فَقَالَتْ: إِنَّ ابْنَةً لَها تُوُفِّيَ عَنْها زَوْجُها، فَاشْتَكَتْ عَيْنُها، فَهِيَ تُرِيدُ أَنْ تَكْحَلَها، فَقَالَ رَسُولُ اللَّه ﷺ: «قَدْ كَانَتْ إِحْدَاكُنَّ تَرْمِي بِالْبَعْرَةِ عِنْدَ رَأْسِ الْحَوْلِ، وَإِنَّمَا هِيَ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ وَعَشْراً».

حومەیدی کوڕی نافیع دەگێڕێتەوە: کە گوێی لە زەینەبی کچی ئوم سەلەمە رضي الله عنها بوو، دەیگێڕایەوە کە گوێی لە ئوم سەلەمە و ئوم حەبیبە رضي الله عنهما بووە، باسی ئافرەتێکیان کردووە کە هاتۆتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ و گوتوویەتی: کچەکەی مێردی مردووە و چاوەکانیشی دێشن، ئەویش دەیەوێت کە بە کل بیانڕێژێت، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: «جاران (لە سەردەمی نەفامیدا) ئێوە پشقلەکەتان لەدوای یەک ساڵ

فڕێ دەدا، بەڵام عیددە لە ئیسلامدا چوار مانگ و دە ڕۆژە».

## بَابُ هلْ تُحِدُّ الْمَرْأَةُ عَلَى غَيْرِ زَوْجِها

## باسی ئایا ئافرەت دەتوانێت تازیەبار بێت بۆ غەیری مێردەکەی؟

٣٦٩. عَنْ عَائِشَةَ ﵂ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «لَا يَحِلُّ لِامْرَأَةٍ أَنْ تُحِدَّ عَلَى مَيِّتٍ فَوْقَ ثَلَاثٍ، إِلَّا عَلَى زَوْجٍ».

عائیشە ﵂ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: «بۆ هیچ ئافرەتێک دروست نییە کە لە سێ ڕۆژ زیاتر تازیەبار بێت، تەنها بۆ (مردنی) مێردەکەی نەبێت، (کە دەبێت چوار مانگ و دە ڕۆژ تازیەبار بێت بۆی)».

## بَابُ الرَّجُلِ يَأْمُرُه أَبُوه بِطَلَاقِ امْرَأَتِه

## باسی پیاوێک کە باوکی فەرمانی پێ دەکات بە تەڵاقدانی ژنەکەی

٣٧٠. عَنْ أَبِي عَبْدِ الرَّحْمَنِ ﵁: أَنَّ رَجُلًا أَمَرَه أَبُوه أَوْ أُمُّه -شَكَّ شُعْبَةُ- أَنْ يُطَلِّقَ امْرَأَتَه، فَجَعَلَ عَلَيْه مِائَةَ مُحَرَّرٍ، فَأَتَى أَبَا الدَّرْدَاءِ، فَإِذَا هوَ يُصَلِّي الضُّحَى وَيُطِيلُها، وَصَلَّى مَا بَيْنَ الظُّهرِ وَالْعَصْرِ، فَسَأَلَه، فَقَالَ أَبُو الدَّرْدَاءِ: أَوْفِ بِنَذْرِكَ، وَبِرَّ وَالِدَيْكَ، وَقَالَ أَبُو الدَّرْدَاءِ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّه ﷺ، يَقُولُ: «الْوَالِدُ أَوْسَطُ أَبْوَابِ الْجَنَّةِ، فَحَافِظْ عَلَى وَالِدَيْكَ أَوِ اتْرُكْ».

ئەبو عەبدوڕڕەحمان ﵁ دەگێڕێتەوە: پیاوێک باوکی فەرمانی پێ کردبوو یان دایکی -شوعبە گومانی هەبوو کامیان بوو- کە ژنەکەی تەڵاق بدات، پیاوەکەش سەد وشتری کردە نەزر ئەگەر تەڵاقی بدات، ئینجا ئەو پیاوە هات بۆ لای ئەبو دەڕداء، لەو کاتەدا (ئەبو دەڕداء ﵁) نوێژی چێشتەنگاوی دەکرد و درێژی دەکردەوە، لە نێوان نیوەڕۆ

و عەسریشدا نوێژی کرد، ئەوجار پرسیاری لێ کرد، جا ئەبو دەرداء ﷺ گوتی: نەزرەکەت جێبەجێ بکە وە چاکەش لەگەڵ دایک و باوکت بکە، وە ئەبو دەرداء گوتی: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: «باوک دەرگای هەرەبەرز و باشەکانی بەهەشتە، ئینجا ئاگاداری چاکەی باوک و دایکت بە و دەرگاکە بپارێزە، یان واز لەو دەرگایە بێنە (واتە: ئارەزووی خۆتە ڕاستییەکە ئاوایە، جا یان بیپارێزە، یان لەدەست خۆتی بدە)».

# كِتَابُ الْكَفَّارَاتِ

## پەرتووكی كەفارەتەكان

### بَابُ يَمِينِ رَسُولِ اللَّه ﷺ الَّتِي كَانَ يَحْلِفُ بِها

باسی ئەوانەی پێغەمبەری خوا ﷺ سوێندی پێ خواردوون

٣٧١. عَنْ رِفَاعَةَ الْجُهَنِيِّ رضي الله عنه قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ إِذَا حَلَفَ قَالَ: «وَالَّذِي نَفْسُ مُحَمَّدٍ بِيَدِهِ».

ڕیفاعەی جوهەنی رضي الله عنه دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ كاتێك سوێندی دەخوارد، دەیفەرموو: «سوێند بەو زاتەی كە گیانی موحەممەدی ﷺ بەدەستە».

### بَابُ النَّهْيِ أَنْ يُحْلَفَ بِغَيْرِ اللَّه

باسی ڕێگریكردن لە سوێندخواردن بە جگە لە خوا

٣٧٢. عَنْ عُمَرَ رضي الله عنه: أَنَّ رَسُولَ اللَّه ﷺ سَمِعَه يَحْلِفُ بِأَبِيه، فَقَالَ رَسُولُ اللَّه ﷺ: «إِنَّ اللَّه يَنْهاكُمْ أَنْ تَحْلِفُوا بِآبَائِكُمْ». قَالَ عُمَرُ: فَمَا حَلَفْتُ بِها ذَاكِرًا، وَلَا آثِرًا.

عومەر ﵁ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ گوێی لێ بوو کە (عومەر) سوێندی بە باوکی دەخوارد، ئینجا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: «بەڕاستی خوا لێتانی قەدەغە کردووە، سوێند بە باووباپیرانتان بخۆن». عومەر گوتی: منیش (لەو کاتەوە) نە خۆم سوێندم بەو شێوەیە خواردووە، نە لە کەسیش گێڕاومەتەوە کە سوێندی بەو شێوەیە خواردبێت.

## بَابُ مَنْ حَلَفَ بِمِلَّةٍ غَيْرِ الْإِسْلَامِ

### باسی ئەو کەسەی کە سوێند بخوات بە ئایینێکی جگە لە ئیسلام

٣٧٣. عَنْ ثَابِتِ بْنِ الضَّحَّاكِ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه ﷺ: «مَنْ حَلَفَ بِمِلَّةٍ سِوَى الْإِسْلَامِ كَاذِبًا مُتَعَمِّدًا، فَهوَ كَمَا قَالَ».

سابیتی کوڕی زەححاک ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «هەر کەسێک بە درۆ و بەئەنقەست بە ئایینێک جگە لە ئیسلام سوێندی خوارد (واتە: بۆ نموونە بڵێت: ئەگەر ئەو شتە وا نەبێت من جوولەکە بم)، ئەوە وەکوو ئەوەیە کە دەیڵێت (واتە: سوێندەکەی دادەمەزرێت)».

٣٧٤. عَنْ عَبْدِ اللَّه بْنِ بُرَيْدَةَ، عَنْ أَبِيه ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه ﷺ: «مَنْ قَالَ إِنِّي بَرِيءٌ مِنَ الْإِسْلَامِ، فَإِنْ كَانَ كَاذِبًا، فَهوَ كَمَا قَالَ، وَإِنْ كَانَ صَادِقًا لَمْ يَعُدْ إِلَى الْإِسْلَامِ سَالِمًا».

عەبدوڵڵای کوڕی بورەیدە لە باوکیەوە ﵁ دەگێڕێتەوە، گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «هەر کەسێک (سوێند بخوات و پاشان) بڵێت: پەیوەندیی بە ئیسلامەوە نەمێنێت (ئەگەر ئەو شتە وا نەبێت)، جا ئەگەر درۆی کرد ئەوە بەو جۆرەیە کە دەیڵێت (واتە: پەیوەندیی بە ئیسلامەوە نامێنێت)، وە ئەگەر ڕاستیشی کرد، ئەوە بە سەلامەتی (سەلامەتی دڵ) ناگەڕێتەوە بۆ نێو ئیسلام».

## بَابُ مَنْ حُلِفَ لَه بِاللَّه فَلْيَرْضَ

### باسی ئەو کەسەی سوێندی بە خوا بۆ دەخورێت، با ڕازی بێت

٣٧٥. عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﵄ قَالَ: سَمِعَ النَّبِيُّ ﷺ رَجُلًا يَحْلِفُ بِأَبِيه، فَقَالَ: «لَا تَحْلِفُوا بِآبَائِكُمْ، مَنْ حَلَفَ بِاللَّه فَلْيَصْدُقْ، وَمَنْ حُلِفَ لَه بِاللَّه فَلْيَرْضَ، وَمَنْ لَمْ يَرْضَ بِاللَّه، فَلَيْسَ مِنَ اللَّه».

ئیبن عومەر ﵄ دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ گوێی لێ بوو پیاوێک سوێندی بە باوکی دەخوارد، بۆیە فەرمووی: «سوێند بە باووباپیرانتان مەخۆن، هەر کەسێک سوێندی بە خوا خوارد با ڕاستگۆ بێت (سوێندەکەی بەجێ بێنێت)، هەر کەسێکیش سوێندی بۆ خوارد بە خوا با ڕازی بێت، هەر کەسێک بە خوا ڕازی نەبێت، لە خوا نزیک نییە!».

٣٧٦. عَنْ أَبِي هرَيْرَةَ ﵁: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «رَأَى عِيسَى ابْنُ مَرْيَمَ رَجُلًا يَسْرِقُ، فَقَالَ: أَسَرَقْتَ؟ قَالَ: لَا، وَالَّذِي لَا إِلَه إِلَّا هوَ، فَقَالَ عِيسَى: آمَنْتُ بِاللَّه وَكَذَّبْتُ بَصَرِي».

ئەبو هورەیرە ﵁ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: «عیسای کوڕی مەریەم پیاوێکی بینی دزیی دەکرد، جا فەرمووی: ئایا دزیت کرد؟ گوتی: نەخێر سوێند بەو کەسەی کە هیچ پەرستراوێکی بەهەق نییە جگە لەو، ئینجا عیسا فەرمووی: بڕوام بە خوا هەیە و چاوەکانی خۆم بەدرۆ خستەوە (واتە: لەبەر پیرۆزی ناوی الله چاوەکانی خۆم بەدرۆ دەخەمەوە، ئەگەر ڕاستیشیان بینیبێت)».

## بَابُ الِاسْتِثْنَاءِ فِي الْيَمِينِ

### باسی هەڵاواردن لە سوێندخواردندا

٣٧٧. عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﵄ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه ﷺ: «مَنْ حَلَفَ وَاسْتَثْنَى، إِنْ شَاءَ

رَجَعَ، وَإِنْ شَاءَ تَرَكَ غَيْرُ حَانِثٍ».

ئیبن عومەر ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «هەر کەسێک سوێندی خوارد و هەڵاواردنی تێدا کرد، ئەگەر ویستی لەسەر بوو سوێندەکەی جێبەجێ دەکات، ئەگەر پێیخۆش بوو وازی لێ بێنێت و گوناهباریش نابێت (سوێندەکەی ناکەوێت)».

## بَابُ مَنْ حَلَفَ عَلَى يَمِينٍ فَرَأَى غَيْرَها خَيْرًا مِنْها

### باسی ئەو کەسەی سوێند دەخوات لەسەر شتێک، دواتر ببینێت خێر لە غەیری ئەو شتەدایە

٣٧٨. عَنْ عَدِيِّ بْنِ حَاتِمٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ حَلَفَ عَلَى يَمِينٍ فَرَأَى غَيْرَها خَيْرًا مِنْها، فَلْيَأْتِ الَّذِي هوَ خَيْرٌ، وَلْيُكَفِّرْ عَنْ يَمِينِه».

عەدی کوڕی حاتیم ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «هەر کەسێک سوێندی لەسەر شتێک خوارد، پاشان شتێکی باشتری بینی، با ئەوەی کە باشترە ئەنجامی بدات و کەفارەتی سوێندەکەی بدات».

## بَابُ النَّهيِ أَنْ يَسْتَلِجَّ الرَّجُلُ فِي يَمِينِه، وَلَا يُكَفِّرَ

### باسی ڕێگریکردن لەوەی پیاو پێداگری بکات لەسەر سوێندەکەی و کەفارەتیش نەدات

٣٧٩. عَنْ أَبِي هرَيْرَةَ ﷺ يَقُولُ: قَالَ أَبُو الْقَاسِمِ ﷺ: «إِذَا اسْتَلَجَّ أَحَدُكُمْ فِي الْيَمِينِ فَإِنَّه آثَمُ، لَه عِنْدَ اللَّه مِنَ الْكَفَّارَةِ الَّتِي أُمِرَ بِها».

ئەبو هوڕەیرە ﷺ دەڵێ: ئەبولقاسیم ﷺ فەرموویەتی: «هەر یەکێک لە ئێوە پێداگری بکات لەسەر سوێندەکەی (هەرچەندە شتێکی باشتریش ببینێت لەوەی کە سوێندی

لەسەر خواردووە)، لەلای خوا گوناهبارە بەهۆی ئەنجامنەدانی ئەو کەفارەتەی کە فەرمانی پێ کراوە، (واتە: لەبەرئەوەی کە شتێکی باشتری بینی لەوەی کە سوێندی لەسەر خواردووە، دەبێت سوێندەکەی بشکێنێت و کەفارەتەکەی بدات)».

## بَابُ إِبْرَارِ الْمُقْسِمِ

### باسی جێبەجێکردنی سوێندی سوێندخۆر

٣٨٠. عَنِ الْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ رضي الله عنه قَالَ: أَمَرَنَا رَسُولُ اللَّه ﷺ بِإِبْرَارِ الْمُقْسِمِ.

بەڕائی کوڕی عازیب رضي الله عنه دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێ کردین بە جێبەجێکردنی سوێندی سوێندخۆر.

## بَابُ النَّهيِ أَنْ يُقَالَ: مَا شَاءَ اللَّه وَشِئْتَ

### باسی ڕێگریکردن لەوەی بگوترێت: ئەگەر خوا بیەوێت و تۆش بتەوێت

٣٨١. عَنْ حُذَيْفَةَ بْنِ الْيَمَانِ رضي الله عنه: أَنَّ رَجُلاً مِنَ الْمُسْلِمِينَ رَأَى فِي النَّوْمِ أَنَّه لَقِيَ رَجُلاً مِنْ أَهلِ الْكِتَابِ، فَقَالَ: نِعْمَ الْقَوْمُ أَنْتُمْ لَوْلَا أَنَّكُمْ تُشْرِكُونَ، تَقُولُونَ: مَا شَاءَ اللَّه وَشَاءَ مُحَمَّدٌ، وَذَكَرَ ذَلِكَ لِلنَّبِيِّ ﷺ، فَقَالَ: «أَمَا وَاللَّه، إِنْ كُنْتُ لَأَعْرِفُها لَكُمْ، قُولُوا: مَا شَاءَ اللَّه، ثُمَّ شَاءَ مُحَمَّدٌ».

حوزەیفەی کوڕی یەمان رضي الله عنه دەگێڕێتەوە: کە پیاوێک لە موسوڵمانان لە خەویدا بینیی کە گەیشت بە پیاوێک لە ئەهلی کیتاب، جا گوتی: ئێوە باشترین گەل و هۆزن، ئەگەر هاتبا و هاوبەشیدانانتان نەکردبا و نەتانگوتبا: ئەگەر خوا بیەوێت و موحەممەدیش ﷺ بیەوێت، جا ئەوە بۆ پێغەمبەر ﷺ باس کرا، ئەویش فەرمووی: «سوێند بە خوا نەمزانیوە کە ئەو وشەیە ئاوا بەکار دێنن، (لەمەودوا) بڵێن: ئەگەر خوا بیەوێت،

پاشانیش موحەممەد ﷺ بیەوێت».

## بَابُ مَنْ وَرَّى فِي يَمِينِه

### باسی ئەو کەسەی لە سوێندخواردندا نییەتی دەشارێتەوە

٣٨٢. عَنْ سُوَيْدِ بْنِ حَنْظَلَةَ ﵁ قَالَ: خَرَجْنَا نُرِيدُ رَسُولَ اللّٰه ﷺ، وَمَعَنَا وَائِلُ بْنُ حُجْرٍ فَأَخَذَه عَدُوٌّ لَه، فَتَحَرَّجَ النَّاسُ أَنْ يَحْلِفُوا، فَحَلَفْتُ أَنَا أَنَّه أَخِي، فَخَلَّى سَبِيلَه، فَأَتَيْنَا رَسُولَ اللّٰه ﷺ، فَأَخْبَرْتُه أَنَّ الْقَوْمَ تَحَرَّجُوا أَنْ يَحْلِفُوا وَحَلَفْتُ أَنَا أَنَّه أَخِي، فَقَالَ: «صَدَقْتَ، الْمُسْلِمُ أَخُو الْمُسْلِمِ».

سوەیدی کوڕی حەنزەلە ﵁ دەڵێت: دەرچووین کە بڕۆین بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ، وائیلی کوڕی حوجریشمان لەگەڵ بوو، جا دوژمنێکی خۆی تووشی بوو، خەڵکەکەش بەلایانەوە قورس بوو کە سوێند بخۆن (بۆ ڕزگارکردنی وائیل لە شەڕی دوژمنەکەی)، بۆیە من سوێندم خوارد کە ئەو برای منە، دوژمنەکەی وازی لێ هێنا، پاشان کە هاتینە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ و هەواڵی ئەوەم پێ دا کە خەڵکەکە لەلایان قورس بووە سوێند بخۆن، بۆیە من سوێندم خوارد کە ئەو برای منە، ئەویش فەرمووی: «ڕاستت گوتووە، موسوڵمان برای موسوڵمانە».

٣٨٣. عَنْ أَبِي هرَيْرَةَ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللّٰه ﷺ: «إِنَّمَا الْيَمِينُ عَلَى نِيَّةِ الْمُسْتَحْلِفِ».

ئەبو هورەیرە ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «بەڕاستی سوێندخواردن بەگوێرەی نییەتی ئەو کەسەیە کە داوای سوێندخواردنەکە دەکات (نەک ئەو کەسەی کە سوێندەکە دەخوات)».

٣٨٤. عَنْ أَبِي هرَيْرَةَ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللّٰه ﷺ: «يَمِينُكَ عَلَى مَا يُصَدِّقُكَ بِه صَاحِبُكَ».

ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «سوێندخواردنی تۆ بەگوێرەی نییەتی هاوڕێکەتە، کە داوای سوێندخواردنت لێ دەکات و بەهۆیەوە بەڕاستت دەزانێت».

## بَابُ النَّهيِ عَنِ النَّذْرِ

### باسی ناپەسندی نەزرکردن

٣٨٥. عَنْ أَبِي هرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه ﷺ: «إِنَّ النَّذْرَ لَا يَأْتِي ابْنَ آدَمَ بِشَيْءٍ إِلَّا مَا قُدِّرَ لَه، وَلَكِنْ يَغْلِبُه الْقَدَرُ مَا قُدِّرَ لَه، فَيُسْتَخْرَجُ بِه مِنَ الْبَخِيلِ فَيُيَسَّرُ عَلَيْه مَا لَمْ يَكُنْ يُيَسَّرُ عَلَيه مِنْ قَبْلِ ذَلِكَ، وَقَدْ قَالَ اللَّه: أَنْفِقْ أُنْفِقْ عَلَيْكَ».

ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «بەڕاستی نەزرکردن هیچ شتێک بە ئادەمیزاد نابەخشێت، تەنها ئەوە نەبێت کە بۆی دیاری کراوە، بەڵام بەدەستهێنانی ئەو شتەی کە بۆی دیاری کراوە لەسەری قورسە، جا نەزر ئەوانە پێی هەڵدەستن کە چرووکن، جا ئەو شتەی کە پێشتر بۆیان ئاسان نەبوو لەسەریان ئاسان دەبێت، بێگومانیش خوا فەرموویەتی: ببەخشە، پێت دەبەخشم».

## بَابُ النَّذْرِ فِي الْمَعْصِيَةِ

### باسی نەزرکردن لە گوناهـ و سەرپێچیدا

٣٨٦. عَنْ عِمْرَانَ بْنِ الْحُصَيْنِ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه ﷺ: «لَا نَذْرَ فِي مَعْصِيَةٍ، وَلَا نَذْرَ فِيمَا لَا يَمْلِكُ ابْنُ آدَمَ».

عیمرانی کوڕی حوصەین ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «لە گوناهـ و سەرپێچیدا نەزرکردن نییە، هەروەها نەزرکردن لە شتێکدا نییە کە لە توانای

ئادەمیزاددا نەبێت».

٣٨٧. عَنْ عَائِشَةَ ﵂: أَنَّ رَسُولَ اللَّه ﷺ قَالَ: «لَا نَذْرَ فِي مَعْصِيَةٍ، وَكَفَّارَتُه كَفَّارَةُ يَمِينٍ».

عائیشه ﵂ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «نەزرکردن لە گوناهـ و سەرپێچیدا نییە، کەفارەتەکەشی وەکوو کەفارەتی سوێندخواردنە».

## بَابُ مَنْ نَذَرَ أَنْ يَحُجَّ مَاشِيًا

### باسی کەسێك کە نەزری کردووە بەپێ بڕوات بۆ حەجکردن

٣٨٨. عَنْ أَبِي هرَيْرَةَ ﵁ قَالَ: رَأَى النَّبِيُّ ﷺ شَيْخًا يَمْشِي بَيْنَ ابْنَيْه، فَقَالَ: «مَا شَأْنُ هذَا؟»، قَالَ ابْنَاه: نَذْرٌ يَا رَسُولَ اللَّه، قَالَ: «ارْكَبْ أَيُّها الشَّيْخُ، فَإِنَّ اللَّه غَنِيٌّ عَنْكَ وَعَنْ نَذْرِكَ».

ئەبو هورەیرە ﵁ دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ پیاوێکی بەتەمەنی بینی کە دوو کوڕی چووبوونە ژێر باڵی و لە نێوانیاندا ڕێی دەکرد، جا فەرمووی: «ئەوە حاڵی بۆ ئاوایە؟»، کوڕەکانی گوتیان: ئەوە نەزرە ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ (نەزری کردووە کە بەپێ بڕوات بۆ حەج)، فەرمووی: «ئەی پیرەپیاو سواری وڵاخ بە، بەڕاستی خوای گەورە بێنیازە لە خۆت و لە نەزرەکەشت».

# كِتَابُ التِّجَارَاتِ

## پەرتووکی بازرگانی

### بَابُ الْحَثِّ عَلَى الْمَكَاسِبِ

باسی هاندان لەسەر کارکردن

٣٨٩. عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ أَطْيَبَ مَا أَكَلَ الرَّجُلُ مِنْ كَسْبِهِ، وَإِنَّ وَلَدَهُ مِنْ كَسْبِهِ».

عائیشه ﵂ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «بێگومان پاکترین شتێک کە پیاو دەیخوات بەرهەمی کار و ئیشی (دەستی) خۆیەتی، بێگومان منداڵیش بەشێکن لە بەروبوومی مرۆڤ».

٣٩٠. عَنِ الْمِقْدَامِ بْنِ مَعْدِيكَرِبَ الزُّبَيْدِيِّ ﵁ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «مَا كَسَبَ الرَّجُلُ كَسْبًا أَطْيَبَ مِنْ عَمَلِ يَدِهِ، وَمَا أَنْفَقَ الرَّجُلُ عَلَى نَفْسِهِ وَأَهْلِهِ وَوَلَدِهِ وَخَادِمِهِ، فَهوَ صَدَقَةٌ».

میقدامی کوڕی مەعدیکەریبی زوبەیدی ﵁ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «هیچ بەرهەمێک باشتر نییە بۆ پیاو لە بەرهەمی دەستی خۆی، ئەوەی

کە پیاو (پەیدای دەکات) دەیکاتە بژێوی ژیانی خۆی و خانەوادەکەی و منداڵەکانی و خزمەتکارەکەی، ئەوە بۆی بە چاکە و خێر دەنووسرێت».

٣٩١. عَنْ مُعَاذِ بْنِ عَبْدِ اللَّه بْنِ خُبَيْبٍ، عَنْ أَبِيه، عَنْ عَمِّه ﵁ قَالَ: كُنَّا فِي مَجْلِسٍ، فَجَاءَ النَّبِيُّ ﷺ وَعَلَى رَأْسِه أَثَرُ مَاءٍ، فَقَالَ لَه بَعْضُنَا: نَرَاكَ الْيَوْمَ طَيِّبَ النَّفْسِ، فَقَالَ: «أَجَلْ وَالْحَمْدُ لِلَّه»، ثُمَّ أَفَاضَ الْقَوْمُ فِي ذِكْرِ الْغِنَى، فَقَالَ: «لَا بَأْسَ بِالْغِنَى لِمَنِ اتَّقَى، وَالصِّحَّةُ لِمَنِ اتَّقَى خَيْرٌ مِنَ الْغِنَى، وَطِيبُ النَّفْسِ مِنَ النَّعِيمِ».

موعازی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی خوبەیب لە باوکیەوە لە مامیەوە ﵁ دەگێڕێتەوە، گوتوویەتی: ئێمە لە مەجلیسێک بووین، پێغەمبەر ﷺ هات و شوێنەواری ئاو بە سەریەوە دیار بوو، ئینجا هەندێکمان پێمان گوت: ئەمڕۆ دەتبینین کە دڵخۆشیت، فەرمووی: «بەڵێ سوپاس بۆ خوا»، پاشان زۆر باسی دەوڵەمەندیمان کرد، فەرمووی: «دەوڵەمەندی بۆ کەسی پارێزکار هیچ کێشە و زەرەرێکی نییە، هەروەها تەندروستی جەستە بۆ کەسی پارێزکار باشترە لە دەوڵەمەندی، وە دەروونی ئارام و ڕازی (بە بەشی خۆی) یەکێکە لە نیعمەتەکان».

## بَابُ الِاقْتِصَادِ فِي طَلَبِ الْمَعِيشَةِ

### باسی مامناوەندی لە بەدەستهێنانی بژێویی ژیاندا

٣٩٢. عَنْ أَبِي حُمَيْدٍ السَّاعِدِيِّ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه ﷺ: «أَجْمِلُوا فِي طَلَبِ الدُّنْيَا، فَإِنَّ كُلًّا مُيَسَّرٌ لِمَا خُلِقَ لَه».

ئەبو حومەیدی ساعیدی ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «لە داواکردنی خۆشییەکانی دونیادا میانگیر بن (زێدەڕۆیی مەکەن و خۆتان زیاد لە پێویست ماندوو مەکەن)، چونکە هەر کەسێك ئەو شتەی کە بۆی دانراوە (لە قەدەردا ڕێگای بەدەستهێنانیشی) بۆی ئاسان کراوە».

## بَابُ التَّوَقِّي فِي التِّجَارَةِ

### باسی دوورگرتن له بازرگانیدا

٣٩٣. عَنْ قَيْسِ بْنِ أَبِي غَرَزَةَ ﷺ قَالَ: كُنَّا نُسَمَّى فِي عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ السَّمَاسِرَةَ، فَمَرَّ بِنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، فَسَمَّانَا بِاسْمٍ هوَ أَحْسَنُ مِنْه، فَقَالَ: «يَا مَعْشَرَ التُّجَّارِ إِنَّ الْبَيْعَ يَحْضُرُه الْحَلِفُ وَاللَّغْوُ، فَشُوبُوه بِالصَّدَقَةِ».

قەیسی کوڕی ئەبو غەڕەزە ﷺ دەڵێت: له سەردەمی پێغەمبەری خوادا ﷺ پێیان دەگوتین: دەلاڵ، ئینجا جارێك پێغەمبەری خوا ﷺ بەلاماندا تێپەڕی و بە ناوێک ناوی ناین کە جوانتر و چاکتر بوو (لە ناوی دەلاڵ)، ئینجا فەرمووی: «ئەی کۆمەڵی بازرگانان لە ڕاستیدا کڕین و فرۆشتن و بازرگانی سوێندخواردن و قسەی پووچی لەگەڵ تێکەڵ دەبێت، بۆیە (ماڵەکەتان) بە خێر و بەخشین پاک بکەنەوە».

## بَابُ الصِّنَاعَاتِ

### باسی پیشەسازی

٣٩٤. عَنْ أَبِي هرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه ﷺ: «مَا بَعَثَ اللَّه نَبِيًّا إِلَّا رَاعِيَ غَنَمٍ»، قَالَ لَه أَصْحَابُه: وَأَنْتَ يَا رَسُولَ اللَّه؟ قَالَ: «وَأَنَا كُنْتُ أَرْعَاها لِأَهلِ مَكَّةَ بِالْقَرَارِيطِ». قَالَ سُوَيْدٌ: يَعْنِي كُلَّ شَاةٍ بِقِيرَاطٍ.

ئەبو هوڕەیرە ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «هەر پێغەمبەرێک کە خوا ڕەوانەی کردبێت، ئەوە شوانی مەڕوماڵاتی کردووە»، هاوەڵەکانی پێیان گوت: تۆش ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ؟ فەرمووی: «منیش بۆ خەڵکی مەککە ماڵاتم دەلەوەڕاند بە چەند قیراتێک». سوەید دەڵێت: واتە: هەر مەڕێک بە قیراتێک.

تێبینی:

(قیراط): جۆرێکە لە پارەی ئەو سەردەمە، کە نیوەی دەیەکی دینارێکی ئەو کاتەی دەکرد.

٣٩٥. عَنْ أَبِي هرَيْرَةَ ﷺ: أَنَّ رَسُولَ اللَّه ﷺ قَالَ: «كَانَ زَكَرِيَّا ﷺ نَجَّارًا».

ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «زەکەریا ﷺ دارتاش بووە».

## بَابُ الْحُكْرَةِ وَالْجَلْبِ

### باسی قۆرخکاری و بازرگانی



٣٩٦. عَنْ مَعْمَرِ بْنِ عَبْدِ اللَّه بْنِ نَضْلَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه ﷺ: «لَا يَحْتَكِرُ إِلَّا خَاطِئٌ».

مەعمەری کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی نەزلە ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «هەر کەسێك قۆرخکاری و پاوانکاری بکات گوناهبارە».

تێبینی:

(محتكر): ئەو کەسەیە کە دەست بەسەر بازاڕدا دەگرێت بۆ ئەوەی شتومەک لەسەر خەڵکی گران بێت، بۆ خۆی سوودی ماددی ببینێت لەسەر حیسابی خەڵکی دیکە.

## بَابُ الْأَجْرِ عَلَى تَعْلِيمِ الْقُرْآنِ

### باسی وەرگرتنی کرێ لەسەر فێرکردنی قوڕئان

٣٩٧. عَنْ عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ ﷺ قَالَ: عَلَّمْتُ نَاسًا مِنْ أَهلِ الصُّفَّةِ الْقُرْآنَ وَالْكِتَابَةَ،

فَأَهدَى إِلَيَّ رَجُلٌ مِنهمْ قَوْسًا، فَقُلْتُ: لَيْسَتْ بِمَالٍ، وَأَرْمِي عَنْها فِي سَبِيلِ اللَّه، فَسَأَلْتُ رَسُولَ اللَّه ﷺ عَنْها، فَقَالَ: «إِنْ سَرَّكَ أَنْ تُطَوَّقَ بِها طَوْقًا مِنْ نَارٍ فَاقْبَلْها».

عوبادەی کوڕی صامیت ﷺ دەڵێت: هەندێك خەڵكم لە ئەهلی صوففە فێری قوڕئانخوێندن و نووسین کرد، پیاوێکیان کەوانێکی بە دیاری پێ دام، منیش گوتم: (کەوان) وەکوو پارە نییە و لەپێناو خوادا پێی دەجەنگم (قبووڵم کرد)، پرسیارم لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد لەوبارەوە، فەرمووی: «ئەگەر پێتخۆشە بکرێتە تەوقێکی ئاگرین و پێی تەوق بکرێیت وەریبگرە».

## بَابُ مَا جَاءَ فِي النَّهيِ عَنِ النَّجْشِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی ڕێگریکردن لە زیادکردنی نرخ بۆ فریودانی کڕیار

٣٩٨. عَنْ أَبِي هرَيْرَةَ ﷺ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «لَا تَنَاجَشُوا».

ئەبو هوڕەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: «بە فێڵ و تەفرەدان نرخی شتومەک زیاد مەکەن (بۆ تەفرەدانی کڕیار)».

## بَابُ النَّهيِ عَنْ تَلَقِّي الْجَلَبِ

### باسی ڕێگریکردن لە بەدەمەوەچوونی ئەوانەی کاڵا دێنن بۆ بازاڕ

٣٩٩. عَنْ أَبِي هرَيْرَةَ ﷺ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «لَا تَلَقَّوْا الْأَجْلَابَ، فَمَنْ تَلَقَّى مِنْه شَيْئًا فَاشْتَرَى، فَصَاحِبُه بِالْخِيَارِ إِذَا أَتَى السُّوقَ».

ئەبو هوڕەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: «بەپیر ئەوانەوە مەچۆن (بۆ دەرەوەی بازاڕ) کە کەلوپەل و کاڵا دێنن، جا ئەگەر کەسێک بەرەو ڕوویان

چوو و لێی کڕین، ئەوە هاوەڵەکەی (فرۆشیارەکەی لە دەرەوە هاتووە) کاتێک هاتە نێو بازاڕ سەرپشکە لەوەی کە مامەڵەکە هەڵدەوەشێنێتەوە یان جێبەجێی دەکات».

## بَابُ الْبَيِّعَانِ بِالْخِيَارِ مَا لَمْ يَفْتَرِقَا

### باسی کڕیار و فرۆشیار هەلی پەشیمانبوونەوەیان هەیە هەتا لەیەکدی جیا دەبنەوە

٤٠٠. عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «إِذَا تَبَايَعَ الرَّجُلَانِ فَكُلُّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا بِالْخِيَارِ مَا لَمْ يَفْتَرِقَا وَكَانَا جَمِيعًا، أَوْ يُخَيِّرَ أَحَدُهمَا الْآخَرَ، فَإِنْ خَيَّرَ أَحَدُهمَا الْآخَرَ فَتَبَايَعَا عَلَى ذَلِكَ، فَقَدْ وَجَبَ الْبَيْعُ، وَإِنْ تَفَرَّقَا بَعْدَ أَنْ تَبَايَعَا، وَلَمْ يَتْرُكْ وَاحِدٌ مِنْهمَا الْبَيْعَ، فَقَدْ وَجَبَ الْبَيْعُ».

عەبدوڵڵای کوڕی عومەر رضي الله عنهما دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «ئەگەر دوو پیاو مامەڵەیان کرد بەیەکەوە، هەر یەکێکیان مافی سەرپشکبوونی هەیە (بۆ هەڵوەشاندنەوەی مامەڵەکە)، مادام لەیەک جیا نەبوونەوە، یان ئەگەر یەکێکیان ئەوی دیکەی سەرپشک کرد، جا ئەگەر یەکێکیان ئەوی دیکەی سەرپشک کرد و مامەڵەکەیان لەسەر ئەوە کرد، مامەڵەکە دادەمەزرێت (مافی نامێنێت)، خۆ ئەگەر لەدوای ئەوەی مامەڵەکەیان کرد و ئەوجار لەیەک جیا بوونەوە و هیچیان مامەڵەکەیان واز لێ نەهێنا، بێگومان مامەڵەکە دادەمەزرێت (دەرفەتی پەشیمانی تێدا نامێنێت)».

## بَابُ بَيْعِ الْخِيَارِ

### باسی ئەوە کە کڕین و فرۆشتن بە ڕەزامەندییە

٤٠١. عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ رضي الله عنه يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّمَا الْبَيْعُ عَنْ تَرَاضٍ».

ئەبو سەعیدی خودری ﵁ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «بێگومان کڕین و فرۆشتن دەبێت بە ڕەزامەندی هەردوو لا بێت».

## بَابُ النَّهْيِ عَنْ بَيْعِ مَا لَيْسَ عِنْدَكَ، وَعَنْ رِبْحِ مَا لَمْ يُضْمَنْ

## باسی ڕێگریکردن لە فرۆشتنی شتێک لەلات نەبێت و قازانجێک کە مسۆگەر نەبێت

٤٠٢. عَنْ حَكِيمِ بْنِ حِزَامٍ ﵁ قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّه الرَّجُلُ يَسْأَلُنِي الْبَيْعَ وَلَيْسَ عِنْدِي، أَفَأَبِيعُه؟ قَالَ: «لَا تَبِعْ مَا لَيْسَ عِنْدَكَ».

حەکیمی کوڕی حیزام ﵁ دەڵێت: گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ پیاو هەیە داوای فرۆشتنی شتێکم لێ دەکات کە ئەو شتە لەو کاتەدا لەلام نییە، جا ئایا پێی بفرۆشم؟ فەرمووی: «شتێک مەفرۆشە کە لەلای خۆت نییە».

## بَابُ الْإِقَالَةِ

## باسی قبووڵکردنی پەشیمانبوونەوە لە مامەڵە

٤٠٣. عَنْ أَبِي هرَيْرَةَ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه ﷺ: «مَنْ أَقَالَ مُسلِمًا، أَقَالَه اللَّه عَثْرَتَه يَوْمَ الْقِيَامَةِ».

ئەبو هوڕەیرە ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «هەر کەسێک چاوپۆشی بکات لە هەڵوەشاندنەوەی مامەڵەی موسوڵمانێک، لە ڕۆژی دواییدا خوا چاوپۆشی لە گوناهەکانی دەکات».

## بَابُ مَنْ كَرِهِ أَنْ يُسَعِّرَ

### باسی ئەوەی نرخ دانانی لەلا ناپەسندە

٤٠٤. عَنْ أَبِي سَعِيدٍ ﷺ قَالَ: غَلَا السِّعْرُ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّه ﷺ، فَقَالُوا: لَوْ قَوَّمْتَ يَا رَسُولَ اللَّه قَالَ: «إِنِّي لَأَرْجُو أَنْ أُفَارِقَكُمْ وَلَا يَطْلُبَنِي أَحَدٌ مِنْكُمْ بِمَظْلِمَةٍ ظَلَمْتُه».

ئەبو سەعید ﷺ دەڵێت: لە سەردەمی پێغەمبەری خوا ﷺ نرخی کەلوپەل زیاد هەڵکشا، جا عەرزیان کرد: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەگەر نرخت دیاری کردبا، فەرمووی: «لە ڕاستیدا من ئومێدم وایە کاتێك لێتان جیا دەبمەوە هیچ یەکێک لە ئێوە نەبێت کە داواکاری مافێکی لەسەر من هەبێت».

## بَابُ السَّمَاحَةِ فِي الْبَيْعِ

### باسی ئاسانکاری و چاوپۆشی لە کڕین و فرۆشتن

٤٠٥. عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّه ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه ﷺ: «رَحِمَ اللَّه عَبْدًا سَمْحًا إِذَا بَاعَ، سَمْحًا إِذَا اشْتَرَى، سَمْحًا إِذَا اقْتَضَى».

جابیری کوڕی عەبدوڵڵا ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «ڕەحمەتی خوا لەو کەسە بێت کە ئاسانکار و لێبووردەیە کاتێك کە (شتێك) دەفرۆشێت، کاتێك کە (شتێك) دەکڕێت، کاتێك مافێکی هەیە و داوای دەکاتەوە (یان لە کاتی قەرزوەرگرتنەوە)».

## بَابُ السَّوْمِ

### باسی زیاد تێبەستن لە مامەڵەدا (هەڵدا و پێدا)

٤٠٦. عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: كُنْتُ مَعَ النَّبِيِّ ﷺ فِي غَزْوَةٍ، فَقَالَ لِي: «أَتَبِيعُ نَاضِحَكَ هَذَا بِدِينَارٍ وَاللَّهُ يَغْفِرُ لَكَ؟»، قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ هوَ نَاضِحُكُمْ إِذَا أَتَيْتُ الْمَدِينَةَ، قَالَ: «فَتَبِيعُه بِدِينَارَيْنِ وَاللَّهُ يَغْفِرُ لَكَ؟»، قَالَ: فَمَا زَالَ يَزِيدُنِي دِينَارًا دِينَارًا، وَيَقُولُ مَكَانَ كُلِّ دِينَارٍ: «وَاللَّهُ يَغْفِرُ لَكَ»، حَتَّى بَلَغَ عِشْرِينَ دِينَارًا، فَلَمَّا أَتَيْتُ الْمَدِينَةَ أَخَذْتُ بِرَأْسِ النَّاضِحِ، فَأَتَيْتُ بِه النَّبِيَّ ﷺ، فَقَالَ: «يَا بِلَالُ أَعْطِه مِنَ الْغَنِيمَةِ عِشْرِينَ دِينَارًا»، وَقَالَ: «انْطَلِقْ بِنَاضِحِكَ فَاذْهَبْ بِه إِلَى أَهْلِكَ».

جابیری کوڕی عەبدوڵلا ﷺ دەڵێت: لە یەکێک لە غەزاکاندا لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ بووم، پێی فەرمووم: «ئایا ئەو وشترەت نافرۆشیت بە دینارێک، خوا لێت خۆش دەبێت؟»، گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ وشتری خۆتانە هەرکات هاتمەوە بۆ مەدینە، فەرمووی: «دەی دەیفرۆشیت بە دوو دینار، خوا لێت خۆش دەبێت؟»، گوتی: بەردەوام زیادی پێ دەدام دینار بە دینار زیادی دەکرد، وە لەگەڵ هەر دینارێکدا (کە زیادی دەکرد) دەیفەرموو: «خوا لێت خۆش دەبێت»، تاکوو گەیشتە بیست دینار، جا کاتێک چوومەوە مەدینە وشترەکەم گرت و بردم بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ، ئەویش فەرمووی: «ئەی بیلال، لە دەستکەوتی جەنگ بیست دیناری بدەیە»، وە (بە منیشی) فەرموو: «وشترەکە بەرەوە و بڕۆ بیبە بۆ خانەوادەکەت».

٤٠٧. عَنْ أَبِي قَتَادَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِيَّاكُمْ وَالْحَلِفَ فِي الْبَيْعِ، فَإِنَّه يُنَفِّقُ، ثُمَّ يَمْحَقُ».

ئەبو قەتادە ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «خۆتان بپارێزن لە سوێندخواردن لە کاتی مامەڵەدا، چونکە شتەکە ساغ دەکاتەوە و دەفرۆشێت، بەڵام بێبەرەکەتی دەکات».

## بَابُ النَّهْيِ عَنْ بَيْعِ الثِّمَارِ قَبْلَ أَنْ يَبْدُوَ صَلَاحُهَا

### باسی ڕێگریکردن لە فرۆشتنی میوەجات پێش ئەوەی پێبگات

٤٠٨. عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﵄ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «لَا تَبِيعُوا الثَّمَرَةَ حَتَّى يَبْدُوَ صَلَاحُهَا»، نَهَى الْبَائِعَ وَالْمُشْتَرِيَ.

ئیبن عومەر ﵄ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «میوە مەفرۆشن تاکوو پێگەیشتنی لێ بەدەر دەکەوێت»، ڕێگریی لە فرۆشیار و کڕیار کردووە (لەو جۆرە مامەڵەیە).

تێبینی:

(يَبْدُوَ صَلَاحُهَا): واتە: ئەو میوەیەی بە دارەوەیە لە ئافات دەرچێت و ئەوەی لێ بەدەر کەوێت، کە دەگونجێت ئەو میوەیە پێبگات و هەڵنەوەرێت، زیان بە کڕیار نەگات.

## بَابُ الرُّجْحَانِ فِي الْوَزْنِ

### باسی کێشان و پێوان بەسەنگەوە

٤٠٩. عَنْ سُوَيْدِ بْنِ قَيْسٍ ﵁ قَالَ: جَلَبْتُ أَنَا وَمَخْرَفَةُ الْعَبْدِيُّ بَزًّا مِنْ هجَرَ، فَجَاءَنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، فَسَاوَمَنَا سَرَاوِيلَ، وَعِنْدَنَا وَزَّانٌ يَزِنُ بِالْأَجْرِ، فَقَالَ لَهُ النَّبِيُّ ﷺ: «يَا وَزَّانُ زِنْ وَأَرْجِحْ».

سوەیدی کوڕی قەیس ﵁ دەڵێت: لەگەڵ مەخڕەفەی عەبدی لە هەجەڕەوە قوماشمان هێنا، پێغەمبەری خوا ﷺ سەودای شەڕواڵێکی لێ کردین، وە کەسێکمان لەلا بوو بەکرێ کەلوپەلی دەکێشا، جا پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو: «ئەی ئەو کەسەی دەکێشیت، بکێشە بەسەنگەوە (واتە: گران بکێشە و بەزیادەوە بیدەرێ)».

٤١٠. عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّه ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه ﷺ: «إِذَا وَزَنْتُمْ فَأَرْجِحُوا».

جابیری کوڕی عەبدوڵلا ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «هەر کاتێک شتتان کێشا بەسەنگەوە بیکێشن».

## بَابُ النَّهْيِ عَنِ الْغِشِّ

### باسی قەدەغەکردنی فێڵ و گزیکردن

٤١١. عَنْ أَبِي هرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: مَرَّ رَسُولُ اللَّه ﷺ بِرَجُلٍ يَبِيعُ طَعَامًا، فَأَدْخَلَ يَدَه فِيه فَإِذَا هوَ مَغْشُوشٌ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّه ﷺ: «لَيْسَ مِنَّا مَنْ غَشَّ».

ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ بەلای پیاوێکدا تێپەڕیی کە خواردەمەنی دەفرۆشت، ئینجا (پێغەمبەر ﷺ) دەستی خستە نێویەوە بینیی کە فێڵی تێدا کراوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: «ئەو کەسەی فێڵ و گزی بکات لە ئێمە نییە».

## بَابُ النَّهْيِ عَنْ بَيْعِ الطَّعَامِ قَبْلُ مَا لَمْ يُقْبَضْ

### باسی ناپەسندی فرۆشتنی خواردن پێش ئەوەی دەست بە دەست وەربگیرێت

٤١٢. عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «مَنِ ابْتَاعَ طَعَامًا فَلَا يَبِعْه حَتَّى يَسْتَوْفِيَه».

ئیبن عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: «هەر کەسێک خۆراکێکی کڕی با نەیفرۆشێتەوە هەتاکوو بەتەواوی وەریدەگرێت».

## بَابُ بَيْعِ الْمُجَازَفَةِ

### باسی فرۆشتنی بێ پێوانە و کێشانە (لەگۆترە)

٤١٣. عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: كُنَّا نَشْتَرِي الطَّعَامَ مِنَ الرُّكْبَانِ جِزَافًا، فَنَهَانَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَنْ نَبِيعَه حَتَّى نَنْقُلَه مِنْ مَكَانِه.

ئیبن عومەر رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا دەڵێت: ئێمە بەگۆترە خۆراكمان لەو كەسانە دەكڕی كە لە دەرەوەی شار دەیانهێنا، دوایی پێغەمبەری خوا ﷺ لێی قەدەغە كردین كە بیفرۆشینەوە هەتا لە شوێنی خۆی دەیگوازینەوە (واتە: بۆ ئەوەی بوو، گواستنەوەكە بەتەواوی دەستاودەستی پێ بكرێت).

٤١٤. عَنْ عُثْمَانَ بْنِ عَفَّانَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ: كُنْتُ أَبِيعُ التَّمْرَ فِي السُّوقِ، فَأَقُولُ: كِلْتُ فِي وَسْقِي هذَا كَذَا، فَأَدْفَعُ أَوْسَاقَ التَّمْرِ بِكَيْلِه، وَآخُذُ شِفِّي، فَدَخَلَنِي مِنْ ذَلِكَ شَيْءٌ، فَسَأَلْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَ: «إِذَا سَمَّيْتَ الْكَيْلَ فَكِلْه».



عوسمانی كوڕی عەففان رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ دەڵێت: لە بازاڕ خورمام دەفرۆشت، جا (بە كڕیارم) دەگوت: پێوانەم كردووە و ئەوەندەیە، ئەو ئەندازە دیاریكراوەی كە پێوانەم كردبوو بە هەمان پێوانە دەمدایە كڕیار، وە قازانجی خۆم وەردەگرت، ئیدی منیش گومانم بۆ دروست بوو لەو كارە (كە بە پێوانەی خۆم كە كڕیبووم دەمفرۆشتەوە)، بۆیە پرسیارم لە پێغەمبەری خوا ﷺ كرد، فەرمووی: «كاتێك پێوانەكەت دیاری كرد، بە قورس بیپێوە».

## بَابُ مَا يُرْجَى فِي كَيْلِ الطَّعَامِ مِنَ الْبَرَكَةِ

### باسی ئومێدی پیت و بەرەكەت لە پێوانە و كێشانی خۆراكدا

٤١٥. عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ بُسْرٍ الْمَازِنِيِّ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «كِيلُوا

طَعَامَكُمْ يُبَارَكْ لَكُمْ فِيه».

عەبدوڵڵای کوڕی بوسری مازینی ﷺ دەڵێت: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: «(لە کاتی کڕین و فرۆشتندا) خۆراکەکانتان بپێون بەرەکەتی تێدەکەوێت بۆتان».

## بَابُ مَا يُرْجَى مِنَ الْبَرَكَةِ فِي الْبُكُورِ

### باسی ئەو بەرەکەتەی چاوەڕوان دەکرێت لە سەرەتای ڕۆژ

٤١٦. عَنْ صَخْرٍ الْغَامِدِيِّ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه ﷺ: «اللَّهُمَّ بَارِكْ لِأُمَّتِي فِي بُكُورِها»، قَالَ: وَكَانَ إِذَا بَعَثَ سَرِيَّةً، أَوْ جَيْشًا بَعَثَهُمْ فِي أَوَّلِ النَّهارِ، قَالَ: وَكَانَ صَخْرٌ رَجُلًا تَاجِرًا، فَكَانَ يَبْعَثُ تِجَارَتَه فِي أَوَّلِ النَّهارِ، فَأَثْرَى وَكَثُرَ مَالُه.

صەخری غامیدی ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «خوایە بەرەکەت و پێز بڕێژە بەسەر ئوممەتەکەمدا ئەوانەی کە لە سەرەتای ڕۆژ دەستبەکار دەبن»، (ڕاوی) دەڵێت: جا کاتێک (پێغەمبەر ﷺ) سریەیەک یان لەشکرێکی بناردبایە ئەوە لە سەرەتای ڕۆژدا دەینارد، (هەروەها ڕاوی) گوتی: صەخر پیاوێکی بازرگان بوو، هەموو جارێک (کاروانە) بازرگانییەکەی لە سەرەتای ڕۆژدا بەڕێ دەکرد، ئیدی دەوڵەمەند بوو و سەروەت و سامانی زۆر بوو.

## بَابُ مَنْ بَا عَ عَيْبًا فَلْيُبَيِّنْه

### باسی ئەوە کە کەسێک شتێکی عەیبداری فرۆشت، دەبێت عەیبەکە باس بکات

٤١٧. عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ ﷺ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّه ﷺ، يَقُولُ: «الْمُسْلِمُ أَخُو الْمُسْلِمِ، وَلَا يَحِلُّ لِمُسْلِمٍ بَا عَ مِنْ أَخِيه بَيْعًا فِيه عَيْبٌ إِلَّا بَيَّنَه لَه».

عوقبەی کوڕی عامیر ﵁ دەڵێت: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: «موسوڵمان برای موسوڵمانە، ڕەوا و دروست نییە بۆ بابای موسوڵمان کە شتێکی عەیبدار بە براکەی بفرۆشێت بەبێ ڕوونکردنەوەی عەیبەکە».

## بَابُ الصَّرْفِ وَمَا لَا يَجُوزُ مُتَفَاضِلاً يَدًا بِيَدٍ

### باسی گۆڕینەوەی پارە، نابێت زیادەی بخرێتە سەر و پێویستە دەست بە دەست بێت

٤١٨. عَنْ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ ﵁ يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللَّه ﷺ: «الذَّهبُ بِالذَّهبِ رِبًا، إِلَّا هاءَ وَهاءَ، وَالْبُرُّ بِالْبُرِّ رِبًا، إِلَّا هاءَ وَهاءَ، وَالشَّعِيرُ بِالشَّعِيرِ رِبًا، إِلَّا هاءَ وَهاءَ، وَالتَّمْرُ بِالتَّمْرِ رِبًا، إِلَّا هاءَ وَهاءَ».

عومەری کوڕی خەتتاب ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «(گۆڕینەوەی) زێڕ بە زێڕ ڕیبایە مەگەر دەست بە دەست بێت، گەنم بە گەنم ڕیبایە مەگەر دەست بە دەست بێت، جۆ بە جۆ ڕیبایە مەگەر دەست بە دەست بێت، خورما بە خورما ڕیبایە مەگەر دەست بە دەست بێت (واتە: ئەوانەی باس کران دەبێت دەست بە دەست بن و قەرز نەبن)».

## بَابُ مَنْ قَالَ: لَا رِبَا إِلَّا فِي النَّسِيئَةِ

### باسی ئەو کەسەی دەڵێت: ڕیبا تەنها لە قەرزدایە!

٤١٩. عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيَّ ﵁ يَقُولُ: الدِّرْهمُ بِالدِّرْهمِ، وَالدِّينَارُ بِالدِّينَارِ، فَقُلْتُ: إِنِّي سَمِعْتُ ابْنَ عَبَّاسٍ، يَقُولُ غَيْرَ ذَلِكَ، قَالَ: أَمَا إِنِّي لَقِيتُ ابْنَ عَبَّاسٍ، فَقُلْتُ: أَخْبِرْنِي عَنْ هذَا الَّذِي تَقُولُ فِي الصَّرْفِ: أَشَيْءٌ سَمِعْتَه مِنْ رَسُولِ اللَّه ﷺ؟ أَمْ شَيْءٌ وَجَدْتَه فِي كِتَابِ اللَّه؟ فَقَالَ: مَا وَجَدْتُه فِي كِتَابِ اللَّه، وَلَا سَمِعْتُه

مِنْ رَسُولِ اللَّه ﷺ، وَلَكِنْ أَخْبَرَنِي أُسَامَةُ بْنُ زَيْدٍ، أَنَّ رَسُولَ اللَّه ﷺ، قَالَ: «إِنَّمَا الرِّبَا فِي النَّسِيئَةِ».

ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەڵێت: درهەم بە درهەم و دینار بە دینار (واتە: بەبێ زیادە)، منیش گوتم: گوێم لە ئیبن عەبباس بوو شتێکی جیاواز لەوە دەڵێت، ئەویش گوتی: بێگومان من بە ئیبن عەبباس گەیشتم جا پێم گوت: دەربارەی ئەوەی کە دەیڵێیت دەربارەی پارە گۆڕینەوە هەواڵم پێ بدە، ئایا هیچ شتێکت لە پێغەمبەری خوا ﷺ بیستووە یان هیچ شتێکت لە قورئاندا بینیوە؟ ئەویش گوتی: نەخێر لە قورئاندا هیچم لەو بارەوە نەدیوە و هیچیشم لە پێغەمبەری خوا ﷺ نەبیستووە، بەڵام ئوسامەی کوڕی زەید پێی ڕاگەیاندم کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «ڕیبا تەنها لە قەرزدایە».

## بَابُ الْحَيَوَانِ بِالْحَيَوَانِ نَسِيئَةً

### باسی فرۆشتنی ئاژەڵ بە ئاژەڵ بەقەرز

٤٢٠. عَنْ سَمُرَةَ بْنِ جُنْدَبٍ ﷺ: أَنَّ رَسُولَ اللَّه ﷺ نَهى عَنْ بَيْعِ الْحَيَوَانِ بِالْحَيَوَانِ نَسِيئَةً.

سەمورەی کوڕی جوندەب ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فرۆشتنی ئاژەڵ بە ئاژەڵی بەقەرز قەدەغە کردووە.

٤٢١. عَنْ جَابِرٍ ﷺ: أَنَّ رَسُولَ اللَّه ﷺ قَالَ: «لَا بَأْسَ بِالْحَيَوَانِ وَاحِدًا بِاثْنَيْنِ، يَدًا بِيَدٍ»، وَكَرِهه نَسِيئَةً.

جابیر ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «فرۆشتنی ئاژەڵێک بە دوو دانە ئاساییە، مادام دەست بە دەست بێت»، بەڵام بەقەرزی پێناخۆش بوو (پێی ڕازی نەبوو).

## بَابُ التَّغْلِيظِ فِي الرِّبَا

### باسی توندگیری لە سووخۆری (ڕیبا)

٤٢٢.عَبْدِ اللَّه بْنِ مَسْعُودٍ ﷺ: أَنَّ رَسُولَ اللَّه ﷺ لَعَنَ آكِلَ الرِّبَا، وَمُوكِلَه، وَشَاهِدِيه، وَكَاتِبَه.

عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ نەفرینی کردووە لەو کەسەی کە سوو دەخوا و لەو کەسەش کە سووەکە دەدات، لەو کەسەش کە دەبێتە شایەتی مامەڵەیەک کە سووی تێدا بێت، ئەو کەسەش کە گرێبەستی مامەڵەکە دەنووسێت.

## بَابُ السَّلَفِ فِي كَيْلٍ مَعْلُومٍ، وَوَزْنٍ مَعْلُومٍ إِلَى أَجَلٍ مَعْلُومٍ

### باسی فرۆشتنی بە سەلەم دەبێت پێوانە و کێشانە و کاتی دیاریکراو بێت

٤٢٣.عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ قَالَ: قَدِمَ النَّبِيُّ ﷺ وَهمْ يُسْلِفُونَ فِي التَّمْرِ، السَّنَتَيْنِ وَالثَّلَاثَ، فَقَالَ: «مَنْ أَسْلَفَ فِي تَمْرٍ، فَلْيُسْلِفْ فِي كَيْلٍ مَعْلُومٍ، وَوَزْنٍ مَعْلُومٍ، إِلَى أَجَلٍ مَعْلُومٍ».

ئیبن عەبباس ﷺ دەڵێت: کاتێک پێغەمبەر ﷺ هات بۆ مەدینە خەڵکی خورمایان بۆ دوو ساڵ و سێ ساڵ سەلەم دەکرد، جا (پێغەمبەر ﷺ) فەرمووی: «هەر کەسێک سەلەم دەکات با پێوانە و کێشانە و کاتەکە دیاری بکات».

تێبینی:

(السلف): واتە: فرۆشتنی پێشوەخت، کە لەلای ئێمە بەو مامەڵەیە دەڵێن: سەلەم.

## بَابُ السَّلَمِ فِي الْحَيَوَانِ

### باسی سەلەمکردن لە ئاژەڵدا

٤٢٤. عَنْ أَبِي رَافِعٍ ﵁: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ اسْتَسْلَفَ مِنْ رَجُلٍ بَكْرًا، وَقَالَ: «إِذَا جَاءَتْ إِبِلُ الصَّدَقَةِ قَضَيْنَاكَ»، فَلَمَّا قَدِمَتْ، قَالَ: «يَا أَبَا رَافِعٍ اقْضِ هذَا الرَّجُلَ بَكْرَه»، فَلَمْ أَجِدْ إِلَّا رَبَاعِيًا فَصَاعِدًا، فَأَخْبَرْتُ النَّبِيَّ ﷺ، فَقَالَ: «أَعْطِه، فَإِنَّ خَيْرَ النَّاسِ أَحْسَنُهُمْ قَضَاءً».

ئەبو ڕافیع ﵁ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ وشترێکی لە پیاوێک بەقەرز وەرگرت و فەرمووی: «ئەگەر وشتری زەکات هات ئەوکاتە پێتی دەدەینەوە»، جا کە زەکات هات فەرمووی: «ئەی ئەبو ڕافیع وشترەکە بدەوە بەو پیاوە»، منیش تەنها وشتری حەوت ساڵ و زیاترم دەست کەوت (کە لە هیی خۆی چاکتر بوو)، منیش هەواڵم بە پێغەمبەر ﷺ دا، ئەویش فەرمووی: «پێی بدە، چونکە باشترین کەس ئەو کەسەیە کە بەچاکترین و باشترین شێوە قەرز بداتەوە».

## بَابُ الشَّرِكَةِ وَالْمُضَارَبَةِ

### باسی هاوبەشی لە ئیش و کاردا

٤٢٥. عَنِ السَّائِبِ ﵁: قَالَ لِلنَّبِيِّ ﷺ: كُنْتَ شَرِيكِي فِي الْجَاهِلِيَّةِ فَكُنْتَ خَيْرَ شَرِيكٍ، لَا تُدَارِينِي، وَلَا تُمَارِينِي.

سائیب ﵁ دەگێڕێتەوە: بە پێغەمبەری ﷺ گوت: تۆ لە سەردەمی پێش ئیسلامدا هاوبەشم بووی، وە تۆ باشترین هاوبەش بووی، هیچ کات کێشە و دەمەقاڵێت لەگەڵ نەدەکردم.

تێبینی:

(المضاربة): واتە: کەسێک پارەی هەیە و کەسێکیش دەستی کاری هەیە، بەڵام

پارەی نییە، ئەو دوو کەسە دەبنە هاوبەش لە کاردا و لەسەر چۆنیەتی دابەشکردنی قازانجەکە ڕێک دەکەون.

## بَابُ مَا لِلرَّجُلِ مِنْ مَالِ وَلَدِه

### باسی ئەو شتەی کە لە ماڵ و موڵکی منداڵ دەبێتە هیی باوکی

٤٢٦. عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّه ﷺ: «إِنَّ أَطْيَبَ مَا أَكَلْتُمْ مِنْ كَسْبِكُمْ، وَإِنَّ أَوْلَادَكُمْ مِنْ كَسْبِكُمْ».

عائیشە رَضِيَ اللهُ عَنْهَا دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «باشترین و پاکترین شتێک کە لێی بخۆن ئەو شتەیە کە بۆ خۆتان (بەڕەنجی شانتان) پەیدای دەکەن، وە بێگومان منداڵەکانتان بەشێکن لە هەوڵ و کۆششی خۆتان».

٤٢٧. عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّه رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا: أَنَّ رَجُلاً قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّه إِنَّ لِي مَالاً وَوَلَدًا، وَإِنَّ أَبِي يُرِيدُ أَنْ يَجْتَاحَ مَالِي، فَقَالَ: «أَنْتَ وَمَالُكَ لِأَبِيكَ».

جابیری کوڕی عەبدوڵڵا رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا دەگێڕێتەوە: پیاوێک گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕاستیدا من هەم ماڵ و هەم منداڵم هەیە، باوکیشم دەیەوێت ئەوەی هەمە بیبات بۆ خۆی (پێداویستییەکانی پێ جێبەجێ بکات)، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: «تۆش و سامانەکەشت هیی باوکتن».

## بَابُ مَنْ مَرَّ عَلَى مَاشِيَةِ قَوْمٍ أَوْ حَائِطٍ هَلْ يُصِيبُ مِنْه؟

### باسی ئایا کەسێک کە بەلای ماڵات و باغاتی خەڵکدا تێدەپەڕێت بەشی تێدا هەیە؟

٤٢٨. عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه ﷺ: «إِذَا مَرَّ أَحَدُكُمْ بِحَائِطٍ فَلْيَأْكُلْ، وَلَا يَتَّخِذْ خُبْنَةً».

ئیبن عومەر ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «ئەگەر یەکێکتان بەلای باخێکدا تێپەڕین، لێی بخۆن، بەڵام لە گیرفانتان مەکەن، (واتە: بەشی خواردنی خۆت بخۆ نەک بۆماڵیش بێنیەوە)».

# كِتَابُ الْأَحْكَامِ

## پەرتووكى ئەحكام

### بَابُ ذِكْرِ الْقُضَاةِ

باسى باسكردنى دادوەرەكان

٤٢٩. عَنْ أَبِي هرَيْرَةَ ﷺ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «مَنْ جُعِلَ قَاضِيًا بَيْنَ النَّاسِ، فَقَدْ ذُبِحَ بِغَيْرِ سِكِّينٍ».

ئەبو هورەيرە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: «هەر كەسێک كرا بە دادوەر لە نێوان خەڵكيدا، بەبێ چەقۆ سەر بڕاوە».

### بَابُ التَّغْلِيظِ فِي الْحَيْفِ وَالرَّشْوَةِ

باسى هەڕەشەی توند دەربارەی ستەم و خواردنی ڕیشوە

٤٣٠. عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَعْنَةُ اللَّهِ عَلَى الرَّاشِي وَالْمُرْتَشِي».

عەبدوڵڵای كوڕی عەمرِ ﷻ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «نەفرەتی خوا لەو كەسەی كە ڕەشوە دەدات و لەو كەسەش كە وەریدەگرێت».

## بَابُ الْحَاكِمِ يَجْتَهِدُ فَيُصِيبُ الْحَقَّ

### باسی دادوەرێك كە خۆی ماندوو دەكات و هەق دەپێكێت

٤٣١. عَنْ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ ﷺ: أَنَّه سَمِعَ رَسُولَ اللَّه ﷺ يَقُولُ: «إِذَا حَكَمَ الْحَاكِمُ فَاجْتَهَدَ فَأَصَابَ فَلَه أَجْرَانِ، وَإِذَا حَكَمَ فَاجْتَهَدَ فَأَخْطَأَ فَلَه أَجْرٌ».

عەمری كوڕی عاص ﷺ دەگێڕێتەوە: گوێی لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو، دەیفەرموو: «هەركات دادوەر ئیجتیهادی كرد و بڕیاری دا و پێكای، ئەوە دوو پاداشتی بۆ هەیە (پاداشتی ئیجتیهاد و پێكانەكە)، ئەگەر ئیجتیهادی كرد و بڕیاری دا و نەیپێكا پاداشتێكی بۆ هەیە (پاداشتی ئیجتیهاد و خۆماندووكردنەكە)».

## بَابُ لَا يَحْكُمُ الْحَاكِمُ وَهوَ غَضْبَانُ

### باسی نابێت دادوەر لە كاتی توڕەییدا بڕیار بدات

٤٣٢. عَنْ عَبْدَ الرَّحْمَنِ بْنَ أَبِي بَكْرَةَ، عَنْ أَبِيه ﷺ: أَنَّ رَسُولَ اللَّه ﷺ قَالَ: «لَا يَقْضِي الْقَاضِي بَيْنَ اثْنَيْنِ وَهوَ غَضْبَانُ».

عەبدوڕڕەحمانی كوڕی ئەبو بەكرە لە باوكیەوە ﷻ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «نابێت دادوەر لە كاتی توڕەییدا دادوەری لە نێوان دوو كەسدا بكات».

## بَابُ قَضِيَّةِ الْحَاكِمِ لَا تُحِلُّ حَرَامًا وَلَا تُحَرِّمُ حَلَالًا

## باسی بە بڕیاری دادوەر حەڵاڵ حەرام نابێت و حەرام حەڵاڵ نابێت

٤٣٣. عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ رضي الله عنها قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّكُمْ تَخْتَصِمُونَ إِلَيَّ وَإِنَّمَا أَنَا بَشَرٌ، وَلَعَلَّ بَعْضَكُمْ أَنْ يَكُونَ أَلْحَنَ بِحُجَّتِهِ مِنْ بَعْضٍ، وَإِنَّمَا أَقْضِي لَكُمْ عَلَى نَحْوٍ مِمَّا أَسْمَعُ مِنْكُمْ، فَمَنْ قَضَيْتُ لَهُ مِنْ حَقِّ أَخِيهِ شَيْئًا، فَلَا يَأْخُذْهُ فَإِنَّمَا أَقْطَعُ لَهُ قِطْعَةً مِنَ النَّارِ، يَأْتِي بِهَا يَوْمَ الْقِيَامَةِ».

ئوم سەلەمە رضي الله عنها دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «ئێوە کێشەکانتان دێنن بۆ لای من و منیش وەکوو ئێوە مرۆڤم، لەوانەیە هەندێکتان زمانپاراوتر بن لە بەڵگەهێنانەوە لە ئەوانی دیکە، منیش لەسەر ئەو شتەی کە دەیبیستم بڕیارتان بۆ دەدەم، جا هەرکات هەقی برایەکم دا بە ئەوی دیکە، ئەوە با وەرینەگرێت، چونکە بێگومان ئەوە پارچەیەک ئاگری دۆزەخم بۆ دابڕیوە، لە ڕۆژی قیامەت دێتەوە ڕێگای (واتە: بە بڕیارەکەی من بۆی حەڵاڵ نابێت ئەگەر لە ئەسڵدا حەرام بێت و بە زمانپاراوی خۆی سەلماندنی بۆ کردبێت)».

## بَابُ مَنِ ادَّعَى مَا لَيْسَ لَهُ وَخَاصَمَ فِيهِ

## باسی کەسێك بانگەشەی ئەوە بکات شتێك هیی ئەوە و هیی ئەویش نەبێت و کێشە بنێتەوە

٤٣٤. عَنِ ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ أَعَانَ عَلَى خُصُومَةٍ بِظُلْمٍ، أَوْ يُعِينُ عَلَى ظُلْمٍ، لَمْ يَزَلْ فِي سَخَطِ اللَّهِ حَتَّى يَنْزِعَ».

ئیبن عومەر رضي الله عنهما دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «هەر کەسێک بە ستەمکردن یارمەتی کێشەیەک بدات و دەستی تێوەربدات، بەردەوام لەبەر خەشم و

تورەیی خوادایە تاکوو واز دێنێت».

## بَابُ الْبَيِّنَةِ عَلَى الْمُدَّعِي، وَالْيَمِينِ عَلَى الْمُدَّعَى عَلَيْه

### باسی شایەدهێنان لەسەر داواکارە و سوێندخواردن لەسەر داوالێکراوە

٤٣٥. عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ: أَنَّ رَسُولَ اللَّه ﷺ قَالَ: «لَوْ يُعْطَى النَّاسُ بِدَعْوَاهمْ، ادَّعَى نَاسٌ دِمَاءَ رِجَالٍ وَأَمْوَالَهمْ، وَلَكِنِ الْيَمِينُ عَلَى الْمُدَّعَى عَلَيْه».

ئیبن عەبباس ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «ئەگەر خەڵکی تەنها بە داواکردن شتە داواکراوەکەیان پێ بدرابایە، خەڵکانێک داوای خوێن و ماڵی خەڵکیان دەکرد، بەڵام (لە کێشەیەکی ئاوادا) سوێندخواردن لەسەر ئەو کەسەیە کە داوای لەسەر تۆمار کراوە».

## بَابُ مَنْ حَلَفَ عَلَى يَمِينٍ فَاجِرَةٍ لِيَقْتَطِعَ بِها مَالاً

### باسی کەسێك کە بەدرۆ سوێند دەخوات بۆ ئەوەی ماڵی کەسێک بخوات

٤٣٦. عَنْ عَبْدِ اللَّه بْنِ مَسْعُودٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه ﷺ: «مَنْ حَلَفَ عَلَى يَمِينٍ، وَهوَ فِيها فَاجِرٌ، يَقْتَطِعُ بِها مَالَ امْرِئٍ مُسْلِمٍ، لَقِيَ اللَّه وَهوَ عَلَيْه غَضْبَانُ».

عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «هەر کەسێک سوێند بخوات و لە سوێندەکەیدا درۆ بکات بۆ ئەوەی ماڵی کەسێکی موسوڵمان داببڕێت، لە کاتێکدا کە دەچێتەوە بەر بارەگای خوا، خوا لێی تورەیە».

## بَابٌ: بِمَا يُسْتَحْلَفُ أَهْلُ الْكِتَابِ؟

### باسێك: به چ جۆرێك خاوەن كتێبەكان سوێند دەدرێن؟

٤٣٧. عَنِ الْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ ﵁: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ دَعَا رَجُلاً مِنْ عُلَمَاءِ الْيَهُودِ، فَقَالَ: «أَنْشُدُكَ بِالَّذِي أَنْزَلَ التَّوْرَاةَ عَلَى مُوسَى».

بەڕائی كوڕی عازیب ﵁ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ پیاوێكی لە زانایەكانی جوولەكە بانگ كرد و پێی فەرموو: «سوێندت دەدەم بەو زاتەی كە تەوڕاتی دابەزاند بۆ سەر مووسا».

## بَابُ الرَّجُلِ يَضَعُ خَشَبَةً عَلَى جِدَارِ جَارِهِ

### باسی دار خستنە سەر دیواری دراوسێ لە كاتی دارەڕێی خانوودا

٤٣٨. عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ الْأَعْرَجِ ﵁ قَالَ: سَمِعْتُ أَبَا هرَيْرَةَ ﵁ يَبْلُغُ بِهِ النَّبِيَّ ﷺ، قَالَ: «إِذَا اسْتَأْذَنَ أَحَدَكُمْ جَارُهُ أَنْ يَغْرِزَ خَشَبَةً فِي جِدَارِهِ، فَلَا يَمْنَعْهُ»، فَلَمَّا حَدَّثَهُمْ أَبُو هرَيْرَةَ طَأْطَئُوا رُءُوسَهمْ، فَلَمَّا رَآهمْ، قَالَ: «مَا لِي أَرَاكُمْ عَنْها مُعْرِضِينَ، وَاللَّهِ لَأَرْمِيَنَّ بِها بَيْنَ أَكْتَافِكُمْ».

عەبدوڕڕەحمانی كوڕی ئەعرەج ﵁ دەڵێت: گوێم لە ئەبو هوڕەیرە ﵁ بوو كە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ دەیگێڕایەوە، فەرموویەتی: «هەر كاتێک یەكێكتان مۆڵەتی خواست لە دراوسێكەی كە داری دارەڕێی خانووەكەی بخاتە سەر دیواری ئەو، با مۆڵەتی بدات و ڕێگری نەكات». جا كاتێک ئەبو هوڕەیرە ﵁ ئەو فەرموودەیەی بۆ گێڕانەوە سەریان دانەواند، ئەویش كە ئاوای بینین گوتی: چییە بۆ ئاوا پشت لە فەرموودەكە و بڕیارەكە دەكەن؟! سوێند بە خوا هەڵیدەدەمە سەر شانتان (واتە: لەسەرتان واجب دەكەم كە دەبێت ئیشی پێ بكەن).

## بَابُ الْحَجْرِ عَلَى مَنْ يُفْسِدُ مَالَه

### باسی ڕێگریکردنی کەسێک کە زیان بە ماڵەکەی خۆی دەگەیەنێت

٤٣٩. عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ: أَنَّ رَجُلاً كَانَ فِي عَهدِ رَسُولِ اللَّه ﷺ فِي عُقْدَتِه ضَعْفٌ، وَكَانَ يُبَايِعُ، وَأَنَّ أَهلَه أَتَوُا النَّبِيَّ ﷺ، فَقَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّه احْجُرْ عَلَيْه، فَدَعَاه النَّبِيُّ ﷺ، فَنَهاه عَنْ ذَلِكَ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّه إِنِّي لَا أَصْبِرُ عَنِ الْبَيْعِ، فَقَالَ: «إِذَا بَايَعْتَ فَقُلْ: ها، وَلَا خِلَابَةَ».

ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەگێڕێتەوە: پیاوێک لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا ﷺ بیر و زارکۆڵ بوو و مامەڵەشی دەکرد، خزمەکانی هاتن بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ و گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ مامەڵەکردنی لێ قەدەغە بکە، ئینجا پێغەمبەر ﷺ بانگی کرد و مامەڵەکردنی لێ قەدەغە کرد، ئەویش گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ من ئارام ناگرم ئەگەر مامەڵە نەکەم، (پێغەمبەر ﷺ) فەرمووی: «هەرکات کڕین و فرۆشتنت کرد بڵێ: ها (دەست بە دەست)، وە (بڵێ) بەبێ فرت و فێڵ (بۆ ئەوەی ئەگەر فێڵی تێدا بوو دەرفەتی پەشیمانبوونەوەی هەبێت)».

## بَابُ مَنْ وَجَدَ مَتَاعَه بِعَيْنِه عِنْدَ رَجُلٍ قَدْ أَفْلَسَ

### باسی کەسێک کەلوپەلی خۆی لەلای پیاوێکی مایەپووچ ببینێتەوە

٤٤٠. عَنْ أَبِي هرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه ﷺ: «مَنْ وَجَدَ مَتَاعَه بِعَيْنِه عِنْدَ رَجُلٍ قَدْ أَفْلَسَ، فَهوَ أَحَقُّ بِه مِنْ غَيْرِه».

ئەبو هوڕەیرە ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «هەر کەسێک کەلوپەلی لەلای کەسێکی مایەپووچ دەست کەوتەوە (کە پێی فرۆشتبوو، بەڵام پارەکەی وەرنەگرتبوو)، ئەو کەسە لە هەموو خاوەن قەرزەکانی دیکە لەپێشترە بۆ ئەوەی

کەلوپەلەکەی خۆی هەڵگرێتەوە (لەبری قەرزەکە)».

## بَابُ كَرَاهِيَةِ الشَّهَادَةِ لِمَنْ لَمْ يَسْتَشْهِدْ

### باسی ناپەسندی شایەتیدانی کەسێک پێش ئەوەی داوای شایەتی لێ بکرێت

٤٤١. عَنْ عَبْدُ اللَّه بْنُ مَسْعُودٍ ﵁ قَالَ: سُئِلَ رَسُولُ اللَّه ﷺ، أَيُّ النَّاسِ خَيْرٌ؟ قَالَ: «قَرْنِي، ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهمْ، ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهمْ، ثُمَّ يَجِيءُ قَوْمٌ تَبْدُرُ شَهَادَةُ أَحَدِهِمْ يَمِينَه، وَيَمِينُه شَهَادَتَه».

عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود ﵁ دەڵێت: پرسیار کرا لە پێغەمبەری خوا ﷺ کە باشترینی خەڵکی کێن؟ فەرمووی: «ئەوانەی ڕۆژگاری منن، پاشان ئەوانەی دوای ئەوان دێن، پاشان ئەوانەی دوای ئەوان دێن، پاشان خەڵکانێک دێن کە شایەتیدانیان پێش سوێندخواردن دەکەوێت و سوێندخواردنیان پێش شایەتیدانیان دەکەوێت (واتە: شایەتیدانی بەدرۆ زۆر دەبێت و خەڵکی گوێ بە شایەتی و سوێندخواردن نادەن و بە شتێکی ئاسایی دەزانن)».

## بَابُ الرَّجُلِ عِنْدَه الشَّهادَةُ لَا يَعْلَمُ بِها صَاحِبُها

### باسی پیاوێک کە شایەتییەکی لەلایە و هاوەڵەکەی نایزانێت

٤٤٢. عَنْ زَيْدِ بْنِ خَالِدٍ الْجُهَنِيِّ ﵁ يَقُولُ: إِنَّه سَمِعَ رَسُولَ اللَّه ﷺ، يَقُولُ: «خَيْرُ الشُّهودِ، مَنْ أَدَّى شَهادَتَه قَبْلَ أَنْ يُسْأَلَها».

زەیدی کوڕی خالیدی جوهەنی ﵁ دەڵێت: گوێی لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: «باشترینی شایەتەکان ئەو کەسەیە کە شایەتییەکەی بدات پێش ئەوەی داوای لێ بکرێت».

# بَابُ مَنْ لَا تَجُوزُ شَهادَتُه

## باسی ئەو کەسەی شایەتی دروست نییە

٤٤٣. عَنْ أَبِي هرَيْرَةَ ﵁: أَنَّه سَمِعَ رَسُولَ اللَّه ﷺ يَقُولُ: «لَا تَجُوزُ شَهادَةُ بَدَوِيٍّ عَلَى صَاحِبِ قَرْيَةٍ».

ئەبو هورەیرە ﵁ دەگێڕێتەوە: گوێی لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو، دەیفەرموو: «شایەتیدانی کۆچەری لەسەر خەڵکی دێهات و شارییەکان وەرناگیرێت (چونکە کاتی خۆی کۆچەرییەکان یاسا و ڕێسای شایەتیدانیان نەزانیوە)».

# كِتَابُ الْهِبَاتِ

# پەرتووكی بەخشینەكان

## بَابُ مَنْ أَعْطَى وَلَدَه ثُمَّ رَجَعَ فِيه

### باسی ئەو كەسەی شتێك بە منداڵەكەی دەبەخشێت و پاشان پەشیمان دەبێتەوە

٤٤٤. عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، وَابْنِ عُمَرَ ﵃، يَرْفَعَانِ الْحَدِيثَ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ، قَالَ: «لَا يَحِلُّ لِلرَّجُلِ أَنْ يُعْطِيَ الْعَطِيَّةَ ثُمَّ يَرْجِعَ فِيهَا، إِلَّا الْوَالِدَ فِيمَا يُعْطِي وَلَدَه».

ئیبن عەبباس و ئیبن عومەر ﵃ دەگێڕنەوە و فەرموودەكە بەرز دەكەنەوە بۆ پێغەمبەر ﷺ كە فەرموویەتی: «ڕەوا نییە بۆ هیچ كەسێك كە شتێك ببەخشێت و پاشان لێی پەشیمان ببێتەوە، تەنها باوك نەبێت لەوەدا كە بە منداڵەكەی دەبەخشێت (چونكە خۆیشی هەر موڵكی باوكیەتی)».

## بَابُ الْعُمْرَى

### باسی بەخشین بەدرێژایی تەمەن

٤٤٥. عَنْ أَبِي هرَيْرَةَ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه ﷺ: «لَا عُمْرَى، فَمَنْ أُعْمِرَ شَيْئًا

فَهوَ لَه».

ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «بەخشین بەدرێژایی تەمەن نییە (دروست نییە)، خۆ ئەگەر کەسێک بەدرێژایی تەمەن شتێکی پێ بەخشرا، ئەوە ئەو شتە بۆ خۆیەتی (واتە: دەبێتە موڵکی خۆی و لەدوای مردنیشی بۆ میراتگرەکانیەتی)».

٤٤٦. عَنْ زَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ ﷺ: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ جَعَلَ الْعُمْرَى لِلْوَارِثِ.

زەیدی کوڕی سابیت ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ ئەو شتەی کە بەدرێژایی تەمەن بەخشراوە داویەتی بە میراتگر (واتە: میراتگری کەسی پێبەخشراو).

## بَابُ الرُّقْبَى

## باسی بەخشین بەچاوەڕوانی

٤٤٧. عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه ﷺ: «لَا رُقْبَى، فَمَنْ أُرْقِبَ شَيْئًا فَهوَ لَه، حَيَاتَه وَمَمَاتَه». قَالَ: وَالرُّقْبَى: أَنْ يَقُولَ هوَ لِلْآخَرِ: مِنِّي وَمِنْكَ مَوْتًا.

ئیبن عومەر ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمویەتی: «بەخشین بەچاوەڕوانی نییە (دروست نییە)، جا بۆیە هەر کەسێك شتێکی بەچاوەڕوانی پێ بەخشرا، دەبێتە موڵکی ئەو لە ژیانیدا و لەدوای مردنیشی (واتە: بۆ میراتگرەکانیەتی)». (ڕاوی) دەڵێت: بەخشین بەچاوەڕوانی ئەوەیە کە یەکێک بە یەکێک بڵێت: مردن لە نێوانی من و تۆدایە (واتە: ئەگەر من مردم با بۆ تۆ بێت، وە ئەگەر تۆ مردی با هەر بۆ خۆم بێت).

٤٤٨. عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّه ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه ﷺ: «الْعُمْرَى جَائِزَةٌ لِمَنْ أُعْمِرَها، وَالرُّقْبَى جَائِزَةٌ لِمَنْ أُرْقِبَها».

جابیری کوڕی عەبدوڵلا ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «بەخشین بەدرێژایی تەمەن دەبێتە دیاری بۆ ئەو کەسەی کە پێی بەخشراوە، هەروەها بەخشین بەچاوەڕوانی دەبێتە دیاری بۆ ئەو کەسەی کە پێی بەخشراوە».

## بَابُ الرُّجُوعِ فِي الْهِبَةِ

### باسی پەشیمانبوونەوە لە دیاری بەخشین

٤٤٩. عَنْ أَبِي هرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه ﷺ: «إِنَّ مَثَلَ الَّذِي يَعُودُ فِي عَطِيَّتِه، كَمَثَلِ الْكَلْبِ أَكَلَ، حَتَّى إِذَا شَبِعَ قَاءَ، ثُمَّ عَادَ فِي قَيْئِه، فَأَكَلَه».

ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «بەڕاستی نموونەی ئەو کەسەی کە لە بەخشینەکەی پەشیمان دەبێتەوە، وەکوو نموونەی ئەو سەگە وایە کە دەخوات تاکوو تێر دەبێت و دەڕشێتەوە، پاشان دەگەڕێتەوە سەر ڕشانەوەکەی و دەیخواتەوە».

# كِتَابُ الصَّدَقَاتِ

## پەرتووكی خێركردن

### بَابُ الرُّجُوعِ فِي الصَّدَقَةِ

#### باسی پەشیمانبوونەوە لە خێركردن

٤٥٠. عَنْ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ ﷺ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «لَا تَعُدْ فِي صَدَقَتِكَ».

عومەری كوڕی خەتتاب ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «لە بەخشینەكەتدا پاشگەز مەبەوە».

٤٥١. عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ الْعَبَّاسِ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَثَلُ الَّذِي يَتَصَدَّقُ، ثُمَّ يَرْجِعُ فِي صَدَقَتِهِ، مَثَلُ الْكَلْبِ يَقِيءُ، ثُمَّ يَرْجِعُ فَيَأْكُلُ قَيْئَهُ».

عەبدوڵڵای كوڕی عەبباس ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «نموونەی ئەو كەسەی كە دەبەخشێت و دواتر پاشگەز دەبێتەوە لە بەخشینەكەی، وەكوو ئەو سەگە وایە كە دەڕشێتەوە، دواتر دەگەڕێتەوە و ڕشانەوەكەی خۆی دەخوات».

## بَابُ مَنْ تَصَدَّقَ بِصَدَقَةٍ ثُمَّ وَرِثَهَا

### باسی ئەو کەسەی کە شتێک دەکاتە خێر و دواتر دەبێتە میرات بۆی

٤٥٢. عَنْ عَبْدِ اللَّه بْنِ بُرَيْدَةَ، عَنْ أَبِيهِ ﵁ قَالَ: جَاءَتِ امْرَأَةٌ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ، فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّه إِنِّي تَصَدَّقْتُ عَلَى أُمِّي بِجَارِيَةٍ، وَإِنَّهَا مَاتَتْ، فَقَالَ: «آجَرَكِ اللَّه، وَرَدَّ عَلَيْكِ الْمِيرَاثَ».

عەبدوڵڵای کوڕی بوڕەیدە لە باوکیەوە ﵁ دەگێڕێتەوە، گوتوویەتی: ئافرەتێک هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ و گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ من جارییەیەکم بەخشی بە دایکم، وە ئێستا دایکم وەفاتی کردووە، ئەویش فەرمووی: «خوا پاداشتی بەخشینەکەت دەداتەوە، بەخشینەکەشتی بە میرات گێڕایەوە بۆت».

## بَابُ الْعَارِيَةِ

### باسی خواستن

٤٥٣. عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ، قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّه ﷺ، يَقُولُ: «الْعَارِيَةُ مُؤَدَّاةٌ، وَالْمِنْحَةُ مَرْدُودَةٌ».

ئەنەسی کوڕی مالیک ﵁ دەڵێت: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو کە دەیفەرموو: «شتی خوازراو دەبێت بگێڕدرێتەوە بۆ خاوەنەکەی، وە شتێکیش کە بۆ سوودبینین بەروبوومەکەی دراوە بە کەسێک دەبێت خودی شتەکە (نەک بەروبوومەکەی) بدرێتەوە بە خاوەنەکەی».

تێبینی:

(عارية): ئەو شتەیە کە خۆت وەریدەگریت و سوود لە خودی شتەکە دەبینیت، وەکوو: کتێب.

(منحة): ئەو شتەیە کە پێت دەدرێت بۆ سوودبینین لە بەروبوومەکەی، کە کاتی خۆی زیاتر بۆ وشتر بەکار هاتووە بۆ ئەوەی کەسەکە سوود لە بەروبوومی وشترەکە وەربگرێت، بە نموونە: شیرەکەی.

## بَابُ الْحَوَالَةِ

باسی حەواڵە (ناردن)

٤٥٤. عَنْ أَبِي هرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه ﷺ: «الظُّلْمُ مَطْلُ الْغَنِيِّ، وَإِذَا أُتْبِعَ أَحَدُكُمْ عَلَى مَلِيءٍ، فَلْيَتْبَعْ».

ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «کەسێک قەرزی کەسێکی بەلاوە بێت، دەسەڵاتیشی هەبێت بیداتەوە بەڵام نەیداتەوە، ئەوە ستەمە، وە هەرکات یەکێك لە ئێوە ڕەوانەی لای کەسێکی دەوڵەمەند کرا، با بچێت (بۆ وەرگرتنەوەی قەرزەکە)».

## بَابُ مَنِ ادَّانَ دَيْنًا وَهوَ يَنْوِي قَضَاءَه

باسی ئەو کەسەی قەرز وەردەگرێت و نیازی دانەوەی هەیە

٤٥٥. عَنْ عَبْدِ اللَّه بْنِ جَعْفَرٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه ﷺ: «إِنَّ اللَّه مَعَ الدَّائِنِ حَتَّى يَقْضِيَ دَيْنَه، مَا لَمْ يَكُنْ فِيمَا يَكْرَه اللَّه».

عەبدوڵڵای کوڕی جەعفەر ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «بێگومان خوا لەگەڵ قەرزدارە تاوەکوو قەرزەکەی دەداتەوە، مادام قەرزەکەی لە شتێکدا نییە کە خوا پێیناخۆشە».

## بَابُ مَنِ ادَّانَ دَيْنًا لَمْ يَنْوِ قَضَاءَه

### باسی کەسێک کە قەرز وەردەگرێت و نییەتی دانەوەی نییە

٤٥٦. عَنْ صُهيْبُ الْخَيْرِ ﵁ عَنْ رَسُولِ اللَّه ﷺ قَالَ: «أَيُّمَا رَجُلٍ تَدَيَّنَ دَيْنًا، وَهوَ مُجْمِعٌ أَنْ لَا يُوَفِّيَه إِيَّاه، لَقِيَ اللَّه سَارِقًا».

صوهەیبی خەیری ﵁ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «هەر پیاوێک قەرز وەربگرێت و سوور بێت لەسەر ئەوەی کە قەرزەکەی نەداتەوە، وەکوو دز بە خوا دەگاتەوە».

٤٥٧. عَنْ أَبِي هرَيْرَةَ ﵁: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «مَنْ أَخَذَ أَمْوَالَ النَّاسِ يُرِيدُ إِتْلَافَها، أَتْلَفَه اللَّه».

ئەبو هورەیرە ﵁ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: «هەر کەسێک سەروەت و ماڵی خەڵکی وەربگرێ (بەقەرز)، بیەوێ بەهەدەری بدات، خوا بێ دەستمایەی دەکات».

## بَابُ التَّشْدِيدِ فِي الدَّيْنِ

### باسی هەڕەشەی توند لە قەرزکردندا

٤٥٨. عَنْ ثَوْبَانَ ﵁ مَوْلَى رَسُولِ اللَّه ﷺ، عَنْ رَسُولِ اللَّه ﷺ أَنَّه قَالَ: «مَنْ فَارَقَ الرُّوحُ الْجَسَدَ وَهوَ بَرِيءٌ مِنْ ثَلَاثٍ، دَخَلَ الْجَنَّةَ: مِنَ الْكَنْزِ، وَالْغُلُولِ، وَالدَّيْنِ».

سەوبانی ﵁ خزمەتکاری پێغەمبەری خوا ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «هەر کەسێک گیان لە لاشەی دەربچێت و لە سێ شت بەدوور بێت، دەچێتە بەهەشتەوە: لە خۆبەگەورەزانین و لە خیانەتکردن لە دەستکەوتەکانی جەنگ و لە قەرز».

تێبینی:

له هەندێک گێڕانەوەدا (الكنز) بە (الكبر) هاتووە، ئەو کات ماناکەی بەو جۆرەیە: کەسێک ماڵی کۆ کردبێتەوە و زەکاتی لێ نەدابێت.

٤٥٩. عَنْ أَبِي هرَيْرَةَ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه ﷺ: «نَفْسُ الْمُؤْمِنِ مُعَلَّقَةٌ بِدَيْنِه حَتَّى يُقْضَى عَنْه».

ئەبو هوڕەیرە ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «نەفسی بڕوادار بەهۆی قەرزدارییەکەیەوە ڕێگریی لێ دەکرێت لە چوونە بەهەشتەوە، تاوەکوو قەرزەکەی بۆ دەدرێتەوە».

٤٦٠. عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﵄ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه ﷺ: «مَنْ مَاتَ وَعَلَيْه دِينَارٌ أَوْ دِرْهَمٌ قُضِيَ مِنْ حَسَنَاتِه، لَيْسَ ثَمَّ دِينَارٌ وَلَا دِرْهَمٌ».



ئیبن عومەر ﵄ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «هەر کەسێک کۆچی دوایی کرد و دینارێک یان درهەمێک قەرزدار بوو، لە (کردەوە) چاکەکانی قەرزەکەی بۆ دەدرێتەوە، چونکە لە قیامەت دینار و درهەم بوونی نییە».

## بَابُ إِنْظَارِ الْمُعْسِرِ

## باسی مۆڵەتدانی کەسی دەستکورت

٤٦١. عَنْ أَبِي هرَيْرَةَ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه ﷺ: «مَنْ يَسَّرَ عَلَى مُعْسِرٍ، يَسَّرَ اللَّه عَلَيْه فِي الدُّنْيَا وَالْآخِرَةِ».

ئەبو هوڕەیرە ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «هەر کەسێک کارئاسانی بکات بۆ دەستکورتێک، خوا لە دونیا و دواڕۆژدا کارئاسانی بۆ دەکات».

٤٦٢. عَنْ أَبِي الْيَسَرِ ﵁ صَاحِبِ النَّبِيِّ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه ﷺ: «مَنْ أَحَبَّ

أَنْ يُظِلَّه اللَّه فِي ظِلِّه، فَلْيُنْظِرْ مُعْسِرًا، أَوْ لِيَضَعْ عَنْه».

ئەبو یەسەری ﷺ هاوەڵی پێغەمبەر ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «هەر کەسێک پێیخۆشە خوا بیخاتە ژێر سێبەری خۆیەوە، با مۆڵەتی دەستکورتی قەرزدار بدات، یان لێی خۆش بێت».

## بَابُ حُسْنِ الْمُطَالَبَةِ وَأَخْذِ الْحَقِّ فِي عَفَافٍ

### باسی جوان داواکردن و وەرگرتنەوەی ماف بەپاکی

٤٦٣. عَنِ ابْنِ عُمَرَ وَعَائِشَةَ ﷺ: أَنَّ رَسُولَ اللَّه ﷺ، قَالَ: «مَنْ طَلَبَ حَقًّا فَلْيَطْلُبْه فِي عَفَافٍ وَافٍ، أَوْ غَيْرِ وَافٍ».

ئیبن عومەر و عائیشە ﷺ دەگێڕنەوە: کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «هەر کەسێک داوای مافی خۆی بکاتەوە ئەوە با بە شێوازێکی جوان و دوور لە تاوان داوای بکاتەوە، جا مافەکەی بەتەواوی بەدەست بێنێتەوە یان بەناتەواوی».

## بَابُ حُسْنِ الْقَضَاءِ

### باسی قەرزدانەوە بە شێوازێکی جوان و باش

٤٦٤. عَنْ أَبِي هرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه ﷺ: «إِنَّ خَيْرَكُمْ -أَوْ مِنْ خَيْرِكُمْ- أَحَاسِنُكُمْ قَضَاءً».

ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «بەڕاستی باشترینتان -یان لە باشترینی ئێوە- ئەو کەسانەن کە بەباشترین و جوانترین شێواز قەرزەکانیان دەدەنەوە».

# كِتَابُ الرُّهونِ

# پەرتووكی بارمتەكان

## بَابُ الرَّهنُ مَرْكُوبٌ وَمَحْلُوبٌ

## باسی بارمتەی وڵاخی سواری و ماڵاتی دۆشراو

٤٦٥. عَنْ أَبِي هرَيْرَةَ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه ﷺ: «الظَّهرُ يُرْكَبُ إِذَا كَانَ مَرْهونًا، وَلَبَنُ الدَّرِّ يُشْرَبُ إِذَا كَانَ مَرْهونًا، وَعَلَى الَّذِي يَرْكَبُ وَيَشْرَبُ نَفَقَتُه».

ئەبو هورەیرە ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «ئەگەر وڵاخی سواری بارمتە كرابوو، سوارییەكەی دروستە (بۆ ئەو كەسەی بە بارمتە وەریگرتووە)، ماڵاتی شیردەر ئەگەر لە بارمتەدا دانرا دروستە شیرەكەی بخورێتەوە، بەڵام بەخێوكردنی وڵاخەكە و ماڵاتەكە لەسەر ئەو كەسەیە كە سواری وڵاخەكە دەبێت و شیری ماڵاتەكە دەخواتەوە (لەبری سواربوونی و خواردنی شیرەكە)».

## بَابُ أَجْرِ الْأُجَرَاءِ

### باسی کرێی کرێکار

٤٦٦. عَنْ عَبْدِ اللَّه بْنِ عُمَرَ ﵄ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه ﷺ: «أَعْطُوا الْأَجِيرَ أَجْرَه، قَبْلَ أَنْ يَجِفَّ عَرَقُه».

عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﵄ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «کرێی کرێکار بدەن پێش ئەوەی ئارەقەکەی وشک ببێتەوە».

## بَابُ الرُّخْصَةِ فِي كِرَاءِ الْأَرْضِ الْبَيْضَاءِ بِالذَّهبِ وَالْفِضَّةِ

### باسی ڕێپێدان بۆ بەکرێدانی زەوی سپی بە زێڕ و زیو

٤٦٧. عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄: أَنَّه لَمَّا سَمِعَ إِكْثَارَ النَّاسِ فِي كِرَاءِ الْأَرْضِ، قَالَ: سُبْحَانَ اللَّه إِنَّمَا قَالَ رَسُولُ اللَّه ﷺ: «أَلَا مَنَحَها أَحَدُكُمْ أَخَاه». وَلَمْ يَنْه عَنْ كِرَائِها.

ئیبن عەبباس ﵄ دەگێڕێتەوە: کاتێک بیستی بەکرێدانی زەوی لەنێو خەڵکیدا زیادی کردووە گوتی: پاک و بێگەردی بۆ خوا لە ڕاستیدا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «نەدەکرا هەر یەکێکتان زەوییە (زیادە)کەی بدابایە بە براکەی»، وە نەهی نەکردووە لە بەکرێدانیشی.

## بَابُ مَنْ زَرَعَ فِي أَرْضِ قَوْمٍ بِغَيْرِ إِذْنِهِمْ

### باسی ئەو کەسەی زەوی خەڵکانێکی چاندووە و مۆڵەتی لێ وەرنەگرتوون

٤٦٨. عَنْ رَافِعِ بْنِ خَدِيجٍ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه ﷺ: «مَنْ زَرَعَ فِي أَرْضِ قَوْمٍ

بِغَيْرِ إِذْنِهِمْ، فَلَيْسَ لَه مِنَ الزَّرْعِ شَيْءٌ، وَتُرَدُّ عَلَيْه نَفَقَتُه».

ڕافیعی کوڕی خەدیج ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «هەر کەسێک لە زەوی خەڵکێکدا کشتوکاڵ بکات بەبێ مۆڵەتی خاوەنەکەی، هیچ بەشی بە کشتوکاڵەکەوە نییە و ئەوەی لێی خەرج کردووە (لە داچاندن و پێگەیاندن) بۆی دەگەڕێنرێتەوە (بەروبوومەکەش هیی خاوەنی ئەصلی زەوییەکەیە)».

## بَابُ مُعَامَلَةِ النَّخِيلِ وَالْكَرْمِ

### باسی مامەڵەکردن بە باخی خورما و ترێوە

٤٦٩. عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﵄: أَنَّ رَسُولَ اللَّه ﷺ عَامَلَ أَهلَ خَيْبَرَ بِالشَّطْرِ مِمَّا يَخْرُجُ مِنْ ثَمَرٍ، أَوْ زَرْعٍ.

ئیبن عومەر ﵄ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ خەڵکی خەیبەر مامەڵەی کرد لەسەر نیوەیی میوە و شینایی زەوییەکان.

## بَابُ تَلْقِيحِ النَّخْلِ

### باسی پیتاندنی خورما (نێرە و مێیە پێکردن)

٤٧٠. عَنْ طَلْحَةَ بْنِ عُبَيْدِ اللَّه، يُحَدِّثُ عَنْ أَبِيه ﵁ قَالَ: مَرَرْتُ مَعَ رَسُولِ اللَّه ﷺ فِي نَخْلٍ، فَرَأَى قَوْمًا يُلَقِّحُونَ النَّخلَ، فَقَالَ: «مَا يَصْنَعُ هؤُلَاءِ؟»، قَالُوا: يَأْخُذُونَ مِنَ الذَّكَرِ فَيَجْعَلُونَه فِي الْأُنْثَى، قَالَ: «مَا أَظُنُّ ذَلِكَ يُغْنِي شَيْئًا»، فَبَلَغَهمْ، فَتَرَكُوه، فَنَزَلُوا عَنْها، فَبَلَغَ النَّبِيَّ ﷺ، فَقَالَ: «إِنَّمَا هوَ الظَّنُّ، إِنْ كَانَ يُغْنِي شَيْئًا فَاصْنَعُوه، فَإِنَّمَا أَنَا بَشَرٌ مِثْلُكُمْ، وَإِنَّ الظَّنَّ يُخْطِئُ وَيُصِيبُ، وَلَكِنْ مَا قُلْتُ لَكُمْ: قَالَ اللَّه، فَلَنْ أَكْذِبَ عَلَى اللَّه».

تەلحەی کوڕی عوبەیدوڵڵا لە باوکیەوە ﵁ دەگێڕێتەوە، گوتوویەتی: لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ بەلای باخە خورمایەکدا تێپەڕین، بینیی خەڵکێک سەرقاڵی پیتاندنی خورماکانن، فەرمووی: «ئەوانە چی دەکەن؟»، گوتیان: (تۆوی) نێرەی دارخورماکە هەڵدەگرن و دەیخەنە سەر مێیەکە، فەرمووی: «پێم وا نییە ئەوە هیچ سوودی هەبێت»، ئینجا خەڵکەکە ئەوەیان پێ گەیشت و وازیان هێنا و لە دارەکان هاتنە خوارەوە، ئەو وازلێهێنانەیان بە پێغەمبەر ﷺ گەیشتەوە، ئەویش فەرمووی: «ئەوەی من گوتم گومان بوو، ئەگەر کارەکەتان سوودی هەیە ئەنجامی بدەن، لەڕاستیدا منیش وەکوو ئێوە مرۆڤێکم گومانیش جار هەیە هەڵەیە دەردەچێت، هەندێك جاریش ڕاست دەردەچێت، بەڵام هەرکات پێم گوتن: خوا فەرموویەتی، هەرگیز بە ناوی خواوە بەناڕاست قسە ناکەم».

٤٧١. عَنْ عَائِشَةَ ﵂: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ سَمِعَ أَصْوَاتًا، فَقَالَ: «مَا هٰذَا الصَّوْتُ؟»، قَالُوا: النَّخْلُ يَأْبِرُونَه، فَقَالَ: «لَوْ لَمْ يَفْعَلُوا لَصَلَحَ»، فَلَمْ يُؤَبِّرُوا عَامَئِذٍ، فَصَارَ شِيصًا، فَذَكَرُوا ذٰلِكَ لِلنَّبِيِّ ﷺ، فَقَالَ: «إِنْ كَانَ شَيْئًا مِنْ أَمْرِ دُنْيَاكُمْ، فَشَأْنُكُمْ بِهِ، وَإِنْ كَانَ شَيْئًا مِنْ أَمْرِ دِينِكُمْ، فَإِلَيَّ».

عائیشە ﵂ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ گوێی لە دەنگێک بوو، ئینجا فەرمووی: «ئەو دەنگە چییە؟»، گوتیان: ئەوە خورما نێرە و مێیە پێ دەکەن، فەرمووی: «ئەگەر ئەوەش نەکەن (خورماکە) دەبێت»، ئیدی ئەو ساڵە موتوربەیان نەکرد، لە ئەنجامدا خورماکان کرچوکاڵ دەرچوون، ئەوەشیان بۆ پێغەمبەر ﷺ باس کرد، فەرمووی: «ئەگەر شتێک لە کاروباری دنیایی خۆتان بوو، ئیشی خۆتانە (خۆتان لێی شارەزان)، خۆ ئەگەر لە کاروباری دینیش بوو، ئەوە ئیشی منە».

## بَابُ الْمُسْلِمُونَ شُرَكَاءُ فِي ثَلَاثٍ

### باسی موسوڵمانان له سێ شتدا هاوبەشن

٤٧٢. عَنْ أَبِي هرَيْرَةَ ﵁: أَنَّ رَسُولَ اللَّه ﷺ قَالَ: «ثَلَاثٌ لَا يُمْنَعْنَ: الْمَاءُ، وَالْكَلَأُ، وَالنَّارُ».

ئەبو هورەیرە ﵁ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «سێ شت هەیە کەسیان لێ قەدەغە ناکرێت: ئاو و لەوەڕگا و ئاگر».

# كِتَابُ الشُّفْعَةِ

## پەرتووکی شوفعە

## (مافی هەڵگرتنەوە و کڕینەوە)

### بَابُ مَنْ بَاعَ رُبَاعًا فَلْيُؤْذِنْ شَرِيكَه

### باسی فرۆشتنی خانوو یان زەوی و پرسکردن بە هاوبەش

٤٧٣. عَنْ جَابِرٍ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه ﷺ: «مَنْ كَانَتْ لَه نَخْلٌ أَوْ أَرْضٌ فَلَا يَبِعْهَا، حَتَّى يَعْرِضَهَا عَلَى شَرِيكِه».

جابیر رضي الله عنه دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «هەر کەسێک باخە خورما، یان زەوییەکی هەبوو، با نەیفرۆشێت هەتا بۆ هاوبەشەکەی پێشنیار نەکات».

### بَابُ الشُّفْعَةِ بِالْجِوَارِ

### باسی کڕینەوە و هەڵگرتنەوەی ماڵی دراوسێ

٤٧٤. عَنْ جَابِرٍ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه ﷺ: «الْجَارُ أَحَقُّ بِشُفْعَةِ جَارِه، يَنْتَظِرُ بِهَا إِنْ كَانَ غَائِبًا، إِذَا كَانَ طَرِيقُهُمَا وَاحِدًا».

جابیر رضي الله عنه دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەمومویەتی: «دراوسێ لەپێشتر و شایستەترە

بۆ دراوسێکەی، جا با چاوەڕێ بکات، ئەگەر ئامادەش نەبێت و دیار نەبێت مادام ڕێگایان یەکە (واتە: مادام هەردووکیان یەک ڕێگا بۆ ئەو شوێنە بەکار دێنن و نێوان و سێوانیان جیا نەکراوەتەوە)».

## بَابٌ إِذَا وَقَعَتِ الْحُدُودُ فَلَا شُفْعَةَ

### باسی ئەگەر سنوورەکان دیاری کران مافی شوفعە نامێنێت

٤٧٥. عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّه ﷺ قَالَ: إِنَّمَا جَعَلَ رَسُولُ اللَّه ﷺ الشُّفْعَةَ فِي كُلِّ مَا لَمْ يُقْسَمْ، فَإِذَا وَقَعَتِ الْحُدُودُ وَصُرِّفَتِ الطُّرُقُ فَلَا شُفْعَةَ.

جابیری کوڕی عەبدوڵڵا ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ مافی شوفعەی تەنها لە شتێک دیاری کردووە کە دابەش نەکرابێت، جا هەرکات سنوورەکان دیاری کران و ڕێگایان گۆڕان (ڕێگایان جیاواز بوو)، مافی شوفعەی نامێنێت.

# كِتَابُ اللُّقَطَةِ

## پەرتووكی (شتی) دۆزراوە

### بَابُ ضَالَّةِ الْإِبِلِ وَالْبَقَرِ وَالْغَنَمِ

### باسی وشتر و مانگا و مەڕی ونبوو

٤٧٦. عَنْ مُطَرِّفِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ الشِّخِّيرِ، عَنْ أَبِيهِ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «ضَالَّةُ الْمُسْلِمِ حَرَقُ النَّارِ».

موتەرریفی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی شیخخیر لە باوکیەوە ﵁ دەگێڕێتەوە، گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «شتی ونبووی موسوڵمان وەکوو کڵپەی ئاگر وایە (واتە: کەسێک شتێک ببینێتەوە و نیازی دانەوەی نەبێت ئەوە بۆی دەبێتە هۆی چوونە دۆزەخ)».

٤٧٧. عَنْ زَيْدِ بْنِ خَالِدٍ الْجُهَنِيِّ ﵁ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: سُئِلَ عَنْ ضَالَّةِ الْإِبِلِ، فَغَضِبَ وَاحْمَرَّتْ وَجْنَتَاهُ فَقَالَ: «مَا لَكَ وَلَهَا؟ مَعَهَا الْحِذَاءُ وَالسِّقَاءُ، تَرِدُ الْمَاءَ وَتَأْكُلُ الشَّجَرَ، حَتَّى يَلْقَاهَا رَبُّهَا»، وَسُئِلَ عَنْ ضَالَّةِ الْغَنَمِ، فَقَالَ: «خُذْهَا، فَإِنَّمَا هِيَ لَكَ أَوْ لِأَخِيكَ أَوْ لِلذِّئْبِ»، وَسُئِلَ عَنِ اللُّقَطَةِ، فَقَالَ: «اعْرِفْ عِفَاصَهَا وَوِكَاءَهَا وَعَرِّفْهَا

سَنَةً، فَإِنِ اعْتُرِفَتْ، وَإِلَّا فَاخْلِطْها بِمَالِكَ».

زەیدی كوڕی خالیدی جوهەنی ﵁ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، گوتوویەتی: پرسیار كرا لە پێغەمبەر ﷺ دەربارەی وشتری ونبوو (كەسێك بیگرێتەوە)، پێغەمبەریش ﷺ ڕوخساری سوور هەڵگەڕا و تووڕە بوو، ئینجا فەرمووی: «چ ئیشێكت پێیە خواردن و خواردنەوەی خۆی پێیە، بۆخۆی دەچێتە شوێنی ئاوخواردنەوە و لەوەڕ دەخوات تاكوو خاوەنەكەی پێی دەگاتەوە»، پرسیاری لێ كرا دەربارەی مەڕی ونبوو؟ فەرمووی: «بیگرەوە، یان بۆ تۆیە یان بۆ براكەتە یان بۆ گورگە (واتە: ناتوانێت خۆی بپارێزێت) »، ئینجا پرسیاری لێ كرا دەربارەی شتی دۆزراوە؟ فەرمووی: «توورەكە و ئەو داوەی توورەكەكەی پێی بەستراوە نیشانەی بكە و ساڵێك بانگەوازی بۆ بكە، جا ئەگەر خاوەنی لێ پەیدا بوو باشە، ئەگەرنا تێكەڵی بكە لەگەڵ ماڵی خۆت».

## بَابُ اللُّقَطَةِ

### باسی شتی دۆزراوە

٤٧٨. عَنْ عِيَاضِ بْنِ حِمَارٍ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه ﷺ: «مَنْ وَجَدَ لُقَطَةً فَلْيُشْهِدْ ذَا عَدْلٍ أَوْ ذَوَيْ عَدْلٍ، ثُمَّ لَا يُغَيِّرْه وَلَا يَكْتُمْ، فَإِنْ جَاءَ رَبُّها، فَهوَ أَحَقُّ بِها، وَإِلَّا فَهوَ مَالُ اللَّه يُؤْتِيه مَنْ يَشَاءُ».

عیازی كوڕی حیمار ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «هەر كەسێك شتێكی دۆزیەوە با كەسێكی دادپەروەر، یان دوو كەسی دادپەروەر بكاتە شایەت، پاشان با نەیگۆڕێت و نەیشارێتەوە، جا ئەگەر خاوەنەكەی هاتەوە بۆی، بێگومان لە هەموو كەس شایستەترە پێی، ئەگەرنا، موڵكی خوایە و كێی پێخۆش بێت دەیدات بە ئەو (واتە: با بۆخۆی بیخوات، مادام خاوەنی لێ پەیدا نەبێتەوە)».

٤٧٩. عَنْ زَيْدِ بْنِ خَالِدٍ الْجُهَنِيِّ ﵁: أَنَّ رَسُولَ اللَّه ﷺ سُئِلَ عَنِ اللُّقَطَةِ، فَقَالَ:

«عَرِّفْها سَنَةً، فَإِنِ اعْتُرِفَتْ فَأَدِّها، فَإِنْ لَمْ تُعْتَرَفْ، فَاعْرِفْ عِفَاصَها وَوِعَاءَها، ثُمَّ كُلْها، فَإِنْ جَاءَ صَاحِبُها فَأَدِّها إِلَيْه».

زەیدی کوڕی خالیدی جوهەنی ﷺ دەگێڕێتەوە: پرسیار لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرا دەربارەی شتێکی دۆزراوە (چی لێ بکرێت)، فەرمووی: «ساڵێک جاڕی بۆ بدە، ئەگەر خاوەنی بۆ پەیدا بوو بیدەوە، ئەگەریش خاوەنی پەیدا نەبوو تەماشا بکە تورەکە و دەمبەستەکە و ئەوەی تێیدایە چۆنە، پاشان بیخۆ، ئەگەر خاوەنی لێ پەیدا بوو، پێی بدەوە (بۆی قەرەبوو بکەوە)».

## بَابُ مَنْ أَصَابَ رِكَازًا

### باسی کەسێک گەنجینەیەکی شاراوەی ژێر زەوی بدۆزێتەوە

٤٨٠. عَنْ أَبِي هرَيْرَةَ ﷺ: أَنَّ رَسُولَ اللَّه ﷺ قَالَ: «فِي الرِّكَازِ الْخُمُسُ».

ئەبو هوڕەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «ئەو کانزایانەی کە لە کۆندا شاراونەتەوە (ڕیکاز)، ئەوە زەکاتەکەیان پێنجیەکە (واتە: لە هەر پێنج بەش بەشێک زەکاتە)».

## بَابُ أُمَّهاتِ الْأَوْلَادِ

### باسی ئەو کەنیزەکانەی دەبنە دایک لە پیاوی ئازاد

٤٨١. عَنِ جَابِرِ بْنَ عَبْدِ اللَّه ﷺ يَقُولُ: كُنَّا نَبِيعُ سَرَارِيَّنَا وَأُمَّهاتِ أَوْلَادِنَا، وَالنَّبِيُّ ﷺ فِينَا حَيٌّ. لَا نَرَى بِذَلِكَ بَأْسًا.

جابیری کوڕی عەبدوڵڵا ﷺ دەڵێت: ئێمە ئەو کەنیزەکانەی کە دەبوونە دایکی منداڵەکانیشمان دەمانفرۆشتن و پێغەمبەریش ﷺ زیندوو بوو لەنێوماندا بوو، بۆیە

هیچ شتێک لەوەدا (بە گوناهـ و تاوان) نابینین.

## بَابُ الْعِتْقِ

### باسی ئازادکردنی کۆیلە

٤٨٢. عَنْ شُرَحْبِيلَ بْنِ السِّمْطِ رضي الله عنه قَالَ: قُلْتُ لِكَعْبٍ: يَا كَعْبَ بْنَ مُرَّةَ، حَدِّثْنَا عَنْ رَسُولِ اللَّه ﷺ وَاحْذَرْ، قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّه ﷺ يَقُولُ: «مَنْ أَعْتَقَ امْرَأً مُسْلِمًا، كَانَ فِكَاكَه مِنَ النَّارِ، يُجْزِئُ كُلُّ عَظْمٍ مِنْه بِكُلِّ عَظْمٍ مِنْه، وَمَنْ أَعْتَقَ امْرَأَتَيْنِ مُسْلِمَتَيْنِ، كَانَتَا فِكَاكَه مِنَ النَّارِ، يُجْزِئُ بِكُلِّ عَظْمَيْنِ مِنْهمَا عَظْمٌ مِنْه».

شورەحبیلی کوڕی سیمت رضي الله عنه دەڵێت: بە کەعبم گوت: ئەی کەعبی کوڕی موڕڕە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ فەرموودەمان بۆ بگێڕەوە و وریاش بە، ئەویش گوتی: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: «هەر کەسێک پیاوێکی موسوڵمان ئازاد بکات، ئەوە بۆی دەبێتە هۆکاری ڕزگاربوون لە ئاگر، کە بە هەر بەشێک لە ئێسکەکانی دەبێتە پارێزەر بۆ بەشێک لە ئێسکەکانی کەسی ئازادکەر، وە هەر کەسێک دوو ئافرەتی موسوڵمان ئازاد بکات، دەبێتە هۆی ڕزگاربوونی لە ئاگر بە هەر دوو ئێسکی ئەو ئافرەتانە ئێسکێکی خۆی لە ئاگر ڕزگار دەکات».

٤٨٣. عَنْ أَبِي ذَرٍّ رضي الله عنه قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّه، أَيُّ الرِّقَابِ أَفْضَلُ؟ قَالَ: «أَنْفَسُها عِنْدَ أَهلِها، وَأَغْلَاها ثَمَنًا».

ئەبو زەڕ رضي الله عنه دەڵێت: گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا باشترین ئازادکردنی کۆیلە کامەیانە؟ فەرمووی: «ئەوەیان کە لەلای گەورەکەی بەهادارترینە، وە زۆرترین نرخی هەیە».

## بَابُ مَنْ مَلَكَ ذَا رَحِمٍ مَحْرَمٍ فَهوَ حُرٌّ

### باسی هەر کەسێك ببێتە خاوەن بەندەیەک کە مەحرەمی خۆی بێت، ئازاد دەبێت

٤٨٤. عَنْ سَمُرَةَ بْنِ جُنْدَبٍ ﵁ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «مَنْ مَلَكَ ذَا رَحِمٍ مَحْرَمٍ فَهوَ حُرٌّ».

سەمورەی کوڕی جوندەب ﵁ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: «هەر کەسێك بوو بە خاوەنی بەندەیەکی مەحرەمی خۆی، یەکسەر بەندەکە ئازاد دەبێت».

# كِتَابُ الْحُدُودِ

## پەرتووکی حەددەکان
## (سزا شەرعییەکان)

### بَابُ لَا يَحِلُّ دَمُ امْرِئ مُسْلِمٍ إِلَّا فِي ثَلَاثٍ

### باسی ڕشتنی خوێنی موسوڵمان دروست نییە جگە لە سێ حاڵەت

٤٨٥. عَنْ أَبِي أُمَامَةَ بْنِ سَهلِ بْنِ حُنَيْفٍ رضي الله عنه: أَنَّ عُثْمَانَ بْنَ عَفَّانَ رضي الله عنه أَشْرَفَ عَلَيْهِمْ، فَسَمِعَهمْ وَهمْ يَذْكُرُونَ الْقَتْلَ فَقَالَ: إِنَّهمْ لَيَتَوَاعَدُونِي بِالْقَتْلِ؟ فَلِمَ يَقْتُلُونِي؟ وَقَدْ سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّه ﷺ يَقُولُ: «لَا يَحِلُّ دَمُ امْرِئٍ مُسْلِمٍ إِلَّا فِي إِحْدَى ثَلَاثٍ: رَجُلٌ زَنَى وَهوَ مُحْصَنٌ فَرُجِمَ، أَوْ رَجُلٌ قَتَلَ نَفساً بِغَيْرِ نَفْسٍ، أَوْ رَجُلٌ ارْتَدَّ بَعْدَ إِسْلَامِه»، فَوَاللَّه مَا زَنَيْتُ فِي جَاهلِيَّةٍ وَلَا فِي إِسْلَامٍ، وَلَا قَتَلْتُ نَفْساً مُسْلِمَةً، وَلَا ارْتَدَدْتُ مُنْذُ أَسْلَمْتُ.

ئەبو ئومامەی کوڕی سەهلی کوڕی حونەیف رضي الله عنه دەگێڕێتەوە: عوسمانی کوڕی عەففان رضي الله عنه ئاگای لێیان بوو و گوێبیست بوو کە ئەوان باسی کوشتنی دەکەن، ئینجا گوتی: ئەوان هەڕەشەی کوشتنم لێ دەکەن، باشە بۆ دەمکوژن لە کاتێکدا کە بۆ خۆم گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: «ڕشتنی خوێنی مرۆڤی موسوڵمان حەڵاڵ نییە جگە لەم سێ حاڵەتە: پیاوێک زینا بکات و ژنی هەبێت کە ڕەجم دەکرێت، یان کەسێک

کەسێکی دیکە بکوژێت، بێ ئەوەی کەسی کوشتبێت، یان کەسێک لەدوای ئەوەی کە موسوڵمان بووە هەڵگەڕێتەوە کافر بێتەوە». دەی سوێند بە خوا نە لە سەردەمی نەفامی و نە لەدوای موسوڵمانبوون زینام نەکردووە، هیچ کەسێکی موسوڵمانیشم نەکوشتووە، دوای ئەوەی موسوڵمانیش بووم هەڵنەگەڕاومەتەوە (لە ئیسلام).

## بَابُ مَنْ لَا يَجِبُ عَلَيْهِ الْحَدُّ

### باسی ئەو کەسەی سزا و تۆڵەی لەسەر پێویست نابێت

٤٨٦. عَنْ عَطِيَّةَ الْقُرَظِيِّ ﵁ يَقُولُ: عُرِضْنَا عَلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ يَوْمَ قُرَيْظَةَ، فَكَانَ مَنْ أَنْبَتَ قُتِلَ، وَمَنْ لَمْ يُنْبِتْ خُلِّيَ سَبِيلُه، فَكُنْتُ فِيمَنْ لَمْ يُنْبِتْ فَخُلِّيَ سَبِيلِي.

عەتیەی قورەزی ﵁ دەڵێت: لەو ڕۆژەی کە بەسەر بەنو قوڕیزەدا هات ئێمەیان برد بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ، جا هەر کەسێک کە باڵغ بوو کوژرا، ئەوەشی کە باڵغ نەبوو لێی گەڕان، جا منیش لەوانە بووم کە باڵغ نەبووم بۆیە وازم لێ هێنرا.



٤٨٧. عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﵄ قَالَ: عُرِضْتُ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ يَوْمَ أُحُدٍ، وَأَنَا ابْنُ أَرْبَعَ عَشْرَةَ سَنَةً، فَلَمْ يُجِزْنِي، وَعُرِضْتُ عَلَيْه يَوْمَ الْخَنْدَقِ وَأَنَا ابْنُ خَمْسَ عَشْرَةَ سَنَةً، فَأَجَازَنِي، قَالَ نَافِعٌ: فَحَدَّثْتُ بِه عُمَرَ بْنَ عَبْدِ الْعَزِيزِ فِي خِلَافَتِه فَقَالَ: هٰذَا فَصْلُ مَا بَيْنَ الصَّغِيرِ وَالْكَبِيرِ.

ئیبن عومەر ﵄ دەڵێت: لە جەنگی ئوحوددا منیان برد بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ کە تەمەنم چواردە ساڵ بوو، بۆیە ڕێگەی پێ نەدام (بچم بۆ جەنگ)، لە ڕۆژی غەزای خەندەقدا بردمیان بۆ خزمەتی کە ئەو کات پازدە ساڵ بووم، جا ڕێگەی پێ دام. نافیع گوتوویەتی: ئەوەی بۆ عومەری کوڕی عەبدولعەزیز گێڕایەوە لە سەردەمی خیلافەتەکەیدا، ئەویش گوتی: ئەو تەمەنە جیاکەرەوەیە لە نێوان گەورە و گچکە.

## بَابُ السَّتْرِ عَلَى الْمُؤْمِنِ وَدَفْعِ الْحُدُودِ بِالشُّبُهاتِ

### باسی داپۆشینی هەڵەی بڕوادار و لابردنی سزا و تۆڵە بەهۆی گومانەوە

٤٨٨. عَنْ أَبِي هرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه ﷺ: «مَنْ سَتَرَ مُسْلِمًا سَتَرَه اللَّه فِي الدُّنْيَا وَالْآخِرَةِ».

ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «هەر کەسێک کەموکوڕی موسوڵمانێک داپۆشێت، خوا لە دونیا و دوارۆژ کەموکوڕییەکانی دادەپۆشێت».

٤٨٩. عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «مَنْ سَتَرَ عَوْرَةَ أَخِيه الْمُسْلِمِ، سَتَرَ اللَّه عَوْرَتَه يَوْمَ الْقِيَامَةِ، وَمَنْ كَشَفَ عَوْرَةَ أَخِيه الْمُسْلِمِ، كَشَفَ اللَّه عَوْرَتَه، حَتَّى يَفْضَحَه بِها فِي بَيْتِه».

ئیبن عەبباس ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: «هەر کەسێك کەموکوڕی برای موسوڵمانی داپۆشێت، خوا کەموکوڕییەکانی دادەپۆشێت لە ڕۆژی قیامەتدا، هەر کەس کەموکوڕیی برای موسوڵمانی ئاشکرا بکات، خوا کەموکوڕییەکانی ئاشکرا دەکات و ئابڕووی دەبات، هەتا ئەگەر لەنێو ماڵەکەی خۆیشیدا بێت».

## بَابُ حَدِّ الزِّنَا

### باسی سزای زینا

٤٩٠. عَنْ عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه ﷺ: «خُذُوا عَنِّي، خُذُوا عَنِّي، قَدْ جَعَلَ اللَّه لَهنَّ سَبِيلاً، الْبِكْرُ بِالْبِكْرِ جَلْدُ مِائَةٍ وَتَغْرِيبُ سَنَةٍ، وَالثَّيِّبُ بِالثَّيِّبِ جَلْدُ مِائَةٍ وَالرَّجْمُ».

عوبادەی کوڕی صامیت ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دوو جار فەرمووی:

«بڕیارەکە لە من وەربگرن، بەدڵنیایی خوای گەورە ڕێگاچارەی بۆ ئافرەتان داناوە: کچ لەگەڵ کوڕ (زینا بکەن) سەد دار و دوورخستنەوەی ساڵێکیان دەکەوێتە سەر، پیاوی هاوسەردار لەگەڵ ژنی هاوسەردار سەد دار و بەردبارانکردنیان دەکەوێتە سەر».

## بَابُ مَنْ عَمِلَ عَمَلَ قَوْمِ لُوطٍ

### باسی ئەوانەی کردەوەی گەلی لووط دەکەن

٤٩١. عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ: أَنَّ رَسُولَ اللَّه ﷺ قَالَ: «مَنْ وَجَدْتُمُوه يَعْمَلُ عَمَلَ قَوْمِ لُوطٍ، فَاقْتُلُوا الْفَاعِلَ وَالْمَفْعُولَ بِه».

ئیبن عەبباس ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «هەر کەسێکتان بینی کە کردەوەی گەلی لووط دەکات (واتە: نێربازی دەکات)، هەردووکیان بکوژن».

## بَابُ إِقَامَةِ الْحُدُودِ عَلَى الْإِمَاءِ

### باسی جێبەجێکردنی حەددەکان لەسەر کەنیزەک

٤٩٢. عَنْ أَبِي هرَيْرَةَ، وَزَيْدِ بْنِ خَالِدٍ، وَشِبْلٍ ﷺ قَالُوا: كُنَّا عِنْدَ النَّبِيِّ ﷺ فَسَأَلَه رَجُلٌ عَنِ الْأَمَةِ تَزْنِي قَبْلَ أَنْ تُحْصَنَ، فَقَالَ: «اجْلِدْها، فَإِنْ زَنَتْ فَاجْلِدْها»، ثُمَّ قَالَ: فِي الثَّالِثَةِ أَوْ فِي الرَّابِعَةِ: «فَبِعْها وَلَوْ بِحَبْلٍ مِنْ شَعَرٍ».

ئەبو هوڕەیرە و زەیدی کوڕی خالید و شیبل ﷺ دەڵێن: لە خزمەت پێغەمبەری خوادا ﷺ بووین، پیاوێک پرسیاری لێ کرد دەربارەی کەنیزەکێک کە پێش ئەوەی شوو بکات زینا بکات، ئەویش فەرمووی: «داری حەددی لێ بدە، ئینجا ئەگەر زینای

کردەوە داری حەددی لێ بدە»، پاشان لە سێیەم جار یان چوارەم جار فەرمووی: «جا بیفرۆشە ئەگەر بە پەتێک (گوریسێک)ـی لە موو دروستکراویش بێت».

## بَابُ حَدِّ السَّكْرَانِ

### باسی حەددی سەرخۆش

٤٩٣. عَنْ عُمَيْرِ بْنِ سَعِيدٍ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ عَلِيُّ بْنُ أَبِي طَالِبٍ: مَا كُنْتُ أَدِي مَنْ أَقَمْتُ عَلَيْهِ الْحَدَّ، إِلَّا شَارِبَ الْخَمْرِ، فَإِنَّ رَسُولَ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم لَمْ يَسُنَّ فِيهِ شَيْئًا، إِنَّمَا هوَ شَيْءٌ جَعَلْنَاه نَحْنُ.

عومەیری کوڕی سەعید رضي الله عنه دەڵێت: عەلی کوڕی ئەبو تالیب رضي الله عنه گوتوویەتی: بۆ هیچ کەسێک کە داری حەدم لێ داوە و مردووە خوێنم نەداوە، تەنها ئەو کەسە نەبێت کە شەڕابخۆرە، چونکە بەڕاستی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم (لە چل جەڵد زیاتر) هیچ بڕیارێکی حەددی دەربارەی نەفەرمووە، بەڵکوو تەنها خۆمان شتێکمان بۆ دیاری کردووە.

## بَابُ مَنْ قُتِلَ دُونَ مَالِهِ فَهوَ شَهِيدٌ

### باسی ئەو کەسەی لەپێناو پاراستنی ماڵەکەیدا بکوژرێت شەهیدە

٤٩٤. عَنْ سَعِيدِ بْنِ زَيْدِ بْنِ عَمْرِو بْنِ نُفَيْلٍ رضي الله عنه عَنِ النَّبِيِّ صلى الله عليه وسلم قَالَ: «مَنْ قُتِلَ دُونَ مَالِهِ فَهوَ شَهِيدٌ».

سەعیدی کوڕی زەیدی کوڕی عەمڕی کوڕی نوفەیل رضي الله عنه دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: «هەر کەسێک لەپێناو ماڵەکەیدا بکوژرێت، ئەوە شەهیدە».

## بَابُ حَدِّ السَّارِقِ

### باسی حەددی دز

٤٩٥. عَنْ أَبِي هرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه ﷺ: «لَعَنَ اللَّه السَّارِقَ، يَسْرِقُ الْبَيْضَةَ فَتُقْطَعُ يَدُه، وَيَسْرِقُ الْحَبْلَ فَتُقْطَعُ يَدُه».

ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «نەفرەتی خوا لەو دزەی کە هێلکەیەک دەدزێت و بەهۆیەوە دەستی دەبڕدرێت، پەتکێک دەدزێت و بەهۆیەوە دەستی دەبڕدرێت».

## بَابُ الْخَائِنِ وَالْمُنْتَهِبِ وَالْمُخْتَلِسِ

### باسی ناپاک و تاڵانکەر و ماڵڕفێن

٤٩٦. عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّه ﷺ: أَنَّ رَسُولَ اللَّه ﷺ قَالَ: «لَا يُقْطَعُ الْخَائِنُ، وَلَا الْمُنْتَهِبُ، وَلَا الْمُخْتَلِسُ».

جابیری کوڕی عەبدوڵڵا ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «دەستی ناپاک و تاڵانکەر و ماڵڕفێن نابڕدرێت».

تێبینی:

خائین: ئەو کەسەی دزی بکات لەو شتەی کە بەئەمانەت لەلای دانراوە و ناپاکی تێدا بکات.

تاڵانکەر: ئەو کەسەی بەئاشکرا شتەکە ببات.

ڕفێنەر: ئەو کەسەی بەئاشکرا و بەخێرایی شت بڕفێنێت.

## بَابُ لَا يُقْطَعُ فِي ثَمَرٍ وَلَا كَثَرٍ

### باسی بەروبووم بە دارەوە و کرۆکی دارخورما دەستیان لەسەر نابڕدرێت

٤٩٧. عَنْ رَافِعِ بْنِ خَدِيجٍ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه ﷺ: «لَا قَطْعَ فِي ثَمَرٍ وَلَا كَثَرٍ».

ڕافیعی کوڕی خەدیج ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «ئەو بەروبوومەی کە بە دارەوەیە و لێ نەکراوەتەوە و کرۆکی دارخورماش دەستبڕینی لەسەر نییە».

تێبینی:

(کثر): شتێکی سپییە لەنێو قەدی دار خورما دێتەدەر و دەخورێت.

## بَابُ مَنْ سَرَقَ مِنَ الْحِرْزِ

### باسی ئەو کەسەی شت لە شوێنی پارێزراوی شایەن دەدزێ

٤٩٨. عَنْ عَبْدِ اللَّه بْنِ صَفْوَانَ، عَنْ أَبِيه ﵁: أَنَّه نَامَ فِي الْمَسْجِدِ وَتَوَسَّدَ رِدَاءَه، فَأُخِذَ مِنْ تَحْتِ رَأْسِه، فَجَاءَ بِسَارِقِه إِلَى النَّبِيِّ ﷺ، فَأَمَرَ بِه النَّبِيُّ ﷺ أَنْ يُقْطَعَ، فَقَالَ صَفْوَانُ: يَا رَسُولَ اللَّه لَمْ أُرِدْ هذَا، رِدَائِي عَلَيْه صَدَقَةٌ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّه ﷺ: «فَهلَّا قَبْلَ أَنْ تَأْتِيَنِي بِه».

عەبدوڵڵای کوڕی صەفوان لە باوکیەوە ﵁ دەگێڕێتەوە: لە مزگەوت نوستووە و سەری بە عەباکەی کردووە و یەکێک لەبن سەری دەریهێناوە (دزراوە)، ئینجا دزەکەی هێنا بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ، جا پێغەمبەر ﷺ فەرمانی کرد بە دەستبڕینی، صەفوانیش گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ من ئەوەم نەدەویست! عەباکەم دەبەخشم بە ئەو، ئینجا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: «نەدەکرا پێش ئەوەی بیهێنیت بۆ لای من بیبەخشیت؟».

## بَابُ التَّعْزِيرِ

### باسی تەمێکردن

٤٩٩. عَنْ أَبِي بُرْدَةَ بْنِ نِيَارٍ ﵁: أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ كَانَ يَقُولُ: «لَا يُجْلَدُ أَحَدٌ فَوْقَ عَشْرِ جَلَدَاتٍ، إِلَّا فِي حَدٍّ مِنْ حُدُودِ اللَّه».

ئەبو بوردەی کوڕی نیار ﵁ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: «هیچ کەسێک لە دە دار زیاتری لێ نادرێت، مەگەر لە حەددێک نەبێت لە حەددەکانی خوا».

## بَابُ الْحَدُّ كَفَّارَةٌ

### باسی (جێبەجێکردنی) حەدد پاکبوونەوەی گوناهبارە

٥٠٠. عَنْ عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: «مَنْ أَصَابَ مِنْكُمْ حَدًّا فَعُجِّلَتْ لَه عُقُوبَتُه، فَهوَ كَفَّارَتُه، وَإِلَّا فَأَمْرُه إِلَى اللَّه».

عوبادەی کوڕی صامیت ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «هەر یەکێک لە ئێوە تووشی حەددێک بوو، جا سزاکەی پێش خرا، ئەوە بۆی دەبێتە کەفارەت، ئەگەرنا ئەوە لەژێر ویستی خوادایە».

## بَابُ الرَّجُلِ يَجِدُ مَعَ امْرَأَتِه رَجُلًا

### باسی پیاوێک کەسێک لەگەڵ ژنەکەی ببینێت

٥٠١. عَنْ أَبِي هرَيْرَةَ ﵁: أَنَّ سَعْدَ بْنَ عُبَادَةَ الْأَنْصَارِيَّ قَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، الرَّجُلُ

يَجِدُ مَعَ امْرَأَتِه رَجُلاً، أَيَقْتُلُه؟ قَالَ رَسُولُ اللَّه ﷺ: «لَا»، قَالَ سَعْدٌ: بَلَى، وَالَّذِي أَكْرَمَكَ بِالْحَقِّ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّه ﷺ: «اسْمَعُوا مَا يَقُولُ سَيِّدُكُمْ».

ئەبو هوڕەیرە ﵁ دەگێڕێتەوە: سەعدی کوڕی عوبادەی ئەنصاڕی ﵁ گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ پیاوێک لەگەڵ ژنەکەی خۆی پیاوێک دەبینێت، ئایا بۆی هەیە بیکوژێت؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: «نەخێر»، سەعد گوتی: بەڵێ، دەبێت بیکوژێت سوێند بەو زاتەی کە بەهەق ڕێزی لێ گرتوویت، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: «گوێ بگرن لەوەی کە گەورەکەتان دەیڵێت».

تێبینی:

مەبەست لە قسەکەی سەعد ڕەتکردنەوەی قسە و حوکمی پێغەمبەر ﷺ نییە، بەڵکوو مەبەستی پەرۆشی و غیرەت و عیزەت و توڕەبوون وا لە پیاوەکە دەکات کە ئەو کارە بکات.

# كِتَابُ الدِّيَاتِ

# پەرتووكی خوێنباییەكان

## بَابُ التَّغْلِيظِ فِي قَتْلِ مُسْلِمٍ ظُلْمًا

### باسی هەڕەشەی توند لە كوشتنی موسوڵمان بەستەم

٥٠٢. عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَوَّلُ مَا يُقْضَى بَيْنَ النَّاسِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ فِي الدِّمَاءِ».

عەبدوڵڵا ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «یەكەم شتێک كە لە نێوان خەڵكیدا دادوەری لەسەر دەكرێت لە ڕۆژی قیامەتدا دەربارەی خوێنەكانە».

٥٠٣. عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ الْجُهَنِيِّ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ لَقِيَ اللَّهَ لَا يُشْرِكُ بِهِ شَيْئًا لَمْ يَتَنَدَّ بِدَمٍ حَرَامٍ دَخَلَ الْجَنَّةَ».

عوقبەی كوڕی عامیری جوهەنی ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «هەر كەسێک (لە قیامەتدا) بە خوا بگات و هیچ هاوەڵێكی بۆ خوا بڕیار نەدابێت و خوێنی كەسیشی لە ئەستۆدا نەبێت، دەچێتە بەهەشتەوە».

٥٠٤. عَنِ الْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ ﵁: أَنَّ رَسُولَ اللَّه ﷺ قَالَ: «لَزَوَالُ الدُّنْيَا أَهوَنُ عَلَى اللَّه مِنْ قَتْلِ مُؤْمِنٍ بِغَيْرِ حَقٍّ».

بەڕائی کوڕی عازیب ﵁ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «بێگومان لەناوچوونی دونیا سادە و ئاسانترە لەلای خوا، لە کوشتنی بڕوادارێک بەناهەق».

## بَابُ هَلْ لِقَاتِلِ مُؤْمِنٍ تَوْبَةٌ

### باسی ئایا بکوژی بڕوادار تۆبەی بۆ هەیە؟

٥٠٥. عَنْ سَالِمِ بْنِ أَبِي الْجَعْدِ ﵁ قَالَ: سُئِلَ ابْنُ عَبَّاسٍ عَمَّنْ قَتَلَ مُؤْمِنًا مُتَعَمِّدًا ثُمَّ تَابَ وَآمَنَ وَعَمِلَ صَالِحًا ثُمَّ اهتَدَى، قَالَ: وَيْحَه، وَأَنَّى لَه الْهدَى؟ سَمِعْتُ نَبِيَّكُمْ ﷺ يَقُولُ: «يَجِيءُ الْقَاتِلُ وَالْمَقْتُولُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ مُتَعَلِّقٌ بِرَأْسِ صَاحِبِه يَقُولُ: رَبِّ سَلْ هذَا لِمَ قَتَلَنِي؟». وَاللَّه لَقَدْ أَنْزَلَها اللَّه ﷻ عَلَى نَبِيِّكُمْ، ثُمَّ مَا نَسَخَها بَعْدَمَا أَنْزَلَها.

سالیمی کوڕی ئەبو جەعد ﵁ دەڵێت: پرسیار لە ئیبن عەبباس کرا دەربارەی کەسێک کە بەئەنقەست بڕوادارێکی کوشتووە، پاشان تەوبەی کردووە و بڕوای هێناوە و کردەوەی باشی کردووە، پاشان ڕێگای ڕاستی گرتووە، ئەویش گوتی: بەڵای لێ بدات، چۆن ڕێگای ڕاستی گرتووە؟! بۆخۆم گوێم لە پێغەمبەرەکەتان ﷺ بوو دەیفەرموو: «لە ڕۆژی قیامەتدا بکوژ و کوژراو دێنن کە کوژراوەکە بە سەری بکوژەکە بەستراوە و دەڵێت: پەروەردگارا پرسیاری لێ بکە بۆچی منی کوشتووە؟»، سوێند بە خوا بێگومان خوا ﷻ (حوکمەکەی) دابەزاندۆتە سەر پێغەمبەرەکەتان ﷺ، پاشان نەسخیش نەبۆتەوە پاش دابەزینی.

## بَابُ مَنْ قُتِلَ لَه قَتِيلٌ فَهوَ بِالْخِيَارِ بَيْنَ إِحْدَى ثَلَاثٍ

### باسی ئەو کەسەی کەسێکی لێ کوژراوە، لە سێ شت سەرپشکە

٥٠٦. عَنْ أَبِي هرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه ﷺ: «مَنْ قُتِلَ لَه قَتِيلٌ فَهوَ بِخَيْرِ النَّظَرَيْنِ: إِمَّا أَنْ يَقْتُلَ، وَإِمَّا أَنْ يُفْدَى».

ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «هەرکەسێک کەسێکی لێ کوژرا، ئەوە سەرپشکە لەنێوان دوو شتدا: یان بکوژ بکوژێتەوە، یان خوێنبایی وەربگرێت».

تێبینی:

لە ڕیوایەتی دیکەدا هاتووە لە صەحیحی موسلیم، بژاردەی سێیەم بریتییە لە پێبژاردن و خوێنبایی وەرگرتن.

## بَابُ دِيَةِ شِبْه الْعَمْدِ مُغَلَّظَةً

### باسی خوێنبایی کوشتنی وەکوو بەئەنقەست (نیمچە ئەنقەست)

٥٠٧. عَنْ عَبْدِ اللَّه بْنِ عَمْرٍو ﷺ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «قَتِيلُ الْخَطَأِ شِبْه الْعَمْدِ، قَتِيلُ السَّوْطِ وَالْعَصَا، مِائَةٌ مِنَ الْإِبِلِ، أَرْبَعُونَ مِنْها خَلِفَةً، فِي بُطُونِها أَوْلَادُها».

عەبدوڵڵای کوڕی عەمر ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: «خوێنبایی کوشتنی هەڵەی نیمچە قەستی بە قامچی و گۆچان سەد وشترە، چل دانە لەو سەدە وشتری ئاوسن (بەچکەکەیان لە سکیاندایە)».

## بَابُ الدِّيَةِ عَلَى الْعَاقِلَةِ فَإِنْ لَمْ يَكُنْ عَاقِلَةٌ فَفِي بَيْتِ الْمَالِ

### باسی خوێنبایی لە ئەستۆی خزمەکانە، ئەگەر خزم و کەسی نەبوو، لە خەزێنەی دەوڵەت دەدرێت

٥٠٨. عَنِ الْمُغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ ﵁ قَالَ: قَضَى رَسُولُ اللَّه ﷺ بِالدِّيَةِ عَلَى الْعَاقِلَةِ.

موغیرەی کوڕی شوعبە ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ بڕیاری داوە کە ئەو خوێنباییەی لەسەر کەسوکارە بیدەن.

٥٠٩. عَنِ الْمِقْدَامِ الشَّامِيِّ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه ﷺ: «أَنَا وَارِثُ مَنْ لَا وَارِثَ لَه، أَعْقِلُ عَنْه وَأَرِثُه، وَالْخَالُ وَارِثُ مَنْ لَا وَارِثَ لَه، يَعْقِلُ عَنْه وَيَرِثُه».

میقدامی شامی ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «من میراتگری کەسێکم کە میراتگری نەبێت، خوێنبایی بۆ دەدەم و میراتیشی لێ دەگرم، وە خاڵیش میراتگری کەسێکە کە میراتگری نەبێت، خوێنبایی بۆ دەدات و میراتیشی لێ دەگرێت».

## بَابُ الْمِيرَاثِ مِنَ الدِّيَةِ

### باسی میراتی خوێنبایی

٥١٠. عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيِّبِ ﵀: أَنَّ عُمَرَ ﵁ كَانَ يَقُولُ: الدِّيَةُ لِلْعَاقِلَةِ وَلَا تَرِثُ الْمَرْأَةُ مِنْ دِيَةِ زَوْجِها شَيْئًا، حَتَّى كَتَبَ إِلَيْه الضَّحَّاكُ بْنُ سُفْيَانَ: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ وَرَّثَ امْرَأَةَ أَشْيَمَ الضِّبَابِيِّ مِنْ دِيَةِ زَوْجِها.

سەعیدی کوڕی موسەییب ﵀ دەگێڕێتەوە: عومەر ﵁ دەیگوت: خوێنبایی بۆ خزم و کەسوکاری کوژراوەکەیە لە باوکەوە (نەك دایك)، وە دەیگوت: ئافرەت (کاتێك

مێردەکەی کوژرا) هیچی بەر ناکەوێت لە خوێنبایی مێردەکەی، هەتا کاتێك زەححاکی کوڕی سوفیان نووسراوی بۆ نووسی، (تێیدا هاتبوو): پێغەمبەر ﷺ (کاتێك یەکێك لە هاوەڵەکانی بەهەڵە کوژرا)، بەشێك لە میراتەکەی دا بە هاوسەرەکەی.

## بَابُ الْقَاتِلِ لَا يَرِثُ

### باسی بکوژ میرات ناگرێت لە کوژراو

٥١١. عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ ﵁: أَنَّ أَبَا قَتَادَةَ ﵁ -رَجُلٌ مِنْ بَنِي مُدْلِجٍ- قَتَلَ ابْنَه، فَأَخَذَ مِنْه عُمَرُ مِائَةً مِنَ الْإِبِلِ ثَلَاثِينَ حِقَّةً وَثَلَاثِينَ جَذَعَةً وَأَرْبَعِينَ خَلِفَةً، فَقَالَ: أَيْنَ أَخُو الْمَقْتُولِ؟ سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّه ﷺ يَقُولُ: «لَيْسَ لِقَاتِلٍ مِيرَاثٌ».

عەمری کوڕی شوعەیب ﵁ دەگێڕێتەوە: ئەبو قەتادە ﵁ -کە پیاوێک بوو لە هۆزی بەنو مودلیج- کوڕەکەی خۆی کوشتبوو، جا عومەر سەد وشتری لێ وەرگرت: سی وشتری سێساڵە و سی وشتری چوارساڵە و چل وشتری ئاوس، ئینجا گوتی: برای کوژراوەکە لەکوێیە؟ گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: «بکوژ هیچ میرات ناگرێت (هیچی بە باوکە بکوژەکە نەدا)».

## بَابُ الْقِصَاصِ فِي السِّنِّ

### باسی تۆڵەکردنەوەی ددان

٥١٢. عَنْ أَنَسٍ ﵁ قَالَ: كَسَرَتِ الرُّبَيِّعُ عَمَّةُ أَنَسٍ ثَنِيَّةَ جَارِيَةٍ، فَطَلَبُوا الْعَفْوَ، فَأَبَوْا، فَعَرَضُوا عَلَيْهِمُ الْأَرْشَ، فَأَبَوْا، فَأَتَوُا النَّبِيَّ ﷺ، فَأَمَرَ بِالْقِصَاصِ، فَقَالَ: أَنَسُ بْنُ النَّضْرِ يَا رَسُولَ اللَّه، تُكْسَرُ ثَنِيَّةُ الرُّبَيِّعِ وَالَّذِي بَعَثَكَ بِالْحَقِّ لَا تُكْسَرُ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «يَا أَنَسُ كِتَابُ اللَّه الْقِصَاصُ»، قَالَ: فَرَضِيَ الْقَوْمُ فَعَفَوْا، فَقَالَ رَسُولُ

اللَّه ﷺ: «إِنَّ مِنْ عِبَادِ اللَّه مَنْ لَوْ أَقْسَمَ عَلَى اللَّه لَأَبَرَّه».

ئەنەس ﵁ دەڵێت: ڕوبەیعی پووری ئەنەس ددانی دووانەی کچێکی شکاند، جا داوای لێخۆشبوونیان کرد، ئەوانیش لێی خۆش نەبوون و داوای خوێنباییان کرد، ئەوانیش ڕەتیان کردەوە، ئینجا هاتن بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ، ئەویش فەرمانی کرد کە تۆڵەیان لێ بکرێتەوە، ئینجا ئەنەسی کوڕی نەزر گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ددانی دووانەی ڕوبەیع دەشکێنرێت، سوێند بەو زاتەی تۆی بەهەق ناردووە ددانی ناشکێنرێت، ئینجا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: «ئەی ئەنەس تۆڵەکردنەوە لە قوڕئاندا هاتووە»، ڕاوی دەڵێت: جا خەڵکەکە ڕازی بوون و لێی خۆش بوون، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: «بەڕاستی هەندێ لە بەندەکانی خوا هەن ئەگەر سوێندی لەسەر بخوات (کارێکی بۆ بکات) خوا سوێندەکەی بۆ جێبەجێ دەکات».

## بَابُ دِيَةِ الْأَسْنَانِ

### باسی خوێنبایی ددان

٥١٣. عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄: أَنَّ رَسُولَ اللَّه ﷺ قَالَ: «الْأَسْنَانُ سَوَاءٌ الثَّنِيَّةُ وَالضِّرْسُ سَوَاءٌ».

ئیبن عەبباس ﵄ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «ددانەکان وەکوو یەک یەکسانن دووانە و خڕێنە یەکسانن (واتە: ئەگەر ناویشیان جیا بێت، هەر وەکوو یەک یەکسانن و ددان هەر ددانە)».

٥١٤. عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّه قَضَى فِي السِّنِّ خَمْسًا مِنَ الْإِبِلِ.

ئیبن عەبباس ﵄ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ بۆ خوێنبایی ددان پێنج وشتری بڕیار داوە (بۆ هەر ددانێک پێنج وشتر).

## بَابُ مَنْ عَضَّ رَجُلاً فَنَزَعَ يَدَه فَنَدَرَ ثَنَايَاه

### باسی ئەوەی دەستی کەسێک دەگەزێت، کابرا دەستی ڕادەکێشێت و ددانی پێشەوەی دەردێت

٥١٥. عَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ ﵁: أَنَّ رَجُلاً عَضَّ رَجُلاً عَلَى ذِرَاعِه فَنَزَعَ يَدَه فَوَقَعَتْ ثَنِيَّتَاه، فَرُفِعَ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ فَأَبْطَلَهمَا وَقَالَ: «يَقْضَمُ أَحَدُكُمْ كَمَا يَقْضَمُ الْفَحْلُ».

عیمڕانی کوڕی حوصەین ﵁ دەگێڕێتەوە: پیاوێک باسکی پیاوێکی دیکەی گەست، ئەویش دەستی (لە دەمی) ڕادەپسکێوێت، ئەویش ددانی پێشەوەی هەڵدەوەرێت و داواکەی (بۆ خوێنبایی) بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ بەرز کردەوە، پێغەمبەریش ﷺ داواکەی هەڵوەشاندەوە، فەرمووی: «یەکێکتان ئەوی دیکە وەکوو نێرە وشتر دەگەزێت (دواتریش داوای ماف دەکەن)».

## بَابُ لَا يُقْتَلُ مُؤْمِنٌ بِكَافِرٍ

### باسی موسوڵمان لەبری کافر ناکوژرێتەوە

٥١٦. عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «لَا يُقْتَلُ مُؤْمِنٌ بِكَافِرٍ، وَلَا ذُو عَهدٍ فِي عَهدِه».

ئیبن عەبباس ﵄ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: «بڕوادار لەبری کافر ناکوژرێتەوە، هەروەها کافرێک کە لەژێر پەیمانی موسوڵماناندا بێت لەبری کافرێک کە پەیمانی لەگەڵ موسوڵماناندا نەبێت ناکوژرێتەوە».

## بَابُ لَا يُقْتَلُ وَالِدٌ بِوَلَدِه

### باسی باوک لە تۆڵەی کوڕەکەی ناکوژرێتەوە

٥١٧. عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ: أَنَّ رَسُولَ اللَّه ﷺ قَالَ: «لَا يُقْتَلُ بِالْوَلَدِ الْوَالِدُ».

ئیبن عەبباس ﷺ دەگێڕێتەوە: کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «لە تۆڵەی منداڵ باوکەکە ناکوژرێتەوە. (ئەگەر باوک کوڕی خۆی کوشت ناکوژرێتەوە)».

## بَابُ لَا يَجْنِي أَحَدٌ عَلَى أَحَدٍ

### باسی کەس تاوانی کەس هەڵناگرێت

٥١٨. عَنْ سُلَيْمَانَ بْنِ عَمْرِو بْنِ الْأَحْوَصِ، عَنْ أَبِيه ﷺ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّه ﷺ يَقُولُ فِي حَجَّةِ الْوَدَاعِ: «أَلَا لَا يَجْنِي جَانٍ إِلَّا عَلَى نَفْسِه، لَا يَجْنِي وَالِدٌ عَلَى وَلَدِه، وَلَا مَوْلُودٌ عَلَى وَالِدِه».

لە سولەیمانی کوڕی عەمری کوڕی ئەحوەصەوە لە باوکیەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، گوتوویەتی: لە حەجی ماڵئاواییدا گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: «ئاگادار بن تاوانبار تاوانەکەی تەنها لەسەر خۆیەتی، باوک لەسەر منداڵەکەی تاوانبار ناکرێت، وە منداڵیش لەسەر باوکی تاوانبار ناکرێت».

## بَابُ الْمُسْلِمُونَ تَتَكَافَأُ دِمَاؤُهُمْ

### باسی موسوڵمانان یەکسانن لە تۆڵە و خوێندا

٥١٩. عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «الْمُسْلِمُونَ تَتَكَافَأُ دِمَاؤُهُمْ وَهمْ يَدٌ

عَلَى مَنْ سِوَاهِمْ، يَسْعَى بِذِمَّتِهِمْ أَدْنَاهِمْ، وَيُرَدُّ عَلَى أَقْصَاهِمْ».

ئیبن عەبباس ﵄ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: «موسوڵمانان خوێنەکانیان یەکسانە (گەورە و گچکە و پلەوپایە بەهێز و لاواز هەموویان یەکسانن لە تۆڵە و خوێنباییدا)، لەگەڵ یەکدیدا یەکدەستن و هاوکاری یەکدین لە بەرانبەر خەڵکی دیکەدا، کامەیان لە هەمووان لە خوارەوەترە، ئەگەر کەسێکی پەنا دا پەنادانەکە دەکەوێتە ئەستۆی هەمووان، نزیک و دوور و لاواز و بەهێز لە غەنیمەتدا یەکسانن».

٥٢٠. عَنْ مَعْقِلِ بْنِ يَسَارٍ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه ﷺ: «الْمُسْلِمُونَ يَدٌ عَلَى مَنْ سِوَاهِمْ، وَتَتَكَافَأُ دِمَاؤُهِمْ».

مەعقیلی کوڕی یەسار ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «موسوڵمانان هەموویان یەکدەست و یەکبازوون لەگەڵ یەکدیی بەرانبەر بە غەیری خۆیان و خوێنەکانیان یەکسانن».



## بَابُ مَنْ قَتَلَ مُعَاهدًا

## باسی کەسێک خاوەن پەیمانێک بکوژێت

٥٢١. عَنْ عَبْدِ اللَّه بْنِ عَمْرٍو ﵄ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه ﷺ: «مَنْ قَتَلَ مُعَاهدًا لَمْ يَرَحْ رَائِحَةَ الْجَنَّةِ، وَإِنَّ رِيحَها لَيُوجَدُ مِنْ مَسِيرَةِ أَرْبَعِينَ عَامًا».

عەبدوڵڵای کوڕی عەمر ﵄ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «هەر کەسێک کافرێکی خاوەن پەیمان (کافرێک کە پەیمانی پاراستنی پێ درابێت) بکوژێت، بۆنی بەهەشت ناکات، لە کاتێکدا بێگومان بۆنی بەهەشت لە دووری چل ساڵە ڕێگا بۆن دەکرێت».

## بَابُ مَنْ أَمِنَ رَجُلاً عَلَى دَمِه فَقَتَلَه

## باسی كەسێک دڵنيايی بداتە پياوێک و بيكوژێت

٥٢٢. عَنْ رِفَاعَةَ بْنِ شَدَّادٍ الْفِتْيَانِيِّ رضي الله عنه قَالَ: لَوْلَا كَلِمَةٌ سَمِعْتُها مِنْ عَمْرِو بْنِ الْحَمِقِ الْخُزَاعِيِّ، لَمَشَيْتُ فِيمَا بَيْنَ رَأْسِ الْمُخْتَارِ وَجَسَدِه سَمِعْتُه يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللَّه ﷺ: «مَنْ أَمِنَ رَجُلاً عَلَى دَمِه، فَقَتَلَه، فَإِنَّه يَحْمِلُ لِوَاءَ غَدْرٍ يَوْمَ الْقِيَامَةِ».

ڕيفاعەی كوڕی شەددادی فيتيانی رضي الله عنه دەڵێت: ئەگەر ئەو قسەيە نەبايە كە لە عەمری كوڕی حەميقی خوزاعييەوە بيستوومە، سەری موختارم لە لاشەی جيا دەكردەوە، بە نێوانی سەری و لاشەيدا هاتووچۆم دەكرد، (بەڵام) گوێم لێ بوو دەيگوت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموويەتی: «هەر كەسێک دڵنيايی بداتە كەسێک كە گيانی پارێزراو بێت و دواتريش بيكوژێت، ئەوە ئەو كەسە لە ڕۆژی قيامەتدا ئاڵای ناپاكی و ستەمكاری هەڵدەگرێت».

## بَابُ الْعَفْوِ عَنِ الْقَاتِلِ

## باسی چاوپۆشيكردن و لێخۆشبوون لە بكوژ

٥٢٣. عَنْ أَبِي هرَيْرَةَ رضي الله عنه قَالَ: قَتَلَ رَجُلٌ عَلَى عَهدِ رَسُولِ اللَّه ﷺ، فَرُفِعَ ذَلِكَ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ، فَدَفَعَه إِلَى وَلِيِّ الْمَقْتُولِ، فَقَالَ الْقَاتِلُ: يَا رَسُولَ اللَّه، وَاللَّه مَا أَرَدْتُ قَتْلَه، فَقَالَ رَسُولُ اللَّه ﷺ لِلْوَلِيِّ: «أَمَا إِنَّه إِنْ كَانَ صَادِقًا ثُمَّ قَتَلْتَه دَخَلْتَ النَّارَ». قَالَ: فَخَلَّى سَبِيلَه، قَالَ: وَكَانَ مَكْتُوفًا بِنِسْعَةٍ، فَخَرَجَ يَجُرُّ نِسْعَتَه، فَسُمِّيَ ذَا النِّسْعَةِ.

ئەبو هوڕەيرە رضي الله عنه دەڵێت: لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا ﷺ پياوێک كەسێكی كوشت، جا داواكەيان بەرز كردەوە بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ، ئەويش دای بە دەستی خزم و كەسی كوژراوەكە، بكوژەكەش گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ

سوێند بە خوا نیازی کوشتنیم نەبوو، ئینجا پێغەمبەری خوا ﷺ بە خزم و کەسی کوژراوەکەی فەرموو: «بەڵام ئەگەر ڕاست بکات (کە مەبەستی کوشتن نەبووە) و تۆش بیکوژیتەوە، تۆ دەچیتە دۆزەخ». ڕاوی دەڵێت: ئەویش وازی لێ هێنا، دەڵێت: بکوژەکە دەستەکانی بە قایشێک بەسترابوو، جا کە هاتە دەرەوە قایشەکەی بەدوای خۆیدا ڕادەکێشا، لەو کاتەوە ناویان لێ نا خاوەن قایش.

## بَابُ الْعَفْوِ فِي الْقِصَاصِ

### باسی لێخۆشبوون لە تۆڵەکردنەوەدا

**٥٢٤. عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: مَا رُفِعَ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ شَيْءٌ فِيهِ الْقِصَاصُ، إِلَّا أَمَرَ فِيهِ بِالْعَفْوِ.**

ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێت: هەر داوایەکی تۆڵەکردنەوە بەرز کرابێتەوە بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ، هەر فەرمانی بەوە کردووە کە لێی خۆش بێت.

# كِتَابُ الْوَصَايَا

## پەرتووکی وەسییەتەکان

### بَابُ هَلْ أَوْصَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ

### باسی ئایا پێغەمبەری خوا ﷺ وەسییەتی کردووە؟

٥٢٥. عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها قَالَتْ: مَا تَرَكَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ دِينَارًا وَلَا دِرْهمًا، وَلَا شَاةً وَلَا بَعِيرًا، وَلَا أَوْصَى بِشَيْءٍ.

عائیشە رضي الله عنها دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ نە درهەم و نە دینار و نە مەڕ و نە وشتری (وەک میرات) لەدوای خۆی بەجێ نەهێشت، وە (لە بارەی سەروەت و سامان) وەسییەتی بە هیچ شتێک نەکرد.

٥٢٦. عَنْ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ رضي الله عنه قَالَ: كَانَ آخِرُ كَلَامِ النَّبِيِّ ﷺ: «الصَّلَاةَ وَمَا مَلَكَتْ أَيْمَانُكُمْ».

عەلی کوڕی ئەبو تالیب رضي الله عنه دەڵێت: کۆتا فەرمایشتی پێغەمبەر ﷺ ئەوە بوو: «ئاگاداری نوێژەکانتان بن و ئاگاتان لەوانەش بێت کە لەژێر دەستتانن (واتە: کۆیلە و کەنیزەکان)».

## بَابُ الْحَثِّ عَلَى الْوَصِيَّةِ

### باسی هاندان لەسەر وەسییەتکردن

٥٢٧. عَنِ ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَا حَقُّ امْرِئٍ مُسْلِمٍ أَنْ يَبِيتَ لَيْلَتَيْنِ وَلَه شَيْءٌ يُوصِي فِيه، إِلَّا وَوَصِيَّتُه مَكْتُوبَةٌ عِنْدَه».

ئیبن عومەر رضي الله عنهما دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «کەسێکی موسوڵمان شتێکی هەبێت و پێویست بێت وەسییەتی پێ بکات، هەق نییە دوو شەو لەسەر یەک بمێنێتەوە، کەچی وەسییەتنامەکەی بە نووسراوی لای نەبێت».

## بَابُ الْوَصِيَّةِ بِالثُّلُثِ

### باسی وەسییەتکردن بە سێیەکی ماڵ

٥٢٨. عَنْ عَامِرِ بْنِ سَعْدٍ، عَنْ أَبِيه رضي الله عنه قَالَ: مَرِضْتُ عَامَ الْفَتْحِ حَتَّى أَشْفَيْتُ عَلَى الْمَوْتِ، فَعَادَنِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، فَقُلْتُ: أَيْ رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّ لِي مَالاً كَثِيرًا وَلَيْسَ يَرِثُنِي إِلَّا ابْنَةٌ لِي، أَفَأَتَصَدَّقُ بِثُلُثَيْ مَالِي؟ قَالَ: «لَا»، قُلْتُ: فَالشَّطْرُ؟ قَالَ: «لَا»، قُلْتُ: فَالثُّلُثُ؟ قَالَ: «الثُّلُثُ، وَالثُّلُثُ كَثِيرٌ إِنَّكَ أَنْ تَتْرُكَ وَرَثَتَكَ أَغْنِيَاءَ، خَيْرٌ مِنْ أَنْ تَتْرُكَهُمْ عَالَةً يَتَكَفَّفُونَ النَّاسَ».

عامیری کوڕی سەعد لە باوکیەوە رضي الله عنه دەگێڕێتەوە، گوتوویەتی: لە ساڵی فەتحی مەککەدا نەخۆش کەوتم بە جۆرێک هەستم کرد مردنم نزیک بۆتەوە، جا پێغەمبەری خوا ﷺ سەردانی کردم، گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ من ماڵ و سامانێکی زۆرم هەیە و تەنها یەک کچیشم هەیە میراتم لێ بگرێت، ئایا دوو لەسەر سێی ماڵەکەم بکەم بە خێر؟ فەرمووی: «نەخێر»، گوتم: مادام نیوەکەی، فەرمووی: «نەخێر»، گوتم: دەی مادام یەک لەسەر سێی (سێیەک)، فەرمووی: «سێیەک باشە، سێیەکیش زۆرە، چونکە ئەگەر میراتگرەکانت بەدەوڵەمەندی بەجێ بێڵیت باشترە لەوەی کە بەهەژاری جێیان

بێڵیت و دەست لەبەر خەڵکی پان بکەنەوە (سواڵ بکەن)».

## بَابُ لَا وَصِيَّةَ لِوَارِثٍ

باسی وەسییەتکردن بۆ میراتگر دروست نییە

٥٢٩. عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﵁ قَالَ: إِنِّي لَتَحْتَ نَاقَةِ رَسُولِ اللَّه ﷺ يَسِيلُ عَلَيَّ لُعَابُها فَسَمِعْتُه يَقُولُ: «إِنَّ اللَّه قَدْ أَعْطَى كُلَّ ذِي حَقٍّ حَقَّه، أَلَا لَا وَصِيَّةَ لِوَارِثٍ».

ئەنەسی کوڕی مالیک ﵁ دەڵێت: من لە خوارەوەی وشترەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ بووم و لیکەکەی بەسەر مندا دەڕژا، گوێم لێبوو (پێغەمبەر ﷺ) دەیفەرموو: «بێگومان خوا مافی هەموو خاوەن مافێکی داوە، ئاگادار بن وەسییەتکردن بۆ میراتگر دروست نییە».



## بَابُ مَنْ مَاتَ وَلَمْ يُوصِ هلْ يُتَصَدَّقُ عَنْه

باسی کەسێک کە مردبێ و وەسییەتی نەکردبێت ئایا خێر و چاکەی بۆ دەکرێت؟

٥٣٠. عَنْ أَبِي هرَيْرَةَ ﵁: أَنَّ رَجُلًا سَأَلَ رَسُولَ اللَّه ﷺ فَقَالَ: إِنَّ أَبِي قَدْ مَاتَ وَتَرَكَ مَالًا وَلَمْ يُوصِ، فَهلْ يُكَفِّرُ عَنْه أَنْ تَصَدَّقْتُ عَنْه؟ قَالَ: «نَعَمْ».

ئەبو هورەیرە ﵁ دەگێڕێتەوە: پیاوێک پرسیاری لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد، گوتی: باوکم مردووە و سامانی لەدوای خۆی جێ هێشتووە و وەسییەتیشی نەکردووە، جا ئایا ئەگەر من خێر و چاکەی بۆ بکەم دەبێتە هۆی سڕینەوەی گوناهەکانی؟ فەرمووی: «بەڵێ».

# كِتَابُ الْفَرَائِضِ

# پەرتووکی زانستی میرات

## بَابُ فَرَائِضِ الصُّلْبِ

### باسی میراتی پشت (باوک و کچ و کوڕ و نەوە)

٥٣١. عَنِ الْهزَيْلِ بْنِ شُرَحْبِيلَ ﵁ قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى أَبِي مُوسَى الْأَشْعَرِيِّ وَسَلْمَانَ بْنِ رَبِيعَةَ الْبَاهِلِيِّ فَسَأَلَهمَا عَنِ ابْنَةٍ، وَابْنَةِ ابْنٍ، وَأُخْتٍ لِأَبٍ وَأُمٍّ، فَقَالَا: لِلابْنَةِ النِّصْفُ، وَمَا بَقِيَ فَلِلْأُخْتِ، وَائْتِ ابْنَ مَسْعُودٍ، فَسَيُتَابِعُنَا، فَأَتَى الرَّجُلُ ابْنَ مَسْعُودٍ فَسَأَلَه، وَأَخْبَرَه بِمَا قَالَا: فَقَالَ عَبْدُ اللَّه: قَدْ ضَلَلْتُ إِذًا وَمَا أَنَا مِنَ الْمُهتَدِينَ، وَلَكِنِّي سَأَقْضِي بِمَا قَضَى بِه رَسُولُ اللَّه ﷺ: لِلابْنَةِ النِّصْفُ، وَلِابْنَةِ الِابْنِ السُّدُسُ، تَكْمِلَةَ الثُّلُثَيْنِ، وَمَا بَقِيَ فَلِلْأُخْتِ.

هوزەیلی کوڕی شورەحبیل ﵁ دەڵێت: پیاوێک هات بۆ لای ئەبو مووسای ئەشعەری و سەلمانی کوڕی ڕەبیعەی باهیلی و پرسیاری لێ کردن دەربارەی میراتی کچێک و کچێکی کوڕ و خوشکێکی لە دایک و باوکی، ئەوانیش گوتیان: کچەکە نیوەی هەیە و ئەوەی مایەوە بۆ خوشکەکەیە، بچۆ بۆ لای ئیبن مەسعوود ئەویش وەکوو ئێمە بڕیار دەدات، ئینجا پیاوەکە هاتە لای ئیبن مەسعوود و پرسیارەکەی

لێ کرد و هەواڵی بڕیاری ئەوانیشی پێ دا، عەبدوڵڵاش گوتی: ئەگەر وەکوو ئەوان بڵێم و بڕیار بدەم کەواتە گومڕا و سەر لێشێواو بم (چونکە ئاگاداری بڕیارەکەی پێغەمبەر ﷺ نین)، بەڵام من بە بڕیاری پێغەمبەری خوا ﷺ بڕیار دەدەم:کچەکە نیوەی دەکەوێت، کچی کوڕەکەش شەشیەکی دەکەوێت، کە بە هەردووکی دەبێتە دوو لەسەر سێ، جا ئەوەی مایەوە بۆ خوشکەکەیە.

## بَابُ فَرَائِضِ الْجَدِّ

## باسی میراتی باپیرە

٥٣٢. عَنْ مَعْقِلِ بْنِ يَسَارٍ الْمُزَنِيِّ ﷺ قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ أُتِيَ بِفَرِيضَةٍ فِيها جَدٌّ، فَأَعْطَاه ثُلُثًا، أَوْ سُدُسًا.

مەعقیلی کوڕی یەساری موزەنی ﷺ دەڵێت: میراتی باپیرەیەکیان هێنا بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ، گوێم لێ بوو کە سێیەک یان شەشیەکی پێ دا.

## بَابُ الْكَلَالَةِ

## باسی کەلالە

٥٣٣. عَنْ مَعْدَانَ بْنِ أَبِي طَلْحَةَ الْيَعْمُرِيِّ ﷺ: أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ ﷺ قَامَ خَطِيبًا يَوْمَ الْجُمُعَةِ -أَوْ خَطَبَهمْ يَوْمَ الْجُمُعَةِ- فَحَمِدَ اللَّه وَأَثْنَى عَلَيْه وَقَالَ: إِنِّي وَاللَّه مَا أَدَعُ بَعْدِي شَيْئًا هوَ أَهمُّ إِلَيَّ مِنْ أَمْرِ الْكَلَالَةِ، وَقَدْ سَأَلْتُ رَسُولَ اللَّه ﷺ فَمَا أَغْلَظَ لِي فِي شَيْءٍ مَا أَغْلَظَ لِي فِيها، حَتَّى طَعَنَ بِإِصْبَعِه فِي جَنْبِي -أَوْ فِي صَدْرِي- ثُمَّ قَالَ: «يَا عُمَرُ، تَكْفِيكَ آيَةُ الصَّيْفِ الَّتِي نَزَلَتْ فِي آخِرِ سُورَةِ النِّسَاءِ».

مەعدانی کوڕی ئەبو تەلحەی یەعموری ﷺ دەگێڕێتەوە: عومەری کوڕی خەتتاب

ﷺ ڕۆژی جومعە وتاری دا -یان وتاری بۆ دان-، جا سوپاس و ستاییشی خوای کرد و گوتی: بێگومان سوێند بە خوا من شتێک لەدوای خۆم بەجێ ناهێڵم کە لە مەسەلەی کەلالە پێم گرینگتر بێت، بێگومان پرسیارم لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد دەربارەی، لە هیچ شتێك ئەوەندە پێداگریی لێ نەکردم وەکوو لەو باسەدا توندگیریی لێ کردم، هەتا وای لێ هات بە پەنجەی نقوڕچی لە کەلەکەم -یان لە سینگم- دا، پاشان فەرمووی: «ئەی عومەر ئەو ئایەتەی کۆتایی سوورەتی (النساء) کە لە هاویندا دابەزی لەو بارەوە بەسە بۆ تۆ».

## بَابُ مِيرَاثِ أَهْلِ الْإِسْلَامِ مِنْ أَهْلِ الشِّرْكِ

## باسی میراتگرتنی موسوڵمانان لە هاوبەشدانەران

٥٣٤. عَنْ أُسَامَةَ بْنِ زَيْدٍ ﷺ أَنَّه قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّه، أَتَنْزِلُ فِي دَارِكَ بِمَكَّةَ؟ قَالَ: «وَهلْ تَرَكَ لَنَا عَقِيلٌ مِنْ رِبَاعٍ أَوْ دُورٍ؟»، وَكَانَ عَقِيلٌ وَرِثَ أَبَا طَالِبٍ هوَ وَطَالِبٌ، وَلَمْ يَرِثْ جَعْفَرٌ وَلَا عَلِيٌّ شَيْئًا، لِأَنَّهمَا كَانَا مُسْلِمَيْنِ، وَكَانَ عَقِيلٌ وَطَالِبٌ كَافِرَيْنِ. فَكَانَ عُمَرُ مِنْ أَجْلِ ذَلِكَ يَقُولُ: لَا يَرِثُ الْمُؤْمِنُ الْكَافِرَ. وَقَالَ أُسَامَةُ: قَالَ رَسُولُ اللَّه ﷺ: «لَا يَرِثُ الْمُسْلِمُ الْكَافِرَ وَلَا الْكَافِرُ الْمُسْلِمَ».

ئوسامەی کوڕی زەید ﷺ دەڵێ گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا، ئایا لە مەککەدا دەچیتە نێو خانووەکەت؟ ئەویش فەرمووی: «ئایا مەگەر عەقیل هیچ شتێکی لە خانووبەرە و زەوی بۆ ئێمە جێ هێشتووە؟»، بۆیە ئاوای فەرموو چونکە عەقیل و تالیب میراتیان لە ئەبو تالیب گرتبوو، بەڵام جەعفەر و عەلی هیچیان وەرنەگرتبوو، چونکە ئەوان موسوڵمان بوون و عەقیل و تالیب کافر بوون، جا عومەر لەبەر ئەوە بوو دەیگوت: بڕوادار میرات لە کافر ناگرێت، ئوسامەش گوتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «موسوڵمان میرات لە کافر ناگرێت، وە کافریش میرات لە موسوڵمان ناگرێت».

## بَابُ مِيرَاثِ الْقَاتِلِ

### باسی میراتی بکوژ

٥٣٥. عَنْ أَبِي هرَيْرَةَ رضي الله عنه عَنْ رَسُولِ اللَّه ﷺ أَنَّه قَالَ: «الْقَاتِلُ لا يَرِثُ».

ئەبو هورەیرە رضي الله عنه لە پێغەمبەری خواوە ﷺ گێڕاویەتەوە کە فەرموویەتی: «بکوژ میرات ناگرێت».

## بَابُ ذَوِي الْأَرْحَامِ

### باسی ئەو خزمە نزیکانەی بەشیان نییە لە میراتدا

٥٣٦. عَنْ أَبِي أُمَامَةَ بْنِ سَهلِ بْنِ حُنَيْفٍ رضي الله عنه: أَنَّ رَجُلاً رَمَى رَجُلاً بِسَهمٍ فَقَتَلَه، وَلَيْسَ لَه وَارِثٌ إِلَّا خَالٌ، فَكَتَبَ فِي ذَلِكَ أَبُو عُبَيْدَةَ بْنُ الْجَرَّاحِ إِلَى عُمَرَ، فَكَتَبَ إِلَيْه عُمَرُ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «اللَّه وَرَسُولُه مَوْلَى مَنْ لا مَوْلَى لَه، وَالْخَالُ وَارِثُ مَنْ لا وَارِثَ لَه».

ئەبو ئومامەی کوڕی سەهلی کوڕی حونەیف رضي الله عنه دەگێڕێتەوە: پیاوێک تیرێکی هاویشتە پیاوێکی دیکە و کوشتی، (کوژراوەکە) هیچ میراتگریشی نەبوو جگە لە خاڵی، ئینجا ئەبو عوبەیدەی کوڕی جەڕڕاح لەو بارەوە نامەیەک دەنووسێت بۆ عومەر، عومەریش بۆی دەنووسێت کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: «خوا و پێغەمبەرەکەی سەرپەرشتیار و پشتیوانی کەسێکن کە سەرپەرشتیاری نەبێت، خاڵیش (برای دایک) میراتگری کەسێکە کە میراتگری نەبێت».

## بَابُ قِسْمَةِ الْمَوَارِيثِ

### باسی دابەشکردنی میرات

٥٣٧. عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ ﵄: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «مَا كَانَ مِنْ مِيرَاثٍ قُسِمَ فِي الْجَاهِلِيَّةِ فَهوَ عَلَى قِسْمَةِ الْجَاهِلِيَّةِ، وَمَا كَانَ مِنْ مِيرَاثٍ أَدْرَكَه الْإِسْلَامُ فَهوَ عَلَى قِسْمَةِ الْإِسْلَامِ».

عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﵄ دەڵێ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «هەر میراتێک لە سەردەمی نەفامیدا دابەش کرابێت، لەسەر هەمان دابەشکردن دەمێنێتەوە، هەر میراتێکیش لە سەردەمی ئیسلامدا بێت، بەگوێرەی بڕیارەکانی ئیسلام دابەش دەکرێت».

## بَابُ إِذَا اسْتَهلَّ الْمَوْلُودُ وَرِثَ

### باسی میراتی منداڵێک کە بەزیندوویی لەدایک ببێت

٥٣٨. عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّه، وَالْمِسْوَرِ بْنِ مَخْرَمَةَ ﵃ قَالَا: قَالَ رَسُولُ اللَّه ﷺ: «لَا يَرِثُ الصَّبِيُّ حَتَّى يَسْتَهلَّ صَارِخًا»، قَالَ: وَاسْتِهلَالُه أَنْ يَبْكِيَ وَيَصِيحَ أَوْ يَعْطِسَ.

جابیری کوڕی عەبدوڵڵا و میسوەری کوڕی مەخرەمە ﵃ دەڵێن: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «منداڵ میرات ناگرێت تاکوو دەنگی لێوە نەیەت و هاوار نەکات (لە کاتی لەدایکبووندا)». ڕاوی گوتی: (استهلال) واتە: بگریەت یان هاوار بکات، یان بپژمێت.

## بَابُ الرَّجُلِ يُسْلِمُ عَلَى يَدَيِ الرَّجُلِ

### باسی ئەوەی پیاو لەسەر دەستی پیاوێک موسوڵمان ببێت

٥٣٩. عَنْ عَبْدِ اللَّه بْنِ مَوْهَبٍ رضي الله عنه قَالَ: سَمِعْتُ تَمِيمًا الدَّارِيَّ يَقُولُ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّه، مَا السُّنَّةُ فِي الرَّجُلِ مِنْ أَهلِ الْكِتَابِ يُسْلِمُ عَلَى يَدَيِ الرَّجُلِ؟ قَالَ: «هوَ أَوْلَى النَّاسِ بِمَحْيَاه وَمَمَاتِه».

عەبدوڵڵای کوڕی مەوهەب رضي الله عنه دەڵێت: گوێم لە تەمیمی داری بوو دەیگوت: گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەگەر پیاوێک (کەسێک) لە ئەهلی کیتاب لەسەر دەستی پیاوێکی دیکە موسوڵمان ببێت، چ هەقێکی بەسەریەوە هەیە؟ فەرمووی: «ئەو کەسە لەپێشترینە بۆ ئەو لە ژیان و مردنیدا».

# كِتَابُ الْجِهادِ

## پەرتووکی جیهاد و تێکۆشان

### بَابُ فَضْلِ الْغَدْوَةِ وَالرَّوْحَةِ فِي سَبِيلِ اللَّهِ ﷻ

#### باسی گەورەیی ساتێک دەرچوون بۆ جیهاد لەپێناو خوا ﷻ لە بەیانی و ئێوارەدا

٥٤٠. عَنْ أَبِي هرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «غَدْوَةٌ أَوْ رَوْحَةٌ فِي سَبِيلِ اللَّهِ خَيْرٌ مِنَ الدُّنْيَا وَمَا فِيها».

ئەبو هورەیرە رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «ساتێک دەرچوون لەپێناو خوا چ لە بەیانی، یان لە ئێوارەدا، لە دونیا و ئەوەشی کە تێیدایە باشترە بۆ ئەو کەسە».

### بَابُ مَنْ جهزَ غَازِيًا

#### باسی کەسێک کە ئامادەباشی بکات بۆ موجاهیدێک

٥٤١. عَنْ زَيْدِ بْنِ خَالِدٍ الْجُهنِيِّ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ جهزَ غَازِيًا فِي

سَبِيلِ اللَّهِ، كَانَ لَه مِثْلُ أَجْرِه مِنْ غَيْرِ أَنْ يَنْقُصَ مِنْ أَجْرِ الْغَازِي شَيْئًا».

زەیدی کوڕی خالیدی جوهەنی ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «هەر کەسێک پێداویستیی موجاهیدێکی جەنگاوەر لەپێناو خوادا ئامادە بکات، وەکوو ئەو موجاهیدە پاداشتی هەیە بێ ئەوەی هیچ لە پاداشتی موجاهیدەکە کەم ببێتەوە».

## بَابُ فَضْلِ النَّفَقَةِ فِي سَبِيلِ اللَّه تَعَالَى

### باسی گەورەیی بەخشین لەپێناو خوای بەرزدا

٥٤٢. عَنْ ثَوْبَانَ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه ﷺ: «أَفْضَلُ دِينَارٍ يُنْفِقُه الرَّجُلُ دِينَارٌ يُنْفِقُه عَلَى عِيَالِه، وَدِينَارٌ يُنْفِقُه عَلَى فَرَسٍ فِي سَبِيلِ اللَّه، وَدِينَارٌ يُنْفِقُه الرَّجُلُ عَلَى أَصْحَابِه فِي سَبِيلِ اللَّه».

سەوبان ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «باشترین دینارێک کە پیاو خەرجی بکات ئەو دینارەیە کە بۆ ماڵ و منداڵی خۆی خەرجی دەکات، ئەو دینارەیە کە بۆ ئەسپێک خەرجی دەکات لەپێناو خوادا، ئەو دینارەیش کە پیاو بۆ هاوڕێکانی لەپێناو خوادا خەرجی دەکات».

## بَابُ مَنْ حَبَسَه الْعُذْرُ عَنِ الْجِهَادِ

### باسی ئەو کەسەی بە پاساوی شەرعی ناتوانێت بچێت بۆ جیهاد

٥٤٣. عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﵁ قَالَ: لَمَّا رَجَعَ رَسُولُ اللَّه ﷺ مِنْ غَزْوَةِ تَبُوكَ فَدَنَا مِنَ الْمَدِينَةِ قَالَ: «إِنَّ بِالْمَدِينَةِ لَقَوْمًا مَا سِرْتُمْ مِنْ مَسِيرٍ، وَلَا قَطَعْتُمْ وَادِيًا، إِلَّا كَانُوا مَعَكُمْ فِيه»، قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّه وَهمْ بِالْمَدِينَةِ؟ قَالَ: «وَهمْ بِالْمَدِينَةِ حَبَسَهمُ الْعُذْرُ».

ئەنەسی کوڕی مالیک ﵁ دەڵێت: کاتێک پێغەمبەری خوا ﷺ لە غەزای تەبووک گەڕایەوە و لە مەدینە نزیک بووەوە فەرمووی: «بێگومان لەنێو مەدینەدا کەسانێک هەن هەر ڕێگایەکتان بڕیوە و هەر شیو و دۆڵێکتان بڕیوە، مسۆگەر ئەوانیش لەگەڵ ئێوە بوون»، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ئەوان لە مەدینەن؟ فەرمووی: «ئەوان لە مەدینەن، بەڵام پاساوی شەرعی ڕێگەی لێ گرتوون (کە لەگەڵ ئێمە بێن، واتە: لە پاداشت لەگەڵتانن)».

## بَابُ الْخُرُوجِ فِي النَّفِيرِ

### باسی دەرچوون بۆ جەنگ و جیهاد

٥٤٤. عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «إِذَا اسْتُنْفِرْتُمْ فَانْفِرُوا».

ئیبن عەبباس ﵄ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: «ئەگەر داواتان لێ کرا کە بۆ جیهاد دەربچن، بڕۆن».

٥٤٥. عَنْ أَبِي هرَيْرَةَ ﵁: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «لَا يَجْتَمِعُ غُبَارٌ فِي سَبِيلِ اللَّهِ، وَدُخَانُ جَهَنَّمَ فِي جَوْفِ عَبْدٍ مُسْلِمٍ».

ئەبو هورەیرە ﵁ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: «تەپوتۆز و خۆڵی ڕێگای جیهاد لەپێناوی خوادا لەگەڵ دووکەڵی ئاگری دۆزەخ بەیەکەوە لەنێو ناخ و دەروونی بەندەیەکی موسوڵماندا کۆ نابنەوە».

## بَابُ الرَّجُلِ يَغْزُو وَلَه أَبَوَانِ

### باسی ئەو پیاوەی دەچێت بۆ جیهاد و دایک و باوکی لە ژیان ماون

٥٤٦. عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو ﵄ قَالَ: أَتَى رَجُلٌ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ: يَا رَسُولَ

اللَّه، إِنِّي جِئْتُ أُرِيدُ الْجِهادَ مَعَكَ، أَبْتَغِي وَجْه اللَّه وَالدَّارَ الْآخِرَةَ، وَلَقَدْ أَتَيْتُ وَإِنَّ وَالِدَيَّ لَيَبْكِيَانِ، قَالَ: «فَارْجِعْ إِلَيْهِمَا، فَأَضْحِكْهمَا كَمَا أَبْكَيْتَهمَا».

عەبدوڵڵای کوڕی عەمر ﵄ دەڵێت: پیاوێک هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ، گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ هاتووم لەگەڵ تۆدا بێم بۆ جیهاد لەپێناوی خوا و بەدەستهێنانی دوارِۆژ، لە کاتێکدا کە هاتووم دایک و باوکم دەگریان، فەرمووی: «بگەڕێوە بۆ لایان و پێکەنینیان بۆ بگێڕەوە، هەر وەک چۆن گریاندووتن».

## بَابُ النِّيَّةِ فِي الْقِتَالِ

### باسی نییەت لە جەنگ و جیهاددا

٥٤٧. عَنْ أَبِي مُوسَى ﵁ قَالَ: سُئِلَ النَّبِيُّ ﷺ عَنِ الرَّجُلِ يُقَاتِلُ شَجَاعَةً، وَيُقَاتِلُ حَمِيَّةً، وَيُقَاتِلُ رِيَاءً، فَقَالَ رَسُولُ اللَّه ﷺ: «مَنْ قَاتَلَ لِتَكُونَ كَلِمَةُ اللَّه هيَ الْعُلْيَا، فَهوَ فِي سَبِيلِ اللَّه».



ئەبو مووسا ﵁ دەڵێت: پرسیار کرا لە پێغەمبەر ﷺ دەربارەی پیاوێک کە بۆ ئەوەی پێی بگوترێت ئازایە شەڕ دەکات، وە کەسێک لەبەر دەمارگیریی خزمایەتی شەڕ دەکات و کەسێک بەڕووپامایی (ڕیا) شەڕ دەکات، ئینجا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: «هەر کەسێک بۆ ئەوە بجەنگێت کە بەرنامەی خوا سەر بکەوێت، ئەو (جەنگان)ە لەپێناو خوایە».

## بَابُ الْقِتَالِ فِي سَبِيلِ اللَّه سُبْحَانَه وَتَعَالَى

### باسی جەنگکردن لەپێناوی خوای پاک و بێگەرد و بەرز

٥٤٨. عَنْ مُعَاذِ بْنِ جَبَلٍ ﵁: أَنَّه سَمِعَ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ: «مَنْ قَاتَلَ فِي سَبِيلِ اللَّه ﷻ

مِنْ رَجُلٍ مُسْلِمٍ فُوَاقَ نَاقَةٍ، وَجَبَتْ لَه الْجَنَّةُ».

موعازی کوڕی جەبەل ﷺ دەگێڕێتەوە: گوێی لە پێغەمبەر ﷺ بوو دەیفەرموو: «هەر موسوڵمانێک بەئەندازەی دۆشینی وشترێک لەپێناوی خوا بجەنگێت، بەهەشتی بۆ پێویست دەبێت».

٥٤٩. عَنْ عَبْدَ اللَّه بْنَ أَبِي أَوْفَى ﷺ يَقُولُ: دَعَا رَسُولُ اللَّه ﷺ عَلَى الْأَحْزَابِ فَقَالَ: «اللَّهمَّ مُنْزِلَ الْكِتَابِ، سَرِيعَ الْحِسَابِ، اهزِمِ الْأَحْزَابَ، اللَّهمَّ اهزِمْهمْ وَزَلْزِلْهمْ».

عەبدوڵلای کوڕی ئەبو ئەوفا ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دوعای کرد لە کۆمەڵی بێبڕوایان و فەرمووی: «خودایە ئەی ئەو زاتەی دابەزێنەری قورئانیت و حیساب و لێپێچینەوەت دەستبەجێیە، تێکشکێنەری چین و کۆمەڵەکان، خودایە تێکیان بشکێنە و لەرزە و ترس بخە نێویان».

## بَابُ فَضْلِ الشَّهادَةِ فِي سَبِيلِ اللَّه

### باسی گەورەیی شەهیدبوون لەپێناوی خوادا

٥٥٠. عَنِ الْمِقْدَامِ بْنِ مَعْدِيكَرِبَ ﷺ عَنْ رَسُولِ اللَّه ﷺ قَالَ: «لِلشَّهيدِ عِنْدَ اللَّه سِتُّ خِصَالٍ: يَغْفِرُ لَه فِي أَوَّلِ دُفْعَةٍ مِنْ دَمِه، وَيُرَى مَقْعَدَه مِنَ الْجَنَّةِ، وَيُجَارُ مِنْ عَذَابِ الْقَبْرِ، وَيَأْمَنُ مِنَ الْفَزَعِ الْأَكْبَرِ، وَيُحَلَّى حُلَّةَ الْإِيمَانِ، وَيُزَوَّجُ مِنَ الْحُورِ الْعِينِ، وَيُشَفَّعُ فِي سَبْعِينَ إِنْسَانًا مِنْ أَقَارِبِه».

میقدامی کوڕی مەعدیکەریب ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «شەهید شەش تایبەتمەندی لەلای خوا هەیە: لەگەڵ یەکەم دڵۆپی خوێنی کە لێی دەڕژێت خوا لێی خۆش دەبێت، وە شوێنی خۆی لە بەهەشتدا پیشان دەدرێت، وە لە سزای گۆڕ دەپارێزرێت، وە لە ترس و لەرزی گەورەیی ڕۆژی قیامەت دەپارێزرێت، وە دەڕازێنرێتەوە بە نیشانە ڕازاوەکانی ئیمان، وە حۆری بەهەشتی لێ مارە دەکرێت،

وە تکا و شەفاعەت بۆ حەفتا کەس لە خزمەکانی پێ دەدرێت».

٥٥١. عَنْ أَبِي هرَيْرَةَ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه ﷺ: «مَا يَجِدُ الشَّهِيدُ مَسَّ الْقَتْلِ، إِلَّا كَمَا يَجِدُ أَحَدُكُمْ مِنَ الْقَرْصَةِ».

ئەبو هورەیرە ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «کاتێک کەسێک شەهید دەبێت ئازاری کوشتنەکەی تەنها ئەوەندەیە کە یەکێک لە ئێوە مێروولەیەک بیگەزێت».

## بَابُ السِّلَاحِ

### باسی چەک

٥٥٢. عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﵁: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ دَخَلَ مَكَّةَ يَوْمَ الْفَتْحِ وَعَلَى رَأْسِهِ الْمِغْفَرُ.

ئەنەسی کوڕی مالیک ﵁ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ هاتە نێو شاری مەککە لە ڕۆژی ڕزگارکردنی مەککەدا کڵاوێکی زرێی لەسەر بوو.

## بَابُ الرَّمْيِ فِي سَبِيلِ اللَّه

### باسی تیرهاویشتن لە ڕێگەی خوادا

٥٥٣. عَنْ عَمْرِو بْنِ عَبَسَةَ ﵁ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّه ﷺ يَقُولُ: «مَنْ رَمَى الْعَدُوَّ بِسَهمٍ، فَبَلَغَ سَهمُه الْعَدُوَّ، أَصَابَ أَوْ أَخْطَأَ، فَعَدْلُ رَقَبَةٍ».

عەمری کوڕی عەبەسە ﵁ دەڵێت: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو، دەیفەرموو: «هەر کەسێک تیرێک بگرێتە دوژمن و بگاتە دوژمنەکەی، بیپێکێت، یان نەیپێکێت، وەکوو ئەوە وایە کۆیلەیەکی ئازاد کردبێت».

٥٥٤. عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ الْجُهَنِيِّ ﷺ يَقُولُ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّه ﷺ يَقْرَأُ عَلَى الْمِنْبَرِ: {وَأَعِدُّوا لَهُمْ مَا اسْتَطَعْتُمْ مِنْ قُوَّةٍ} الأنفال: ٦٠، «أَلَا وَإِنَّ الْقُوَّةَ الرَّمْيُ»، ثَلَاثَ مَرَّاتٍ.

عوقبەی کوڕی عامیری جوهەنی ﷺ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو، لەسەر مینبەر ئەو ئایەتەی دەخوێندەوە: «{وَأَعِدُّوا لَهُمْ مَا اسْتَطَعْتُمْ مِنْ قُوَّةٍ}، واتە: (ئەی ئیماندارن) ئامادەی بکەن بۆیان ئەوەی لە تواناتاندا هەیە لە هێز». ئینجا سێ جار (فەرمووی:) «ئاگادار بن هێز کە لە ئایەتەکەدا هاتووە، مەبەستی پێ لە تیرهاوێژییە».

## بَابُ لُبْسِ الْعَمَائِمِ فِي الْحَرْبِ

### باسی لەسەرنانی مێزەر لە جەنگدا

٥٥٥. عَنْ جَعْفَرِ بْنِ عَمْرِو بْنِ حُرَيْثٍ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ قَالَ: كَأَنِّي أَنْظُرُ إِلَى رَسُولِ اللَّه ﷺ: وَعَلَيْه عِمَامَةٌ سَوْدَاءُ، قَدْ أَرْخَى طَرَفَيْها بَيْنَ كَتِفَيْه.

جەعفەری کوڕی عەمری کوڕی حورەیس لە باوکیەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، گوتوویەتی: وەکوو ئێستا پێغەمبەری خوا ﷺ لەبەر چاوم بێت و تەماشای بکەم، مێزەرێکی ڕەشی لەسەر بوو کە لکەکانی بە نێوان شانەکانیدا بەردەدایەوە.

## بَابُ تَشْيِيعِ الْغُزَاةِ وَوَدَاعِهِمْ

### باسی ئامادەسازیکردن بۆ موجاهیدان و بەڕێکردنیان

٥٥٦. عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّه ﷺ إِذَا أَشْخَصَ السَّرَايَا يَقُولُ لِلشَّاخِصِ: «أَسْتَوْدِعُ اللَّه دِينَكَ وَأَمَانَتَكَ وَخَوَاتِيمَ عَمَلِكَ».

ئیبن عومەر ﵄ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێک سوپاکانی بەڕێ دەکرد، بە ئەوانەی کە دەچوون لەگەڵ سوپاکە پێی دەفەرموون: «دین و ئەمانەت و کۆتایی کردەوەت بە خوا دەسپێرم».

## بَابُ الِاسْتِعَانَةِ بِالْمُشْرِكِينَ

### باسی داوای هاوکاریکردن لە هاوبەشدانەران

٥٥٧. عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّا لَا نَسْتَعِينُ بِمُشْرِكٍ».

عائیشە ﵂ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «ئێمە داوای یارمەتی لە کەسی هاوبەشدانەر ناکەین».

## بَابُ الْخَدِيعَةِ فِي الْحَرْبِ

### باسی فێڵ و پیلان لە جەنگدا

٥٥٨. عَنْ عَائِشَةَ ﵂: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «الْحَرْبُ خَدْعَةٌ».

عائیشە ﵂ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: «جەنگ بریتییە لە فێڵ و پیلانی جەنگی».

## بَابُ الْمُبَارَزَةِ وَالسَّلَبِ

### باسی جەنگاوەری و بەرخۆدان و حوکمی کەلوپەلی کوژراو بۆ موجاهید

٥٥٩. عَنْ أَبِي قَتَادَةَ ﵁: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ نَفَّلَه سَلَبَ قَتِيلٍ قَتَلَه يَوْمَ حُنَيْنٍ.

ئەبو قەتادە ﵁ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ کەلوپەلی ئەو کوژراوەی پێ داوە

که له غەزای حونەین کوشتوویەتی.

## بَابُ الْغَارَةِ، وَالْبَيَاتِ، وَقَتْلِ النِّسَاءِ، وَالصِّبْيَانِ

### باسی هێرشکردن به شەو له جەنگدا و کوژرانی ژن و منداڵ

٥٦٠. عَنِ ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ رَأَى امْرَأَةً مَقْتُولَةً فِي بَعْضِ الطَّرِيقِ: فَنَهَى عَنْ قَتْلِ النِّسَاءِ، وَالصِّبْيَانِ.

ئیبن عومەر رضي الله عنهما دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ بینیی کە ژنێک لەسەر ڕێگایەکدا کوژراوە، بۆیە ڕێگریی کرد لە کوشتنی ژن و منداڵ (له جەنگدا، مادام جەنگاوەر نەبن).

## بَابُ الْغُلُولِ

### باسی خیانەتکردن له دەستکەوتی جەنگی

٥٦١. عَنْ عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ رضي الله عنه قَالَ: صَلَّى بِنَا رَسُولُ اللَّه ﷺ يَوْمَ حُنَيْنٍ، إِلَى جَنْبِ بَعِيرٍ مِنَ الْمَقَاسِمِ، ثُمَّ تَنَاوَلَ شَيْئًا مِنَ الْبَعِيرِ، فَأَخَذَ مِنْه قَرَدَةً، يَعْنِي وَبَرَةً، فَجَعَلَ بَيْنَ إِصْبَعَيْه، ثُمَّ قَالَ: «يَا أَيُّها النَّاسُ إِنَّ هذَا مِنْ غَنَائِمِكُمْ، أَدُّوا الْخَيْطَ، وَالْمِخْيَطَ، فَمَا فَوْقَ ذَلِكَ، وَمَا دُونَ ذَلِكَ، فَإِنَّ الْغُلُولَ عَارٌ، عَلَى أَهلِه يَوْمَ الْقِيَامَةِ، وَشَنَارٌ وَنَارٌ».

عوبادەی کوڕی صامیت رضي الله عنه دەڵێت: له غەزای حونەین پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی بۆ کردین له تەنیشت یان لەلای وشترێکی غەنیمەت، پاشان هەندێك تووکی له وشترەکە کردەوە و هێنای و لەنێو پەنجەکانی دانا و پاشان فەرمووی: «ئەی خەڵکینە ئا ئەوە بەشێکە له غەنیمەتەکەتان، داو و دەرزیش و کەمتر یان زیاتریش له داو و دەرزی لەگەڵ غەنیمەت بخەنەوە، چونکە خیانەتکردن له غەنیمەت عەیبە و نەنگییە

بۆ خاوەنەکەی و لە ڕۆژی دواییدا هۆی سزادان و ئاگرە».

## بَابُ قِسْمَةِ الْغَنَائِمِ

### باسی چۆنیەتی دابەشکردنی غەنیمەت

٥٦٢. عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﭭ: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ أَسْهمَ يَوْمَ خَيْبَرَ لِلْفَارِسِ ثَلَاثَةَ أَسْهمٍ: لِلْفَرَسِ سَهمَانِ، وَلِلرَّجُلِ سَهمٌ.

ئیبن عومەر ﭭ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ غەنیمەتی دابەش کرد لە غەزای خەیبەر، بۆ سوار سێ بەشی پێ دەدا، بۆ ئەسپ دوو بەش، بۆ پیاو بەشێک.

## بَابُ الْعَبِيدِ وَالنِّسَاءِ يَشْهدُونَ مَعَ الْمُسْلِمِينَ

### باسی کۆیلە و ئافرەت کە بەشداری دەکەن لەگەڵ موسوڵمانان

٥٦٣. عَنْ أُمِّ عَطِيَّةَ الْأَنْصَارِيَّةِ ﭬ قَالَتْ: غَزَوْتُ مَعَ رَسُولِ اللَّه ﷺ سَبْعَ غَزَوَاتٍ، أَخْلُفُهمْ فِي رِحَالِهمْ، وَأَصْنَعُ لَهمُ الطَّعَامَ، وَأُدَاوِي الْجَرْحَى، وَأَقُومُ عَلَى الْمَرْضَى.

ئوم عەتیەی ئەنصاڕی ﭬ دەڵێت: لە حەوت غەزا لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ ئامادەی غەزا بووم، لەلای بارگە و بنەکەیان دەمامەوە و خواردنم بۆ دروست دەکردن و بریندارەکانم تیمار دەکردن و ئاگام لە نەخۆشەکان دەبوو.

## بَابُ وَصِيَّةِ الْإِمَامِ

### باسی وەسییەت و ڕاسپاردەکانی پێشەوا

٥٦٤. عَنِ ابْنِ بُرَيْدَةَ، عَنْ أَبِيه ﭬ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّه ﷺ، إِذَا أَمَّرَ رَجُلًا عَلَى

سَرِيَّةٍ، أَوْصَاه فِي خَاصَّةِ نَفْسِه، بِتَقْوَى اللَّه، وَمَنْ مَعَه مِنَ الْمُسْلِمِينَ خَيْرًا، فَقَالَ: «اغْزُوا بِاسْمِ اللَّه، وَفِي سَبِيلِ اللَّه، قَاتِلُوا مَنْ كَفَرَ بِاللَّه، اغْزُوا وَلَا تَغْدِرُوا، وَلَا تَغُلُّوا، وَلَا تَمْثُلُوا، وَلَا تَقْتُلُوا وَلِيدًا، وَإِذَا أَنْتَ لَقِيتَ عَدُوَّكَ مِنَ الْمُشْرِكِينَ، فَادْعُهمْ إِلَى إِحْدَى ثَلَاثِ خِلَالٍ: أَوْ خِصَالٍ، فَأَيَّتُهنَّ أَجَابُوكَ إِلَيْها، فَاقْبَلْ مِنْهمْ، وَكُفَّ عَنْهمْ، ادْعُهمْ إِلَى الْإِسْلَامِ، فَإِنْ أَجَابُوكَ، فَاقْبَلْ مِنْهمْ، وَكُفَّ عَنْهمْ، ثُمَّ ادْعُهمْ إِلَى التَّحَوُّلِ، مِنْ دَارِهمْ إِلَى دَارِ الْمُهاجِرِينَ، وَأَخْبِرْهمْ أَنَّهمْ إِنْ فَعَلُوا ذَلِكَ، أَنَّ لَهمْ مَا لِلْمُهاجِرِينَ، وَأَنَّ عَلَيْهمْ مَا عَلَى الْمُهاجِرِينَ، وَإِنْ أَبَوْا، فَأَخْبِرْهمْ أَنَّهمْ يَكُونُونَ كَأَعْرَابِ الْمُسْلِمِينَ، يَجْرِي عَلَيْهمْ حُكْمُ اللَّه، الَّذِي يَجْرِي عَلَى الْمُؤْمِنِينَ، وَلَا يَكُونُ لَهمْ فِي الْفَيْءِ، وَالْغَنِيمَةِ شَيْءٌ، إِلَّا أَنْ يُجَاهدُوا مَعَ الْمُسْلِمِينَ، فَإِنْ هم أَبَوْا، أَنْ يَدْخُلُوا فِي الْإِسْلَامِ، فَسَلْهمْ إِعْطَاءَ الْجِزْيَةِ، فَإِنْ فَعَلُوا، فَاقْبَلْ مِنْهمْ وَكُفَّ عَنْهمْ، فَإِنْ هم أَبَوْا، فَاسْتَعِنْ بِاللَّه عَلَيْهمْ، وَقَاتِلْهمْ، وَإِنْ حَاصَرْتَ حِصْنًا، فَأَرَادُوكَ أَنْ تَجْعَلَ لَهمْ ذِمَّةَ اللَّه، وَذِمَّةَ نَبِيِّكَ، فَلَا تَجْعَلْ لَهمْ ذِمَّةَ اللَّه، وَلَا ذِمَّةَ نَبِيِّكَ، وَلَكِنِ اجْعَلْ لَهمْ ذِمَّتَكَ، وَذِمَّةَ أَبِيكَ، وَذِمَّةَ أَصْحَابِكَ، فَإِنَّكُمْ إِنْ تُخْفِرُوا ذِمَّتَكُمْ، وَذِمَّةَ آبَائِكُمْ، أَهوَنُ عَلَيْكُمْ مِنْ أَنْ تُخْفِرُوا ذِمَّةَ اللَّه، وَذِمَّةَ رَسُوله، وَإِنْ حَاصَرْتَ حِصْنًا، فَأَرَادُوكَ أَنْ يَنْزِلُوا عَلَى حُكْمِ اللَّه، فَلَا تُنْزِلْهمْ عَلَى حُكْمِ اللَّه، وَلَكِنْ أَنْزِلْهمْ عَلَى حُكْمِكَ، فَإِنَّكَ لَا تَدْرِي أَتُصِيبُ فِيهمْ حُكْمَ اللَّه أَمْ لَا». قَالَ عَلْقَمَةُ: فَحَدَّثْتُ بِه مُقَاتِلَ بْنَ حَيَّانَ، فَقَالَ: حَدَّثَنِي مُسْلِمُ بْنُ هيْصَمٍ، عَنِ النُّعْمَانِ بْنِ مُقَرِّنٍ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ مِثْلَ ذَلِكَ.

ئیبن بورەیدە لە باوکیەوە ﵁ دەگێڕێتەوە، گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ ئەگەر کەسێکی بکردبایە فەرماندە بەسەر سوپایەکەوە، وەسییەتی بۆ دەکرد کە خودی خۆی پارێزکار بێت و لەگەڵ موسوڵمانان‌دا باش بێت، ئینجا دەیفەرموو: «بە ناوی خوا و لەپێناوی خوادا بجەنگن و غەزا بکەن، بجەنگن لەگەڵ ئەوانەی کە بێبڕوان، غەزا بکەن و پەیمان مەشکێنن و خیانەت مەکەن لە غەنیمەت و جەستەی کوژراوان مەشێوێنن و منداڵ مەکوژن، وە هەرکات بە دوژمنەکەت گەیشتیت لە

هاوبەشدانەرەکان، سێ خاڵیان بخە بەردەم یەکیان هەڵبژێرن، جا کامیان هەڵبژارد وازیان لێ بێنە و لێیان وەربگرە: بانگیان بکە بۆ ئیسلام، جا ئەگەر وەڵامیان دایەوە، لێیان وەربگرە و وازیان لێ بهێنە، پاشان داوایان لێ بکە کە بێنە وڵاتی کۆچەران و وڵاتی خۆیان بەجێ بهێڵن، هەواڵیشیان پێ بدە ئەگەر ئەوە بکەن، هەرچی بۆ کۆچەران هەیە بۆ ئەوانیش هەیە و هەرچی لەسەر کۆچەرانیشە لەسەر ئەوانیش دەبێت، خۆ ئەگەر ئەوەیان قبووڵ نەکرد، پێیان بڵێ کە ئەوانیش وەکوو موسوڵمانە دەشتەکییەکانن هەمان ئەو بڕیارەی خوایان بەسەردا جێبەجێ دەکرێت کە بەسەر بڕواداراندا جێبەجێ دەکرێت، لە دەستکەوتی جەنگیش هیچ بەشێکیان نابێ مەگەر بێن و لەگەڵ موجاهیدە موسوڵمانەکان بچنە جەنگ، جا ئەگەر ئیسلامیان وەرنەگرت داوای سەرانەیان لێ بکە، جا ئەگەر کردیان لێیان وەرگرە و وازیان لێ بێنە، جا ئەگەر نەیانکرد، پشت بە خوا ببەستە و داوای یارمەتی لێ بکە و لەگەڵیاندا بجەنگە، جا ئەگەر قەڵایەکت گەمارۆ دا و داوایان لێ کردی کە بیانخەیە ژێر پەیمانی خوا و پێغەمبەرەکەت، مەیانخە ژێر پەیمانی خوا و پێغەمبەرەکەت، بەڵکوو بیانخە ژێر پەیمانی خۆت و باوانت و هاوەڵەکانت، چونکە ئێوە ئەگەر پەیمانی خۆتان بشکێنن لەسەرتان ئاسانتر و سووکترە لەوەی کە پەیمانی خوا و پێغەمبەرەکەی بشکێنن، وە ئەگەر قەڵایەکیشت گەمارۆ دا و داوایان لێ کردی کە خۆیان تەسلیم دەکەن لەسەر بڕیاری خوا، ئەوا لەسەر بڕیاری خوا تەسلیمبوونەکەیان وەرمەگرە، بەڵکوو لەسەر حوکم و بڕیاردانی خۆت تەسلیمبوونەکەیان وەربگرە، چونکە تۆ نازانیت کە ئەو بڕیارەی دەریدەکەیت ئاخۆ پێکاوتە و وەکوو بڕیاری خوایە دەربارەیان یان نا». عەلقەمە گوتی: (ئەو فەرموودەیەم) بۆ موقاتیلی کوڕی حەییان گێڕایەوە، ئەویش گوتی: موسلیمی کوڕی هەیصەم لە نوعمانی کوڕی موقەررینەوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ بە هەمان شێوەی ئەو فەرموودەیە بۆی گێڕاوەمەوە.

## بَابُ طَاعَةِ الْإِمَامِ

### باسی گوێڕایەڵیی پێشەوا (ئیمام)

٥٦٥. عَنْ أَبِي هرَيْرَةَ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ أَطَاعَنِي، فَقَدْ أَطَاعَ اللَّهَ، وَمَنْ عَصَانِي، فَقَدْ عَصَى اللَّهَ، وَمَنْ أَطَاعَ الْإِمَامَ، فَقَدْ أَطَاعَنِي، وَمَنْ عَصَى الْإِمَامَ، فَقَدْ عَصَانِي».

ئەبو هوڕەیرە رضي الله عنه دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «هەر کەسێک گوێڕایەڵیی من بکات، فەرمانبەرداریی خوای کردووە، هەر کەسێکیش سەرپێچیی فەرمانەکانم بکات، سەرپێچیی خوای کردووە، وە هەر کەسێک گوێڕایەڵیی پێشەوایەکەی بکات ئەوا گوێڕایەڵیی منی کردووە، هەر کەسێکیش سەرپێچیی پێشەوایەکەی بکات، ئەوە سەرپێچیی منی کردووە».

٥٦٦. عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «اسْمَعُوا وَأَطِيعُوا، وَإِنِ اسْتُعْمِلَ عَلَيْكُمْ عَبْدٌ حَبَشِيٌّ، كَأَنَّ رَأْسَه زَبِيبَةٌ».

ئەنەسی کوڕی مالیک رضي الله عنه دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «گوێڕایەڵ و فەرمانبەرداریی پێشەواکەتان بکەن، ئەگەر پێشەواکەتان بەندەیەکی حەبەشیش بێت و سەریشی وەکوو مێوژ گچکە و ڕەش بێت».

## بَابُ لَا طَاعَةَ فِي مَعْصِيَةِ اللَّهِ

### باسی گوێڕایەڵی نییە لە سەرپێچیکردنی خوادا

٥٦٧. عَنِ ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «عَلَى الْمَرْءِ الْمُسْلِمِ الطَّاعَةُ، فِيمَا أَحَبَّ أَوْ كَرِهِ، إِلَّا أَنْ يُؤْمَرَ بِمَعْصِيَةٍ، فَإِذَا أُمِرَ بِمَعْصِيَةٍ، فَلَا سَمْعَ وَلَا طَاعَةَ».

ئیبن عومەر ﵄ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «مرۆڤی موسوڵمان لەسەری واجبە کە فەرمانبەردار بێت لە هەر شتێک پێیخۆش بێت، یان پێیناخۆش بێت، مەگەر ئەوە نەبێت کە فەرمانی پێ بکرێت بە تاوانکردن، جا ئەگەر فەرمانی سەرپێچی و تاوانی پێ کرا، ئەوە گوێڕایەڵی و فەرمانبەرداری دروست نییە و نامێنێت».

## بَابُ الْبَيْعَةِ

## باسی پەیمان و بەڵێندان

٥٦٨. عَنْ أَنَس بْنَ مَالِكٍ ﵁ يَقُولُ: بَايَعْنَا رَسُولَ اللَّه ﷺ عَلَى السَّمْعِ وَالطَّاعَةِ فَقَالَ: «فِيمَا اسْتَطَعْتُمْ».

ئەنەسی کوڕی مالیک ﵁ دەڵێت: ئێمە بەیعەتمان بە پێغەمبەری خوا ﷺ دا لەسەر گوێڕایەڵی و فەرمانبەرداری، ئینجا فەرمووی: «بەگوێرەی تواناتان (پێیانەوە پابەند بن)».

٥٦٩. عَنْ أَبِي هرَيْرَةَ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه ﷺ: «ثَلَاثَةٌ لَا يُكَلِّمُهمُ اللَّه، وَلَا يَنْظُرُ إِلَيْهمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، وَلَا يُزَكِّيهمْ، وَلَهمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ: رَجُلٌ عَلَى فَضْلِ مَاءٍ بِالْفَلَاةِ، يَمْنَعُه مِنَ ابْنِ السَّبِيلِ، وَرَجُلٌ بَايَعَ رَجُلًا، بِسِلْعَةٍ بَعْدَ الْعَصْرِ، فَحَلَفَ بِاللَّه، لَأَخَذَها بِكَذَا وَكَذَا، فَصَدَّقَه، وَهوَ عَلَى غَيْرِ ذَلِكَ، وَرَجُلٌ بَايَعَ إِمَامًا، لَا يُبَايِعُه، إِلَّا لِدُنْيَا، فَإِنْ أَعْطَاه مِنْها، وَفَى لَه، وَإِنْ لَمْ يُعْطِه مِنْها، لَمْ يَفِ لَه».

ئەبو هورەیرە ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «سێ کۆمەڵ هەن لە ڕۆژی دواییدا خوا قسەیان لەگەڵدا ناکات و ڕوویان تێ ناکات و لە تاوان پاکیان ناکاتەوە و سزایەکی بەئێشیشیان بۆ هەیە: پیاوێک کە لە بیابانێک خاوەنی ئاوی زیادەیە و ڕێبوارانی لێ بێبەش دەکات، پیاوێک کە شتومەک دوای ئێوارە بە کەسێک دەفرۆشێت و سوێندی لەسەر دەخوات بە ئەوەندە و ئەوەندە کڕیویەتی و ئەویش

بڕوای پێ دەکات و ڕاستیش ناکات، کەسێکیش کە پەیمان بە پێشەوایەک بدات کە تەنها لەبەر بەرژەوەندیی دونیایی پەیمانی پێ دەدات، جا ئەگەر دونیای بۆ مسۆگەر کرد، وەفا بە پەیمانەکە دەکات، خۆ ئەگەر دونیای پێ نەدا، وەفادار نابێت بە پەیمانەکە».

## بَابُ بَيْعَةِ النِّسَاءِ

### باسی بەیعەتدانی ئافرەتان

٥٧٠. عَنْ أُمَيْمَةَ بِنْتِ رُقَيْقَةَ ﵂ تَقُولُ: جِئْتُ النَّبِيَّ ﷺ فِي نِسْوَةٍ نُبَايِعُه، فَقَالَ لَنَا: «فِيمَا اسْتَطَعْتُنَّ وَأَطَقْتُنَّ، إِنِّي لَا أُصَافِحُ النِّسَاءَ».

ئومەیمەی کچی ڕوقەیقە ﵂ دەڵێت: لەگەڵ کۆمەڵێک ئافرەت هاتم بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ بۆ ئەوەی بەیعەتی پێ بدەین، جا فەرمووی: «بەیعەتتان لێ وەردەگرم بەپێی توانا و هێزی خۆتان، وە بێگومان من لەگەڵ ئافرەت (ی بێگانە) دەست ناخەمە نێو دەست (واتە: تەنها بە قسەکردن بەیعەتی لێ وەرگرتوون)».

# كِتَابُ الْمَنَاسِكِ

## پەرتووكى ڕێوڕەسمى حەج

### بَابُ الْخُرُوجِ إِلَى الْحَجِّ

باسی دەرچوون بۆ حەج

٥٧١. عَنْ أَبِي هرَيْرَةَ ﷺ: أَنَّ رَسُولَ اللَّه ﷺ قَالَ: «السَّفَرُ قِطْعَةٌ مِنَ الْعَذَابِ، يَمْنَعُ أَحَدَكُمْ نَوْمَه، وَطَعَامَه، وَشَرَابَه، فَإِذَا قَضَى أَحَدُكُمْ نَهمَتَه مِنْ سَفَرِه، فَلْيُعَجِّلِ الرُّجُوعَ إِلَى أَهلِه».

ئەبو هوڕەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «گەشت بەشێکە لە سزا، چونکە خەو و خواردن و خواردنەوەتان لێ دەبڕێت، جا هەر کاتێک یەکێکتان لە گەشتەکەیدا پێویستیتان تەواو بوو، ئەوە با پەلە بکات لە گەڕانەوە بۆ نێو ماڵ و منداڵەکەی».

### بَابُ فَرْضِ الْحَجِّ

باسی فەڕزبوونی حەج

٥٧٢. عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ: أَنَّ الْأَقْرَعَ بْنَ حَابِسٍ، سَأَلَ النَّبِيَّ ﷺ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّه

الْحَجُّ فِي كُلِّ سَنَةٍ، أَوْ مَرَّةً وَاحِدَةً؟ قَالَ: «بَلْ مَرَّةً وَاحِدَةً، فَمَنْ زَادَ، فَتَطَوَّعٌ».

ئیبن عەبباس ﷺ دەگێڕێتەوە: کە ئەقرەعی کوڕی حابیس پرسیاری لە پێغەمبەر ﷺ کردووە و گوتوویەتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئایا حەج لە هەموو ساڵێکدا فەرزە یان تەنها یەک جارە؟ فەرمووی: «بەڵکوو یەک جار فەرزە و ئەوەشی لە توانایدا هەبوو (زیاتر) ئەوە خۆبەخشی و زیادە خێرە».

## بَابُ فَضْلِ الْحَجِّ وَالْعُمْرَةِ

## باسی گەورەیی حەج و عومرە

٥٧٣. عَنْ عُمَرَ ﷺ: عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «تَابِعُوا بَيْنَ الْحَجِّ وَالْعُمْرَةِ، فَإِنَّ الْمُتَابَعَةَ بَيْنَهُمَا، تَنْفِي الْفَقْرَ وَالذُّنُوبَ، كَمَا يَنْفِي الْكِيرُ، خَبَثَ الْحَدِيدِ».

عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: «حەج و عومرە بەدوای یەکدا بکەن (واتە: ئەگەر حەجتان کرد عومرەش بەدوایدا بکەن و ئەگەر عومرەتان کرد حەجیش بەدواید بکەن)، چونکە حەج و عومرەکردن بەدوای یەکدا هەژاری و تاوان ناهێڵێت هەر وەکوو چۆن کوورە پیسی و چڵکی ئاسن ناهێڵێت».

٥٧٤. عَنْ أَبِي هرَيْرَةَ ﷺ: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «الْعُمْرَةُ إِلَى الْعُمْرَةِ، كَفَّارَةٌ لِمَا بَيْنَهُمَا، وَالْحَجُّ الْمَبْرُورُ، لَيْسَ لَه جَزَاءٌ، إِلَّا الْجَنَّةُ».

ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: «ئەنجامدانی عومرە بۆ عومرەیەکی دیکە دەبێتە هۆی سڕینەوەی گوناهەکانی نێوانیان، حەجی وەرگیراو (لەلایەن خوا) هیچ پاداشتێکی نییە، جگە لە بەهەشت».

## بَابُ الْحَجِّ عَلَى الرَّحْلِ

### باسی حەجکردن بەسواری

٥٧٥. عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رضي الله عنه قَالَ: حَجَّ النَّبِيُّ ﷺ عَلَى رَحْلٍ، رَثٍّ، وَقَطِيفَةٍ تُسَاوِي أَرْبَعَةَ دَرَاهِمَ، أَوْ لَا تُسَاوِي، ثُمَّ قَالَ: «اللَّهُمَّ حَجَّةٌ لَا رِيَاءَ فِيهَا، وَلَا سُمْعَةَ».

ئەنەسی کوڕی مالیک رضي الله عنه دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ بەسەر پشتی وشترێکەوە کە کورتانێکی کۆنی پێوە بوو حەجی کرد، پارچە پۆشاکێکی قەدیفەی لەبەردا بوو کە نرخەکەی دەگەیشتە چوار درهەم، یان نەدەگەیشتە ئەو نرخەش (وەکوو خاکیبوون لە بەرانبەر خوا لە ماڵی خوا)، ئەوجار فەرمووی: «خوایە حەجەکەمان بە جۆرێک بێت و بە جۆرێک لێمان وەربگرە کە ڕیا و ڕووپامایی تێدا نەبێت و بۆ ناووناوبانگ نەبێت».



## بَابُ الْحَجُّ جِهَادُ النِّسَاءِ

### باسی ئەوەی کە حەج جیهادە بۆ ئافرەتان

٥٧٦. عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها قَالَتْ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ عَلَى النِّسَاءِ جِهَادٌ؟ قَالَ: «نَعَمْ، عَلَيْهِنَّ جِهَادٌ، لَا قِتَالَ فِيهِ: الْحَجُّ وَالْعُمْرَةُ».

عائیشە رضي الله عنها دەڵێت: گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئایا ئافرەتان جیهادیان لەسەر واجبە؟ فەرمووی: «بەڵێ، جیهادێکیان لەسەر پێویست کراوە کە شەڕ و کوشتاری تێدا نییە (ئەویش) حەج و عومرەیە».

## بَابُ الْحَجِّ عَنِ الْمَيِّتِ

### باسی حەجکردن لەبری کەسی مردوو

٥٧٧. عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ فَقَالَ: أَحُجُّ عَنْ أَبِي؟ قَالَ:

«نَعَمْ حُجَّ عَنْ أَبِيكَ، فَإِنْ لَمْ تَزِدْهُ خَيْرًا، لَمْ تَزِدْهُ شَرًّا».

ئیبن عەبباس ﵄ دەڵێت: پیاوێک هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ و گوتی: ئایا دەکرێت لەبری باوکم حەج بکەم؟ فەرمووی: «بەڵێ، لەبری باوکت حەج بکە، خۆ ئەگەر چاکەشی بۆ زیاد نەکەی (بە چاکەکانی خۆت) ئەوە خراپەی بۆ زیاد ناکەی (واتە: خێرە بۆی بکە)».

## بَابُ الْحَجِّ عَنِ الْحَيِّ إِذَا لَمْ يَسْتَطِعْ

### باسی حەجکردن لەبری کەسێک لە ژیاندا بێت، بەڵام توانای حەجکردنی نەبێت

٥٧٨. عَنْ أَبِي رَزِينٍ الْعُقَيْلِيِّ ﵁: أَنَّه أَتَى النَّبِيَّ ﷺ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ إِنَّ أَبِي شَيْخٌ كَبِيرٌ، لَا يَسْتَطِيعُ الْحَجَّ، وَلَا الْعُمْرَةَ، وَلَا الظَّعْنَ قَالَ: «حُجَّ عَنْ أَبِيكَ، وَاعْتَمِرْ».

ئەبو ڕەزینی عوقەیلی ﵁ دەگێڕێتەوە: هاتۆتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ و گوتوویەتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ باوکم پیرێکی بەتەمەنە، توانای حەجکردن و عومرەکردن و سواربوونی وڵاخی نییە، فەرمووی: «لەبری باوکت حەج و عومرە بکە».

## بَابُ حَجِّ الصَّبِيِّ

### باسی حەجکردنی منداڵ

٥٧٩. عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّه ﵄ قَالَ: رَفَعَتِ امْرَأَةٌ صَبِيًّا لَها إِلَى النَّبِيِّ ﷺ فِي حَجَّتِه، فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللهِ أَلِهَذَا حَجٌّ؟ قَالَ: «نَعَمْ وَلَكِ أَجْرٌ».

جابیری کوڕی عەبدوڵڵا ﵄ دەڵێت: ئافرەتێک منداڵەکەی بەرز کردەوە بۆ لای پێغەمبەر ﷺ لە حەجدا، گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئایا ئەوە (منداڵەکە) حەجی بۆ دەنووسرێت؟ فەرمووی: «بەڵێ، تۆش لەسەری پاداشت وەردەگریت».

## بَابُ النُّفَسَاءِ وَالْحَائِضِ، تُهِلُّ بِالْحَجِّ

### باسی ئەو ئافرەتانەی تووشی زەیستانی و حەیز دەبن و نییەتی حەج دێنن

٥٨٠. عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: نُفِسَتْ أَسْمَاءُ بِنْتُ عُمَيْسٍ بِالشَّجَرَةِ، فَأَمَرَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَبَا بَكْرٍ أَنْ: «يَأْمُرَها أَنْ تَغْتَسِلَ، وَتُهِلَّ».

عائیشه ﵂ دەڵێت: ئەسمائی کچی عومەیس لەلای دارەکەی (ذو الحليفة) منداڵی بوو، بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی بە ئەبو بەکر کرد کە: «فەرمانی پێ بکات خۆی بشوات و، ئیحرامی حەج ببەستێت».

## بَابُ مَوَاقِيتِ أَهلِ الْآفَاقِ

### باسی شوێنی ئیحرامبەستنی خەڵکی شوێنە جیاوازەکان

٥٨١. عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﵄: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «يُهِلُّ أَهلُ الْمَدِينَةِ مِنْ ذِي الْحُلَيْفَةِ، وَأَهلُ الشَّامِ مِنَ الْجُحْفَةِ وَأَهلُ نَجْدٍ مِنْ قَرْنٍ»، فَقَالَ عَبْدُ اللَّهِ: أَمَّا هذِهِ الثَّلَاثَةُ، فَقَدْ سَمِعْتُها مِنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، وَبَلَغَنِي أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: «وَيُهِلُّ أَهلُ الْيَمَنِ مِنْ يَلَمْلَمَ».

ئیبن عومەر ﵄ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «خەڵکی مەدینە لە (ذو الحليفة)ـدا ئیحرامی حەج دەبەستن، خەڵکی شامیش لە جوحفە و خەڵکی نەجدیش لە قەڕن ئیحرام دەبەستن»، جا عەبدوڵڵا گوتی: ئەو سێ شوێنەم بۆ خۆم لە پێغەمبەری خوا ﷺ گوێم لێ بووە، بەڵام لە پێغەمبەری خواوە ﷺ پێم گەیشتووە و بۆیان گێڕاومەوە کە فەرموویەتی: «خەڵکی یەمەن لە یەلەملەم ئیحرام دەبەستن».

## بَابُ الْإِحْرَامِ

### باسی ئیحرام

٥٨٢. عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: إِنِّي عِنْدَ ثَفِنَاتِ نَاقَةِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، عِنْدَ الشَّجَرَةِ، فَلَمَّا اسْتَوَتْ بِهِ قَائِمَةً، قَالَ: «لَبَّيْكَ بِعُمْرَةٍ وَحِجَّةٍ مَعًا»، وَذَلِكَ فِي حَجَّةِ الْوَدَاعِ.

ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێت: من لەلای ئەژنۆکانی وشتری پێغەمبەری خوا ﷺ بووم لەلای دارەکەی (ذو الحليفة)، جا کاتێک پێغەمبەر ﷺ لەسەر پشتی وشترەکە بوو وشترەکەش هەڵسایەوە و ڕاست بۆوە، (پێغەمبەر ﷺ) فەرمووی: «(لَبَّيْكَ بِعُمْرَةٍ وَحِجَّةٍ مَعًا)، واتە: ئیحرامی عومرە و حەجی بەیەکەوە بەست»، ئەوەش لە حەجیماڵئاوایی بوو.

## بَابُ التَّلْبِيَةِ

### باسی تەلبیەکردن (گوتنی: لَبَّيْكَ اللَّهُمَّ لَبَّيْكَ ...)

٥٨٣. عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ قَالَ: تَلَقَّفْتُ التَّلْبِيَةَ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَهُوَ يَقُولُ: «لَبَّيْكَ اللَّهُمَّ، لَبَّيْكَ لَبَّيْكَ، لَا شَرِيكَ لَكَ لَبَّيْكَ، إِنَّ الْحَمْدَ وَالنِّعْمَةَ لَكَ وَالْمُلْكَ، لَا شَرِيكَ لَكَ»، وَكَانَ ابْنُ عُمَرَ يَزِيدُ فِيهَا: لَبَّيْكَ لَبَّيْكَ لَبَّيْكَ وَسَعْدَيْكَ، وَالْخَيْرُ فِي يَدَيْكَ لَبَّيْكَ، وَالرَّغْبَاءُ إِلَيْكَ وَالْعَمَلُ.

ئیبن عومەر ﷺ دەڵێت: تەلبیە لە پێغەمبەری خوا ﷺ فێر بووم و وەرمگرتووە، کە دەیفەرموو: «لَبَّيْكَ اللَّهُمَّ، لَبَّيْك، لَبَّيْكَ لَا شَرِيكَ لَكَ لَبَّيْك، إِنَّ الْحَمْدَ وَالنِّعْمَةَ لَكَ وَالْمُلْكَ، لَا شَرِيكَ لَكَ»، ڕاوی دەڵێت: ئیبن عومەر ﷺ ئەوەشی لێ زیاد دەکرد: (لَبَّيْكَ لَبَّيْكَ لَبَّيْكَ وَسَعْدَيْكَ، وَالْخَيْرُ فِي يَدَيْكَ لَبَّيْكَ، وَالرَّغْبَاءُ إِلَيْكَ وَالْعَمَلُ).

## بَابُ رَفْعِ الصَّوْتِ بِالتَّلْبِيَةِ

### باسی دەنگبەرزکردنەوە لە کاتی تەلبیەکردن

٥٨٤. عَنْ خَلَّادِ بْنِ السَّائِبِ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «أَتَانِي جِبْرِيلُ، فَأَمَرَنِي أَنْ آمُرَ أَصْحَابِي أَنْ يَرْفَعُوا أَصْوَاتَهُمْ بِالْإِهْلَالِ».

خەلادی کوڕی سائیب لە باوکیەوە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: «جیبریل هاتە لام و فەرمانی پێ کردم کە فەرمان بە هاوەڵانم بکەم، دەنگیان بەرز بکەنەوە لە کاتی گوتنی تەلبیەدا».

٥٨٥. عَنْ أَبِي بَكْرٍ الصِّدِّيقِ ﷺ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ سُئِلَ، أَيُّ الْأَعْمَالِ أَفْضَلُ؟ قَالَ: «الْعَجُّ، وَالثَّجُّ».

ئەبو بەکری صیدیق ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ پرسیاری لێ کرا دەربارەی باشترین کردەوە، فەرمووی: «دەنگبەرزکردنەوە لە کاتی تەلبیەدا و سەربڕینی ئاژەڵ».

## بَابُ مَا يَلْبَسُ الْمُحْرِمُ مِنَ الثِّيَابِ

### باسی چ پۆشاکێک دەپۆشرێت بۆ ئیحرام

٥٨٦. عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ ﷺ: أَنَّ رَجُلًا سَأَلَ النَّبِيَّ ﷺ مَا يَلْبَسُ الْمُحْرِمُ مِنَ الثِّيَابِ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا يَلْبَسُ الْقُمُصَ، وَلَا الْعَمَائِمَ، وَلَا السَّرَاوِيلَاتِ وَلَا الْبَرَانِسَ، وَلَا الْخِفَافَ، إِلَّا أَنْ لَا يَجِدَ نَعْلَيْنِ، فَلْيَلْبَسْ خُفَّيْنِ، وَلْيَقْطَعْهُمَا أَسْفَلَ مِنَ الْكَعْبَيْنِ، وَلَا تَلْبَسُوا مِنَ الثِّيَابِ شَيْئًا مَسَّهُ الزَّعْفَرَانُ، أَوِ الْوَرْسُ».

عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە: پیاوێک پرسیاری لە پێغەمبەر ﷺ کرد، (گوتی:) کەسێک لە ئیحرامدا بێت دەبێت چی لەبەر بکات؟ پێغەمبەری خوا ﷺ

فەرمووی: «نابێت کراس و مێزەر و شەڕواڵ و ئەو پۆشاکانەشی کە کڵاوەکەی بەخۆیەوەیەتی لەبەر بکات، وە نابێت خوفف لەپێ بکات، مەگەر کەسێک کە جووتە نەعلێکی دەست نەکەوێت، ئەوە با دوو خوففەکە لەپێ بکات و تاکوو خوار قولە پێیەکانی بیانبڕێت، وە هەر پۆشاکێک ڕەنگ کرابێت بە زەعفەران، یان وەڕس لەبەری مەکەن».

تێبینی:

زەعفەڕان و وەڕس: دوو ڕووەکی بۆنخۆشن و بۆ ڕەنگکردنی پۆشاکیش سوودیان لێ وەرگیراوە.

## بَابُ الشَّرْطِ فِي الْحَجِّ

### باسی مەرجدانان لە حەجکردندا

٥٨٧. عَنْ ضُبَاعَةَ رضي الله عنها قَالَتْ: دَخَلَ عَلَيَّ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَأَنَا شَاكِيَةٌ، فَقَالَ: «أَمَا تُرِيدِينَ الْحَجَّ، الْعَامَ؟»، قُلْتُ: إِنِّي لَعَلِيلَةٌ، يَا رَسُولَ اللَّهِ قَالَ: «حُجِّي وَقُولِي: مَحِلِّي، حَيْثُ تَحْبِسُنِي».

زوباعە رضي الله عنها دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ تەشریفی هێنا بۆ لام، لەو کاتەدا منیش سکاڵام دەکرد بەدەست نەخۆشییەوە، جا فەرمووی: «ناتەوێت ئەوساڵ حەج بکەی؟»، گوتم: لە ڕاستیدا نەخۆشم ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، فەرمووی: «ئیحرام ببەستە بۆ حەج و بڵێ: لەو شوێنەی پەکم کەوت ئیحرام دەشکێنم».

## بَابُ اسْتِلَامِ الْحَجَرِ

### باسی دەستدان لە بەردە ڕەشەکە

٥٨٨. عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَيَأْتِيَنَّ هذَا الْحَجَرُ، يَوْمَ

الْقِيَامَةِ وَلَه عَيْنَانِ يُبْصِرُ بِهِمَا، وَلِسَانٌ يَنْطِقُ بِه، يَشْهَدُ عَلَى مَنْ يَسْتَلِمُه، بِحَقٍّ».

ئیبن عەبباس ﵄ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «لە ڕۆژی دواییدا ئەو بەردە ڕەشە دێنن، لە کاتێکدا کە دێت دوو چاوی هەیە کە پێیان دەبینێت و زمانیشی هەیە قسەی پێ دەکات، گەواهی و شاهیدی دەدات بۆ هەر کەسێک کە دەستی پێدا هێنابێت بەهەق و ڕاستی».

## بَابُ فَضْلِ الطَّوَافِ

### باسی گەورەیی تەواف

٥٨٩. عَنْ عَبْدِ اللَّه بْنِ عُمَرَ ﵄ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُول اللَّه ﷺ يَقُولُ: «مَنْ طَافَ بِالْبَيْتِ، وَصَلَّى رَكْعَتَيْنِ، كَانَ كَعِتْقِ رَقَبَةٍ».

عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﵄ دەڵێت: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: «هەر کەسێک تەوافی بەیت بکات و دوو ڕکات نوێژ بکات، وەکوو ئەوە وایە بەندەیەکی ئازاد کردبێت».

## بَابُ الْحَائِضِ، تَقْضِي الْمَنَاسِكَ، إِلَّا الطَّوَافَ

### باسی ئافرەتێک کە لە حەیزدا بێت هەموو مەڕاسیمەکان دەکات جگە لە تەواف

٥٩٠. عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: خَرَجْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّه ﷺ، لَا نَرَى إِلَّا الْحَجَّ، فَلَمَّا كُنَّا بِسَرِفَ، أَوْ قَرِيبًا مِنْ سَرِفَ، حِضْتُ فَدَخَلَ عَلَيَّ رَسُولُ اللَّه ﷺ، وَأَنَا أَبْكِي، فَقَالَ: «مَا لَكِ أَنَفِسْتِ؟»، قُلْتُ: نَعَمْ، قَالَ: «إِنَّ هذَا أَمْرٌ كَتَبَه اللَّه، عَلَى بَنَاتِ آدَمَ، فَاقْضِي الْمَنَاسِكَ كُلَّها، غَيْرَ أَنْ لَا تَطُوفِي بِالْبَيْتِ»، قَالَتْ: وَضَحَّى رَسُولُ اللَّه ﷺ عَنْ نِسَائِه، بِالْبَقَرِ.

عائیشە ﵂ دەڵێت: لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ دەرچووین، کە دەرچوونەکەمان

تەنها بۆ حەجکردن بوو، جا کاتێک گەیشتینە سەریف (شوێنێکە لەدەوری مەککە) یان نزیکی سەریف بووین، تووشی حەیز بووم، ئینجا پێغەمبەری خوا ﷺ هات بۆلام و لەو کاتەدا من دەگریام، ئەویش فەرمووی: «چیتە؟ عادە بوویتە؟»، گوتم: بەڵێ، فەرمووی: «ئەوە شتێکە کە خوا بۆ ئافرەتانی نەوەی ئادەمی داناوە (واتە: دڵی دایەوە تا دڵتەنگ نەبێت)، بۆیە هەموو ڕێوڕەسمەکانی حەج بکە تەنها تەوافی کەعبە مەکە»، (عائیشە رضي الله عنها) گوتی: پێغەمبەری خوا ﷺ مانگایەکی کردە قوربانی بۆ خێزانەکانی.

## بَابُ مَنْ قَرَنَ الْحَجَّ وَالْعُمْرَةَ

## باسی کەسێک کە ئیحرامی بەستووە بۆ حەج و عومرە پێکەوە

٥٩١. عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رضي الله عنه قَالَ: خَرَجْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّه ﷺ إِلَى مَكَّةَ، فَسَمِعْتُه يَقُولُ: «لَبَّيْكَ عُمْرَةً، وَحِجَّةً».

ئەنەسی کوڕی مالیک رضي الله عنه دەڵێت: لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ دەرچووین بۆ مەککە، جا گوێم لێ بوو (پێغەمبەر ﷺ) دەیفەرموو: «(لبيك عمرة وحجة)، (واتە: تەلبیەی عومرە و حەجی پێکەوە کرد)».



## بَابُ الْعُمْرَةِ

## باسی عومرە

٥٩٢. عَنْ عَبْدِ اللَّه بْنِ أَبِي أَوْفَى رضي الله عنهما يَقُولُ: كُنَّا مَعَ رَسُولِ اللَّه ﷺ حِينَ اعْتَمَرَ، فَطَافَ وَطُفْنَا مَعَه، وَصَلَّى وَصَلَّيْنَا مَعَه، وَكُنَّا نَسْتُرُه مِنْ أَهلِ مَكَّةَ، لَا يُصِيبُه أَحَدٌ بِشَيْءٍ.

عەبدوڵڵای کوڕی ئەبو ئەوفا رضي الله عنهما دەڵێت: ئێمە لە خزمەت پێغەمبەری خوادا ﷺ

بووین کاتێک که عومرەی کرد، ئینجا تەوافی کرد و ئێمەش لەگەڵ ئەو تەوافمان کرد، وە نوێژی کرد و ئێمەش نوێژمان لەگەڵی کرد، وە ئێمە لە خەڵکی مەککە دەمانپاراست نەوەک کەسێک تووشی شتێکی بکات (زیانی پێ بگەیەنن).

## بَابُ الْعُمْرَةِ فِي رَمَضَانَ

### باسی عومرە لە ڕەمەزاندا

٥٩٣. عَنْ وَهْبِ بْنِ خَنْبَشٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «عُمْرَةٌ فِي رَمَضَانَ، تَعْدِلُ حَجَّةً».

وەهبی کوڕی خەنبەش ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «عومرەیەک کە لە ڕەمەزاندا بکرێت (خێر و پاداشتەکەی) بەرانبەرە بە حەجێک».

## بَابُ الْعُمْرَةِ، مِنَ التَّنْعِيمِ

### باسی ئیحرامی عومرە لە تەنعیم

٥٩٤. عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي بَكْرٍ ﷺ: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ أَمَرَه أَنْ يُرْدِفَ عَائِشَةَ، فَيُعْمِرَها مِنَ التَّنْعِيمِ.

عەبدوڕڕەحمانی کوڕی ئەبو بەکر ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێ کردووە لەگەڵ عائیشە (کە خوشکی عەبدوڕڕەحمان بووە) بچێت و بیبات بۆ تەنعیم (شوێنێکە لە دەرەوەی حەرەمی مەککە) لەوێ ئیحرامی عومرە ببەستێت.

## بَابُ، كَمِ اعْتَمَرَ النَّبِيُّ ﷺ

### باسی پێغەمبەر ﷺ چەند عومرەی ئەنجام داوە

٥٩٥. عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قَالَ: اعْتَمَرَ رَسُولُ اللَّه ﷺ أَرْبَعَ عُمَرٍ: عُمْرَةَ الْحُدَيْبِيَةِ، وَعُمْرَةَ الْقَضَاءِ مِنْ قَابِلٍ، وَالثَّالِثَةَ مِنَ الْجِعْرَانَةِ، وَالرَّابِعَةَ الَّتِي مَعَ حَجَّتِه.

ئیبن عەبباس رضي الله عنهما دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ چوار عومرەی کردووە: یەکەمیان عومرەی حودەیبیە، دووەمیان عومرەی قەزا کە ساڵی داهاتوو بوو، سێیەمیان ئەو عومرەیەی کە لە جیعرانە ئیحرامی بۆ بەست، چوارەمیان ئەو عومرەیەی کە لەگەڵ حەجەکەیدا کردی.

## بَابُ الْمَوْقِفِ بِعَرَفَةَ

### باسی وەستان لە عەرەفات

٥٩٦. عَنْ عَلِيٍّ رضي الله عنه قَالَ: وَقَفَ رَسُولُ اللَّه ﷺ بِعَرَفَةَ، فَقَالَ: «هذَا الْمَوْقِفُ، وَعَرَفَةُ كُلُّها مَوْقِفٌ».

عەلی رضي الله عنه دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەر کێوی عەرەفات وەستا و فەرمووی: «ئەوە شوێنی ڕاوەستانە و عەرەفات هەمووی شوێنی ڕاوەستانە».

## بَابُ الدُّعَاءِ بِعَرَفَةَ

### باسی دوعاکردن لە عەرەفە

٥٩٧. عَنِ ابْنِ الْمُسَيِّبِ قَالَ: قَالَتْ عَائِشَةُ رضي الله عنها: إِنَّ رَسُولَ اللَّه ﷺ قَالَ: «مَا مِنْ يَوْمٍ أَكْثَرَ مِنْ، أَنْ يُعْتِقَ اللَّه ﷻ فِيه، عَبْدًا مِنَ النَّارِ، مِنْ يَوْمِ عَرَفَةَ، وَإِنَّه لَيَدْنُو ﷻ، ثُمَّ

يُبَاهِي بِهِمُ الْمَلَائِكَةَ، فَيَقُولُ: مَا أَرَادَ هؤُلَاءِ».

ئیبن موسەییب دەڵێت: عائیشە ﵂ گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «هیچ ڕۆژێک نییە کە بەئەندازەی ڕۆژی عەرەفە خوا ﷻ بەندەکانی تێدا ئازاد بکات لە ئاگر، وە خوا ﷻ نزیک دەبێتەوە، پاشان دەیانکاتە جێگای شانازی لەلای فریشتەکان، دەفەرموێت: ئەوانە چییان دەوێت».

## بَابُ قَدْرِ، حَصَى الرَّمْيِ

### باسی ئەندازەی بەردی ڕەجمی شەیتان

٥٩٨. عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه ﷺ: غَدَاةَ الْعَقَبَةِ وَهوَ عَلَى نَاقَتِهِ: «الْقُطْ لِي حَصًى»، فَلَقَطْتُ لَه سَبْعَ حَصَيَاتٍ، هنَّ حَصَى الْخَذْفِ، فَجَعَلَ يَنْفُضُهنَّ فِي كَفِّه وَيَقُولُ: «أَمْثَالَ هؤُلَاءِ، فَارْمُوا»، ثُمَّ قَالَ: «يَا أَيُّها النَّاسُ إِيَّاكُمْ وَالْغُلُوَّ فِي الدِّينِ، فَإِنَّه أَهلَكَ مَنْ كَانَ قَبْلَكُمُ الْغُلُوُّ فِي الدِّينِ».

ئیبن عەبباس ﵄ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ لە بەیانی ڕۆژی عەقەبە لەسەر وشترەکەیەوە فەرمووی: «هەندێک بەردووچکەم (بەردی گچکە) بۆ کۆ بکەوە»، منیش حەوت بەردووچکەم بۆ کۆ کردەوە کە بەردی گچکە بوون وەکوو دەنکەنۆک، جا دەستی کرد بە هاویشتنیان و دەیفەرموو: «لەو جۆرە بەردانە بەکار بێنن بۆ ڕەجمی شەیتان»، پاشان فەرمووی: «ئەی خەڵکینە زێدەڕۆیی نەکەن لە ئاییندا، چونکە ئەوانەی پێش ئێوە بەهۆی زێدەڕۆییان لە ئاییندا لەناو چوون».

## بَابُ إِذَا رَمَى جَمْرَةَ الْعَقَبَةِ، لَمْ يَقِفْ عِنْدَها

### باسێك دەربارەی ئەوە حاجی دوای ڕەجمی شەیتان لە شوێنەکە ڕاناوەستێت

٥٩٩. عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﵄: أَنَّه رَمَى جَمْرَةَ الْعَقَبَةِ، وَلَمْ يَقِفْ عِنْدَها، وَذَكَرَ أَنَّ النَّبِيَّ

ﷺ فَعَلَ مِثْلَ ذَلِكَ.

ئیبن عومەر رضي الله عنهما دەگێڕێتەوە: کە شەیتانی ڕەجم کرد (جەمرەی عەقەبە) و لەوێ ڕانەوەستا و باسی ئەوەی کرد کە پێغەمبەریش ﷺ بەو شێوەیەی کردووە.

## بَابُ تَأْخِيرِ رَمْيِ الْجِمَارِ مِنْ عُذْرٍ

### باسی دواخستنی ڕەجمی شەیتان بە بیانووی گونجاو

٦٠٠. عَنْ أَبِي الْبَدَّاحِ بْنِ عَاصِمٍ، عَنْ أَبِيهِ رضي الله عنه: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ رَخَّصَ لِلرِّعَاءِ، أَنْ يَرْمُوا يَوْمًا، وَيَدَعُوا يَوْمًا.

ئەبو بەدداحی کوڕی عاصیم لە باوکیەوە رضي الله عنه دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ مۆڵەتی داوە بەوانەی کە وشترەوانن (شوانی وشترن) ڕۆژێک نا ڕۆژێک ڕەجمی شەیتان بکەن.

## بَابُ الْحَلْقِ

### باسی سەرتاشین

٦٠١. عَنْ أَبِي هرَيْرَةَ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «اللَّهمَّ اغْفِرْ لِلْمُحَلِّقِينَ»، قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ وَالْمُقَصِّرِينَ؟ قَالَ: «اللَّهمَّ اغْفِرْ لِلْمُحَلِّقِينَ»، ثَلَاثًا قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ وَالْمُقَصِّرِينَ، قَالَ: «وَالْمُقَصِّرِينَ».

ئەبو هوڕەیرە رضي الله عنه دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «خوایە لەوانە خۆش بە کە سەریان دەتاشن»، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوانەشی کە کورتی دەکەنەوە، فەرمووی: «خوایە لەوانە خۆش بە کە سەریان دەتاشن»، سێ جار ئاوای فەرموو، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوانەشی کە کورتی دەکەنەوە، فەرمووی: «ئەوانەشی کە کورتی دەکەنەوە».

## بَابُ الذَّبْحِ

باسی سەربڕینی ئاژەڵی قوربانی

٦٠٢. عَنْ جَابِرٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه ﷺ: «مِنًى كُلُّها مَنْحَرٌ، وَكُلُّ فِجَاجِ مَكَّةَ، طَرِيقٌ وَمَنْحَرٌ، وَكُلُّ عَرَفَةَ مَوْقِفٌ، وَكُلُّ الْمُزْدَلِفَةِ مَوْقِفٌ».

جابیر ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «هەموو شوێنێکی مینا جێگای کوشتنەوەی قوربانییە و هەموو دەرچەکانی مەککە ڕێگا و شوێنی قوربانی سەربڕینن، هەموو شوێنەکانی عەرەفە جێگای ڕاوەستانە و هەموو موزدەلیفەش شوێنی ڕاوەستان و مانەوەیە».

## بَابُ مَنْ قَدَّمَ نُسُكًا قَبْلَ نُسُكٍ

باسی پێشخستنی واجبێک بەسەر واجبێکی دیکە لە ڕێوڕەسمی حەجدا

٦٠٣. عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ قَالَ: مَا سُئِلَ رَسُولُ اللَّه ﷺ عَمَّنْ قَدَّمَ شَيْئًا، قَبْلَ شَيْءٍ، إِلَّا يُلْقِي بِيَدَيْه كِلْتَيْهِمَا، لَا حَرَجَ.

ئیبن عەبباس ﷺ دەڵێت: هەر پرسیارێک لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرابێت دەربارەی پێشخستنی شتێک بەسەر شتێکدا، ئەوە بێگومان بە دەستەکانی ئاماژەی دەکرد کە ئاساییە.

## بَابُ رَمْيِ الْجِمَارِ أَيَّامَ التَّشْرِيقِ

باسی ڕەجمکردنی شەیتان لە ڕۆژەکانی جەژندا

٦٠٤. عَنْ جَابِرٍ ﷺ قَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّه ﷺ رَمَى جَمْرَةَ الْعَقَبَةِ ضُحًى، وَأَمَّا بَعْدَ

ذَلِكَ، فَبَعْدَ زَوَالِ الشَّمْسِ.

جابیر ﵁ دەڵێت: بینیم پێغەمبەری خوا ﷺ جەمرەی عەقەبەی لە چێشتەنگاودا ڕەجم کرد، دوای ئەوە لەدوای نیوەڕۆ ڕەجمی کرد.

## بَابُ الْخُطْبَةِ يَوْمَ النَّحْرِ

## باسی وتاری ڕۆژی جەژنی قوربان

٦٠٥. عَنْ سُلَيْمَانَ بْنِ عَمْرِو بْنِ الْأَحْوَصِ، عَنْ أَبِيهِ ﵁ قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ، يَقُولُ فِي حَجَّةِ الْوَدَاعِ: «يَا أَيُّهَا النَّاسُ أَلَا أَيُّ يَوْمٍ أَحْرَمُ؟»، ثَلَاثَ مَرَّاتٍ، قَالُوا: يَوْمُ الْحَجِّ الْأَكْبَرِ، قَالَ: «فَإِنَّ دِمَاءَكُمْ، وَأَمْوَالَكُمْ، وَأَعْرَاضَكُمْ بَيْنَكُمْ حَرَامٌ، كَحُرْمَةِ يَوْمِكُمْ هَذَا، فِي شَهْرِكُمْ هَذَا، فِي بَلَدِكُمْ هَذَا، أَلَا لَا يَجْنِي جَانٍ إِلَّا عَلَى نَفْسِهِ، وَلَا يَجْنِي وَالِدٌ عَلَى وَلَدِهِ، وَلَا مَوْلُودٌ عَلَى وَالِدِهِ، أَلَا إِنَّ الشَّيْطَانَ قَدْ أَيِسَ أَنْ يُعْبَدَ فِي بَلَدِكُمْ هَذَا أَبَدًا، وَلَكِنْ سَيَكُونُ لَهُ طَاعَةٌ فِي بَعْضِ مَا تَحْتَقِرُونَ مِنْ أَعْمَالِكُمْ، فَيَرْضَى بِهَا، أَلَا وَكُلُّ دَمٍ مِنْ دِمَاءِ الْجَاهِلِيَّةِ مَوْضُوعٌ، وَأَوَّلُ مَا أَضَعُ مِنْهَا دَمُ الْحَارِثِ بْنِ عَبْدِ الْمُطَّلِبِ -كَانَ مُسْتَرْضِعًا فِي بَنِي لَيْثٍ، فَقَتَلَتْهُ هُذَيْلٌ- أَلَا وَإِنَّ كُلَّ رِبًا مِنْ رِبَا الْجَاهِلِيَّةِ مَوْضُوعٌ، لَكُمْ رُءُوسُ أَمْوَالِكُمْ، لَا تَظْلِمُونَ وَلَا تُظْلَمُونَ، أَلَا يَا أُمَّتَاهُ هَلْ بَلَّغْتُ؟»، ثَلَاثَ مَرَّاتٍ، قَالُوا: نَعَمْ، قَالَ: «اللَّهُمَّ اشْهَدْ»، ثَلَاثَ مَرَّاتٍ.

سولەیمانی کوڕی عەمری کوڕی ئەحوەص لە باوکیەوە ﵁ دەگێڕێتەوە، گوتوویەتی: لە حەجیماڵئاواییدا گوێم لە پێغەمبەر ﷺ بوو، دەیفەرموو: «ئەی خەڵکینە کامە ڕۆژە بەڕێزترینە و تاوانکردن تێیدا گەورە و توندە؟»، سێ جار ئەوەی فەرمووی، گوتیان: ڕۆژی حەجی گەورە (ڕۆژی جەژنی قوربان)، فەرمووی: «بێگومان خوێن و ماڵ و ناموستان لەیەکدی قەدەغەیە وەکوو شکاندنی ڕێزی ئەو ڕۆژەتان لەو مانگەتان (کە -ذي الحجة- یە) لە شارەکەتان (مەککە)، ئاگادار بن کەسێک تاوان دەکات تەنها خۆی دەگرێتەوە و ناتەنێتەوە بۆ کەسوکاری، تاوانی باوک بۆ سەر منداڵەکەی

ناگوازرێتەوە و تاوانی منداڵیش بۆ سەر باوکی ناگوازرێتەوە، ئاگادار بن بەڕاستی شەیتان بێهیوا بووە کە هەرگیز لەو شارەتان ناپەرسترێت، بەڵام لە هەندێک شت کە ئێوە بە کەمی دەزانن گوێڕایەڵیی دەکەن و شەیتانیش پێی ڕازییە، ئاگادار بن هەموو خوێنێکی سەردەمی نەفامی پووچ و بەتاڵە، وە یەکەم خوێنێک کە بەتاڵی دەکەمەوە خوێنی حاریسی کوڕی عەبدولموتەلیبە -کە لەلای هۆزی (بنو لیث) شیرەخۆرە بوو و هۆزی (هذیل) کوشتیان-، ئاگادار بن هەموو سوو و ڕیبایەکی سەردەمی نەفامی بەتاڵ و پووچە و دەستمایەکەتان هەیە و هیچی دیکە، نە ستەم بکەن و نە ستەمتان لێ بکرێت، ئاگادار بن ئەی خەڵکینە ئایا پێم ڕاگەیاندن؟»، سێ جار ئەوەی فەرموو، گوتیان: بەڵێ، سێ جار فەرمووی: «خوایە شایەت بە».

## بَابُ الْبَيْتُوتَةِ بِمَكَّةَ لَيَالِي مِنًى

### باسی شەومانەوەی شەوانی مینا لە مەککەدا

٦٠٦. عَنِ ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما قَالَ: اسْتَأْذَنَ الْعَبَّاسُ بْنُ عَبْدِ الْمُطَّلِبِ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ أَنْ يَبِيتَ بِمَكَّةَ، أَيَّامَ مِنًى، مِنْ أَجْلِ سِقَايَتِهِ، فَأَذِنَ لَهُ.

ئیبن عومەر رضي الله عنهما دەڵێت: عەبباسی کوڕی عەبدولموتەلیب داوای مۆڵەتی لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد تاکوو شەو لە مەککە بمێنێتەوە لە ڕۆژەکانی مینادا، بۆ ئەوەی ئاو بدات بە حاجییەکان، ئەویش مۆڵەتی پێ دا.

## بَابُ طَوَافِ الْوَدَاعِ

### باسی تەوافیماڵئاوایی

٦٠٧. عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قَالَ: كَانَ النَّاسُ يَنْصَرِفُونَ كُلَّ وَجْهٍ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا يَنْفِرَنَّ أَحَدٌ، حَتَّى يَكُونَ آخِرُ عَهْدِهِ بِالْبَيْتِ».

ئیبن عەبباس ﵄ دەڵێت: خەڵکی (دوای تەواوبوونی حەج) لە هەر لایەکەوە بووایە دەردەچوون، بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: «هیچ کەسێک دەرنەچێت و نەگەڕێتەوە، وە با کۆتا شوێن کە بۆی دەچێت (تەوافی ماڵئاوایی) کەعبە بێت».

## بَابُ فِدْيَةِ الْمُحْصِرِ

## باسی فیدیەی کەسێک نەتوانێت بەردەوام بێت لە دروشمەکانی حەج

٦٠٨. عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَعْقِلٍ ﵁ قَالَ: قَعَدْتُ إِلَى كَعْبِ بْنِ عُجْرَةَ فِي الْمَسْجِدِ، فَسَأَلْتُه عَنْ هذِه الْآيَةِ: {فَفِدْيَةٌ مِنْ صِيَامٍ أَوْ صَدَقَةٍ أَوْ نُسُكٍ} البقرة: ١٩٦، قَالَ كَعْبٌ: فِيَّ أُنْزِلَتْ كَانَ بِي أَذًى مِن رَأْسِي، فَحُمِلْتُ إِلَى رَسُولِ اللهِ ﷺ، وَالْقَمْلُ يَتَنَاثَرُ عَلَى وَجْهِي، فَقَالَ: «مَا كُنْتُ أُرَى الْجُهْدَ بَلَغَ بِكَ مَا أَرَى، أَتَجِدُ شَاةً؟»، قُلْتُ: لَا، قَالَ: فَنَزَلَتْ هذِه الْآيَةُ: {فَفِدْيَةٌ مِنْ صِيَامٍ، أَوْ صَدَقَةٍ، أَوْ نُسُكٍ} البقرة: ١٩٦، قَالَ: «فَالصَّوْمُ ثَلَاثَةُ أَيَّامٍ، وَالصَّدَقَةُ عَلَى سِتَّةِ مَسَاكِينَ، لِكُلِّ مِسْكِينٍ نِصْفُ صَاعٍ مِنْ طَعَامٍ، وَالنُّسُكُ شَاةٌ».

عەبدوڵڵای کوڕی مەعقیل ﵁ دەڵێت: لە مزگەوت لەلای کەعبی کوڕی عوجرە دانیشتم، منیش دەربارەی ئەو ئایەتە پرسیارم لێ کرد: {فَفِدْيَةٌ مِنْ صِيَامٍ أَوْ صَدَقَةٍ أَوْ نُسُكٍ}، واتە: بریتییەک بدات کە ڕۆژووی (سێ ڕۆژە) یان خێرێک یان قوربانییەک بکات، (واتە: ئەگەر کەسێک پێش ئەوە قوربانییەکەی بگاتە جێگەی خۆی، ویستی سەری بتاشێت، دەبێت سێ ڕۆژ بەڕۆژوو بێت، یان خێرێک بکات کە خۆراکی شەش هەژارە، وە یان مەڕێک یان بزنێک بکاتە خێر لەوێدا). کەعب دەڵێت: دەربارەی من ئەم ئایەتە دابەزی، سەرم ئازار و ئێشی هەبوو، چوومە خزمەت پێغەمبەر ﷺ لە کاتێکدا کە ئەسپێی سەرم بەسەر دەموچاومدا دەهاتنە خوار و بڵاو دەبوونەوە، ئەویش فەرمووی: «نەمزانیبوو کە ئەو ئازار و ناڕەحەتییەت پێ گەیشتووە کە ئێستا دەیبینم، ئایا مەڕێکت دەست دەکەوێت؟»، گوتم: نەخێر، گوتی: ئینجا ئەو ئایەتە دابەزیی: {فَفِدْيَةٌ مِنْ صِيَامٍ، أَوْ صَدَقَةٍ، أَوْ نُسُكٍ}، فەرمووی: «ڕۆژووەکان سێ ڕۆژوون،

بەخشینەکە بۆ شەش هەژارە هەریەکی نیو صاع خواردن، قوربانییەکەش مەڕێکە.

## بَابُ تَقْلِيدِ الْغَنَمِ

### باسی نیشانەکردنی مەڕ و بزن

٦٠٩. عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: أَهدَى رَسُولُ اللَّه ﷺ مَرَّةً غَنمًا إِلَى الْبَيْتِ فَقَلَّدَها.

عائیشە ﵂ دەڵێت: جارێک پێغەمبەری خوا ﷺ مەڕێکی کردە دیاری بۆ قوربانی، جا نیشانەی کرد.

## بَابُ مَنْ جَلَّلَ الْبَدَنَةَ

### باسی دابەشکردنی گۆشتی وشتری قوربانی

٦١٠. عَنْ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ ﵁ قَالَ: أَمَرَنِي رَسُولُ اللَّه ﷺ أَنْ أَقُومَ عَلَى بُدْنِه، وَأَنْ أَقْسِمَ جِلَالَها وَجُلُودَها، وَأَنْ لَا أُعْطِيَ الْجَازِرَ مِنْها شَيْئًا، وَقَالَ: «نَحْنُ نُعْطِيه».

عەلی کوڕی ئەبو تالیب ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێ کردم کە من هەڵسم بە ئەنجامدانی قوربانییەکەی، داپۆشەری وشترەکە و گۆشت و پێستەکەشی دابەش بکەم، وە هیچ شتێک (وەک کرێ) لە وشترەکە نەدەم بە قەسابەکە و فەرمووی: «ئێمە خۆمان (کرێی) دەدەینێ».

## بَابُ فَضْلِ مَكَّةَ

### باسی پێگەو گەورەیی مەککە

٦١١. عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ مُسْلِمٍ ﵁ أَنَّه قَالَ: إِنَّ أَبَا سَلَمَةَ بْنَ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَوْفٍ

أَخْبَرَه، أَنَّ عَبْدَ اللَّه بْنَ عَدِيِّ بْنِ الْحَمْرَاءِ، قَالَ لَه: رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّه ﷺ، وَهوَ عَلَى نَاقَتِه، وَاقِفٌ بِالْحَزْوَرَةِ يَقُولُ: «وَاللَّه إِنَّكِ، لَخَيْرُ أَرْضِ اللَّه، وَأَحَبُّ أَرْضِ اللَّه إِلَيَّ، وَاللَّه لَوْلَا أَنِّي أُخْرِجْتُ مِنْكِ، مَا خَرَجْتُ».

موحەممەدی کوڕی موسلیم ﷺ دەڵێت: ئەبو سەلەمەی کوڕی عەبدوڕڕەحمانی کوڕی عەوف هەواڵی پێ داوە کە عەبدوڵڵای کوڕی عەدی کوڕی حەمڕاء پێی گوتووە: بینیم کە پێغەمبەری خوا ﷺ بە سواری وشترەکەیەوە لە حەزووەڕە (شوێنێکە لە مەککە) ڕاوەستابوو و دەیفەرموو: «سوێند بە خوا (ئەی مەککە) گومانی تێدا نییە کە باشترین زەوی خوایت، خۆشەویستترین زەوی خوایت لەلای من، سوێند بە خوا ئەگەر دەرنەکرابام ئەوە هەرگیز نەدەڕۆیشتم (بەجێم نەدەهێشتیت)».

## بَابُ فَضْلِ الْمَدِينَةِ

### باسی پێگەو گەورەیی مەدینە

٦١٢. عَنْ أَبِي هرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه ﷺ: «إِنَّ الْإِيمَانَ لَيَأْرِزُ إِلَى الْمَدِينَةِ، كَمَا تَأْرِزُ الْحَيَّةُ إِلَى جُحْرِها».

ئەبو هوڕەیرە ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: «ئیمان و ئیسلام دەکشێتەوە و دەچێتەوە نێو مەدینە هەر وەکوو چۆن مار (ئەگەر تینی بۆ هات) دەچێتەوە نێو کونەکەیەوە پێچ دەخوات».

٦١٣. عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه ﷺ: «مَنِ اسْتَطَاعَ مِنْكُمْ أَنْ يَمُوتَ بِالْمَدِينَةِ، فَلْيَفْعَلْ، فَإِنِّي أَشْهدُ لِمَنْ مَاتَ بِها».

ئیبن عومەر ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «هەر کەسێک لە ئێوە ئەگەر توانای هەبوو با لە مەدینە بمێنێتەوە تاکوو دەمرێت لێی دەرنەچێت، چونکە شایەتی (بە چاکە) بۆ ئەو کەسانە دەدەم کە لە مەدینەدا دەمرن».

٦١٤. عَنْ أَبِي هرَيْرَةَ ﷺ: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «اللَّهمَّ إِنَّ إِبْرَاهِيمَ خَلِيلُكَ وَنَبِيُّكَ، وَإِنَّكَ حَرَّمْتَ مَكَّةَ عَلَى لِسَانِ إِبْرَاهِيمَ، اللَّهمَّ وَأَنَا عَبْدُكَ وَنَبِيُّكَ، وَإِنِّي أُحَرِّمُ مَا بَيْنَ لَابَتَيْها».

ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: «خودایە بێگومان ئیبڕاهیم ﷺ خۆشەویست و پێغەمبەری تۆیە، بێگومان تۆ مەککەت ڕێزدار کرد لەسەر زمانی ئیبڕاهیم، خوایە دەسا منیش بەندە و پێغەمبەری تۆم، بێگومان منیش ئەوەی لەملاولای مەدینەدایە ڕێزداری دەکەم و ڕێزی دەگرم و حەرامی دەکەم».

# كِتَابُ الْأَضَاحِيِّ

## پەرتووكی قوربانییەكان

### بَابُ أَضَاحِيِّ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ

**باسی قوربانییەكانی پێغەمبەری خوا ﷺ**

٦١٥. عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رضي الله عنه: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ يُضَحِّي بِكَبْشَيْنِ أَمْلَحَيْنِ أَقْرَنَيْنِ، وَيُسَمِّي، وَيُكَبِّرُ، وَلَقَدْ رَأَيْتُه يَذْبَحُ بِيَدِه وَاضِعًا قَدَمَه عَلَى صِفَاحِهمَا.

ئەنەسی كوڕی مالیك رضي الله عنه دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ دوو بەرانی سپی و كەمێك ڕەش و شاخداری دەكردە قوربانی و ناوی خوای لێ دێنان و (الله أكبر) ـی دەكرد، بێگومان بینیومە كە بە دەستی خۆی سەری دەبڕین و پێی لەسەر لاملی قوربانییەكە دادەنا (لە كاتی كوشتنەوەدا).

### بَابُ عَنْ كَمْ تُجْزِئُ الْبَدَنَةُ وَالْبَقَرَةُ

**باسی بەشەكانی وشتر و مانگا**

٦١٦. عَنْ جَابِرٍ رضي الله عنه قَالَ: نَحَرْنَا بِالْحُدَيْبِيَةِ، مَعَ النَّبِيِّ ﷺ، الْبَدَنَةَ، عَنْ سَبْعَةٍ، وَالْبَقَرَةَ،

عَنْ سَبْعَةٍ.

جابیر ﵁ دەڵێت: لە خزمەت پێغەمبەردا ﷺ لە حودەیبیە قوربانیمان سەر بڕی، وشترێک بۆ حەوت کەس و ڕەشەوڵاخیش (مانگا) بۆ حەوت کەس.

## بَابُ مَا يُكْرَه، أَنْ يُضَحَّى بِه

## باسی ئەو شتانەی ناپەسەندن بۆ قوربانی

٦١٧. عَنْ سُلَيْمَان بْنَ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، قَالَ: سَمِعْتُ عُبَيْدَ بْنَ فَيْرُوزَ، قَالَ: قُلْتُ لِلْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ ﵄: حَدِّثْنِي بِمَا كَرِه، أَوْ نَهى عَنْه رَسُولُ اللَّه ﷺ مِنَ الْأَضَاحِيِّ فَقَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه ﷺ: هكَذَا بِيَدِه، وَيَدِي أَقْصَرُ مِنْ يَدِه: «أَرْبَعٌ لَا تُجْزِئُ فِي الْأَضَاحِيِّ: الْعَوْرَاءُ، الْبَيِّنُ عَوَرُها، وَالْمَرِيضَةُ، الْبَيِّنُ مَرَضُها، وَالْعَرْجَاءُ، الْبَيِّنُ ظَلْعُها، وَالْكَسِيرَةُ، الَّتِي لَا تُنْقِي»، قَالَ: فَإِنِّي أَكْرَه أَنْ يَكُونَ نَقْصٌ فِي الْأُذُنِ، قَالَ: فَمَا كَرِهتَ مِنْه، فَدَعْه، وَلَا تُحَرِّمْه عَلَى أَحَدٍ.

سولەیمانی کوڕی عەبدوڕڕەحمان دەڵێت: گوێم لە عوبەیدی کوڕی فەیڕووز بوو کە گوتی: بە بەڕائی کوڕی عازیبم ﵁ گوت: پێم بڵێت کە پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ قوربانیکردن چی پێناخۆش بووە؟ ئەویش گوتی: پێغەمبەری خوا ﷺ ئا بەو جۆرە بە دەستی ڕوونی کردەوە، کە دەستی من لە هیی ئەو کورتترە، فەرمووی: «چوار جۆر بۆ قوربانی ناشێن: ئاژەڵێکی کوێر کە کوێرییەکەی ڕوون و ئاشکرا بێت، ئاژەڵێکی نەخۆش کە نەخۆشییەکەی دیار و ڕوون بێت، ئاژەڵێکی شەل کە شەلییەکەی دیار و ڕوون بێت، ئاژەڵێک کە ئێسکی شکابێت، یان لەبەر لاوازی و نەخۆشی مۆخی ئێسقانی نەمابێت»، ڕاوی گوتی: من پێمناخۆشە کە گوێچکەکانیشی کەموکوڕییان هەبێت، (بەڕاء) گوتی: ئەوەی بۆخۆت پێتناخۆشە وازی لێ بێنە و لە خەڵکی حەرام مەکە.

## بَابُ مَنْ ضَحَّى بِشَاةٍ عَنْ أَهلِه

### باسی کەسێک کە بە مەڕێک لەبری خانەوادەکەی قوربانی بکات

٦١٨. عَنْ عَطَاءِ بْنِ يَسَارٍ رضي الله عنه قَالَ: سَأَلْتُ أَبَا أَيُّوبَ الْأَنْصَارِيَّ رضي الله عنه: كَيْفَ كَانَتِ الضَّحَايَا فِيكُمْ، عَلَى عَهدِ رَسُولِ اللَّه ﷺ؟ قَالَ: «كَانَ الرَّجُلُ فِي عَهدِ النَّبِيِّ ﷺ، يُضَحِّي بِالشَّاةِ عَنْه، وَعَنْ أَهلِ بَيْتِه، فَيَأْكُلُونَ وَيُطْعِمُونَ، ثُمَّ تَبَاهى النَّاسُ، فَصَارَ كَمَا تَرَى».

عەتائی کوڕی یەسار رضي الله عنه دەڵێت: پرسیارم کرد لە ئەبو ئەییووبی ئەنصاڕی رضي الله عنه قوربانیکردن لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا ﷺ چۆن بووە؟ گوتی: لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ پیاو هەبوو لەبری خۆی و خانەوادەکەی مەڕێکی دەکردە قوربانی و لێشیان دەخوارد و لێشیان دەبەخشی بە خەڵکی، پاشان خەڵکی لافوگەزافیان بە قوربانیکردنەوە لێ دا هەر وەکوو دەبینیت بەو جۆرەی لێ هات.

## بَابُ مَنْ أَرَادَ أَنْ يُضَحِّيَ فَلَا يَأْخُذْ فِي الْعَشْرِ مِنْ شَعْرِه وَأَظْفَارِه

### باسی کەسێک بیەوێت قوربانی بکات<br>لە دە ڕۆژەکاندا دەستکاری موو و نینۆکی نەکات

٦١٩. عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ رضي الله عنها: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «إِذَا دَخَلَ الْعَشْرُ، وَأَرَادَ أَحَدُكُمْ أَنْ يُضَحِّيَ، فَلَا يَمَسَّ مِنْ شَعَرِه، وَلَا بَشَرِه شَيْئًا».

ئوم سەلەمە رضي الله عنها دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: «ئەگەر دە ڕۆژەی (ذي الحجة) هات، یەکێکیشتان ویستی قوربانی بکات، ئەوە با هیچ دەستکاری موو و پێستی نەکات (واتە: دەستکاری هیچ جێیەکی جەستەی نەکات هەتا نینۆکیشی!)».

# بَابُ النَّهْيِ عَنْ ذَبْحِ الْأُضْحِيَّةِ قَبْلَ الصَّلَاةِ

## باسی نەهیکردن لە قوربانیکردن لەپێش نوێژی جەژندا

٦٢٠. عَنْ جُنْدُبٍ الْبَجَلِيِّ ﵁ أَنَّه يَقُولُ: شَهِدْتُ الْأَضْحَى مَعَ رَسُولِ اللَّه ﷺ، فَذَبَحَ أُنَاسٌ قَبْلَ الصَّلَاةِ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «مَنْ كَانَ ذَبَحَ مِنْكُمْ قَبْلَ الصَّلَاةِ، فَلْيُعِدْ أُضْحِيَّتَه، وَمَنْ لَا، فَلْيَذْبَحْ عَلَى اسْمِ اللَّه».

جوندوبی بەجەلی ﵁ دەڵێت: لە خزمەت پێغەمبەری خوادا ﷺ ئامادەی قوربانیکردن بووم، جا هەندێک لە خەڵکەکە پێش نوێژکردن قوربانییەکەیان سەر بڕی، ئینجا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: «هەر یەکێکتان ئەگەر لەپێش نوێژکردندا قوربانییەکەی سەر بڕیوە، ئەوە با دووبارەی بکاتەوە (بەرنەکەوتووە)، ئەوەشی ئەو کارەی نەکردووە، ئەوە (دوای نوێژ) با ناوی خوای لەسەر بێنێت و سەری ببڕێت».

# كِتَابُ الذَّبَائِحِ

## پەرتووکی سەربڕاوەکان

### بَابُ الْعَقِيقَةِ

باسی مەڕەمنداڵە (گوێزەبانە، حەوتوو)

٦٢١. عَنْ أُمِّ كُرْزٍ ﵂ قَالَتْ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ: «عَنِ الْغُلَامِ شَاتَانِ مُكَافِئَتَانِ، وَعَنِ الْجَارِيَةِ شَاةٌ».

ئوم کورز ﵂ دەڵێت: گوێم لە پێغەمبەر ﷺ بوو دەیفەرموو: «لەبری کوڕ دوو مەڕی وەکوو یەک بکەنە گوێزەبانە، وە بۆ کچیش یەک مەڕ».

٦٢٢. عَنْ سَمُرَةَ ﵁: عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «كُلُّ غُلَامٍ مُرْتَهَنٌ بِعَقِيقَتِهِ، تُذْبَحُ عَنْهُ يَوْمَ السَّابِعِ، وَيُحْلَقُ رَأْسُهُ، وَيُسَمَّى».

سەمورە ﵁ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: «هەموو منداڵێک گیرۆدەیە بە هۆزبانەیەوە و بارمتەیەتی، لە ڕۆژی حەوتەمی لەدایکبوونیەوە مەڕەمنداڵەی بۆ سەر ببڕن و سەری بۆ بتاشن و ناوی لێ بنێن».

تێبینی:

(مرتهن): چەند مانایەکی هەیە: یان ئەوەیە کە ئەگەر منداڵەکە بمرێت و مەڕەمنداڵەی بۆ نەکرێت، ئەوە شەفاعەت بۆ دایک و باوکی ناکات، یان چاکە و باشەی ئەو منداڵە بەندە بەو مەڕەمنداڵەوە، یان ئەو منداڵە سوودی لێ نابینرێت هەتاکوو مەڕەمنداڵەکەی بۆ نەکرێت.

## بَابٌ: إِذَا ذَبَحْتُمْ فَأَحْسِنُوا الذَّبْحَ

### باسێك: ئەگەر ئاژەڵتان کوشتەوە، بەباشترین شێوە بیکوژنەوە

٦٢٣. عَنْ شَدَّادِ بْنِ أَوْسٍ ﵁ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «إِنَّ اللَّهَ ﷻ كَتَبَ الْإِحْسَانَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ، فَإِذَا قَتَلْتُمْ، فَأَحْسِنُوا الْقِتْلَةَ، وَإِذَا ذَبَحْتُمْ، فَأَحْسِنُوا الذَّبْحَ، وَلْيُحِدَّ أَحَدُكُمْ شَفْرَتَه، وَلْيُرِحْ ذَبِيحَتَه».

شەددادی کوڕی ئەوس ﵁ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «بێگومان خوا ﷻ چاکەکاری لەسەر هەموو شتێک نووسیوە، جا ئەگەر کوشتنێکتان (لەسەر هەق) ئەنجام دا ئەوە بەباشترین شێوە ئەنجامی بدەن (جەستەکە مەشێوێنن و ئازاری مەدەن)، وە ئەگەر ئاژەڵێکتان سەر بڕی ئەوە بەباشترین و شایستەترین شێوە سەری ببڕن، با (ئەو کەسەی سەربڕینەکە ئەنجام دەدات) تیغەکەی تیژ بکات و ئەو ئاژەڵەی دەیکوژێتەوە بەشێوەیەکی ئاسوودە ئامادەی بکات (واتە: خێرا بیکوژێتەوە)».

## بَابُ التَّسْمِيَةِ عِنْدَ الذَّبْحِ

### باسی ناوی خوا هێنان لە کاتی سەربڕینی ئاژەڵدا

٦٢٤. عَنْ عَائِشَةَ أُمِّ الْمُؤْمِنِينَ ﵂: أَنَّ قَوْمًا قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّ قَوْمًا يَأْتُونَا بِلَحْمٍ لَا نَدْرِي ذُكِرَ اسْمُ اللَّهِ عَلَيْهِ أَمْ لَا؟ قَالَ: «سَمُّوا أَنْتُمْ وَكُلُوا».

عائیشەی دایکی ئیماندارا ن ﵂ دەگێڕێتەوە: خەڵکانێک گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا خەڵکانێک گۆشتمان بۆ دێنن، جا نازانین ناوی خوای لەسەر هێنراوە (لە کاتی سەربڕیندا) یاخود نا؟ فەرمووی: «بۆ خۆتان ناوی خوای لێ بهێنن و بیخۆن».

## بَابُ النَّهيِ عَنْ ذَبْحِ ذَوَاتِ الدَّرِّ

### باسی ڕێگریکردن لە کوشتنەوەی ماڵاتی شیردەر

٦٢٥. عَنْ أَبِي هرَيْرَةَ ﵁: أَنَّ رَسُولَ اللَّه ﷺ أَتَى رَجُلاً مِنَ الْأَنْصَارِ، فَأَخَذَ الشَّفْرَةَ، لِيَذْبَحَ لِرَسُولِ اللَّه ﷺ، فَقَالَ لَه رَسُولُ اللَّه ﷺ: «إِيَّاكَ، وَالْحَلُوبَ».

ئەبو هورەیرە ﵁ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ هات بۆ لای پیاوێکی ئەنصاڕی، ئەویش تیغێکی هەڵگرت بۆ ئەوەی ماڵاتێک بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ بکوژێتەوە، جا پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموو: «ئاگادار بە ماڵاتی شیردەر نەکوژیتەوە».

## بَابُ النَّهيِ عَنْ صَبْرِ الْبَهائِمِ وَعَنِ الْمُثْلَةِ

### باسی ڕێگریکردن لە شێواندنی لاشەی ئاژەڵ و بەنیشانەگرتنی

٦٢٦. عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﵁ قَالَ: نَهى رَسُولُ اللَّه ﷺ، عَنْ صَبْرِ الْبَهائِمِ.

ئەنەسی کوڕی مالیک ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی کردووە ئاژەڵەکان بکرێنە نیشانە (تیر یان هەر شتێکی دیکەیان لێ بدرێت).

٦٢٧. عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه ﷺ: «لَا تَتَّخِذُوا شَيْئًا فِيه الرُّوحُ غَرَضًا».

ئیبن عەبباس ﵄ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «هەر شتێک ژیاندار بوو مەیکەن بە نیشانە».

## بَابُ لُحُومِ الْحُمُرِ الْوَحْشِيَّةِ

### باسی خواردنی گۆشتی کەرەکێوی

٦٢٨. عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ الشَّيْبَانِيِّ، قَالَ: سَأَلْتُ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ أَبِي أَوْفَى ﵄ عَنْ لُحُومِ الْحُمُرِ الْأَهْلِيَّةِ، فَقَالَ: أَصَابَتْنَا مَجَاعَةٌ يَوْمَ خَيْبَرَ، وَنَحْنُ مَعَ النَّبِيِّ ﷺ، وَقَدْ أَصَابَ الْقَوْمُ حُمُرًا خَارِجًا مِنَ الْمَدِينَةِ، فَنَحَرْنَاهَا وَإِنَّ قُدُورَنَا لَتَغْلِي، إِذْ نَادَى مُنَادِي النَّبِيِّ ﷺ أَنْ: «اكْفَئُوا الْقُدُورَ، وَلَا تَطْعَمُوا مِنْ لُحُومِ الْحُمُرِ شَيْئًا»، فَأَكْفَأْنَاهَا، فَقُلْتُ لِعَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي أَوْفَى حَرَّمَهَا تَحْرِيمًا قَالَ: تَحَدَّثْنَا أَنَّمَا حَرَّمَهَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ الْبَتَّةَ، مِنْ أَجْلِ أَنَّهَا، تَأْكُلُ الْعَذِرَةَ.

ئەبو ئیسحاقی شەیبانیی دەڵێت: پرسیارم کرد لە عەبدوڵڵای کوڕی ئەبو ئەوفا ﵄ دەربارەی (خواردنی) گۆشتی کەری ماڵی، ئەویش گوتی: لە ڕۆژی خەیبەردا تووشی برسیەتییەکی توند هاتین (بەهۆی درێژەکێشان و گەمارۆدانی خەیبەر)، ئێمەش لە خزمەت پێغەمبەردا ﷺ بووین، خەڵکیش ئەو گوێدرێژەی کە لە مەدینە هاتبووەدەر گرتبوویانەوە و کوشتبانەوە، وە مەنجەڵەکانمان دەکوڵین، لەو کاتەدا جاڕچییەکی پێغەمبەر ﷺ جاڕی دا کە مەنجەڵەکانتان وەربگێڕن و هیچ شتێک لە گۆشتی کەرەکان نەخۆن، ئێمەش وەرمانگێڕان، منیش بە عەبدوڵڵای کوڕی ئەبو ئەوفاوم گوت: هەر بە حەرامکردن حەرامی کردن؟ گوتی: باسمان کرد کە بێگومان پێغەمبەری خوا ﷺ بەیەکجاری حەرامی کرد، چونکە شتی پیس دەخوات (وەکوو پاشەڕۆ).

# كِتَابُ الصَّيْدِ

## پەرتووکی ڕاووشکار

### بَابُ النَّهْيِ عَنِ اقْتِنَاءِ الْكَلْبِ، إِلَّا كَلْبَ صَيْدٍ، أَوْ حَرْثٍ، أَوْ مَاشِيَةٍ

باسی قەدەغەکردنی ڕاگرتنی سەگ، جگە لە سەگی ڕاو و پاسەوانی

٦٢٩. عَنْ أَبِي هرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنِ اقْتَنَى كَلْبًا، فَإِنَّه يَنْقُصُ مِنْ عَمَلِه كُلَّ يَوْمٍ قِيرَاطٌ، إِلَّا كَلْبَ حَرْثٍ أَوْ مَاشِيَةٍ».

ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «هەر کەسێک سەگ ڕابگرێت ئەوە هەموو ڕۆژێک (قیراط)ێک لە کردەوەکانی کەم دەبێتەوە، جگە لە سەگێک کە بە مەبەستی پاسەوانیی کشتوکاڵ یان پاسەوانیی مەڕوماڵات ڕابگیرێت».

تێبینی:

(قیراط): بەئەندازەی کێوێکی گەورەیە.

٦٣٠. عَنْ عَبْدِ اللَّه بْنِ مُغَفَّلٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه ﷺ: «لَوْلَا أَنَّ الْكِلَابَ أُمَّةٌ مِنَ الْأُمَمِ، لَأَمَرْتُ بِقَتْلِها، فَاقْتُلُوا مِنْها، الْأَسْوَدَ الْبَهِيمَ، وَمَا مِنْ قَوْمٍ اتَّخَذُوا كَلْبًا، إِلَّا كَلْبَ مَاشِيَةٍ، أَوْ كَلْبَ صَيْدٍ، أَوْ كَلْبَ حَرْثٍ، إِلَّا نَقَصَ مِنْ أُجُورِهِمْ، كُلَّ يَوْمٍ، قِيرَاطَانِ».

عەبدوڵڵای کوڕی موغەففەل ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «ئەگەر سەگەکانیش یەکێک نەبوونایە لە ئوممەتەکان ئەوە فەرمانم دەکرد بە کوشتنیان، جا ئەو سەگەی کە ڕەشێکی زۆر تیرە لە ڕەشیدا بیکوژن، وە بێگومان هەر هۆز و قەومێک سەگ ڕابگرێت، جگە لە سەگی پاسەوانیی مەڕوماڵات یان سەگێک کە فێری ڕاو کرابێت یان پاسەوانیی کشتوکاڵی پێ بکرێت، ئەوە بەدڵنیایی هەموو ڕۆژێک دوو (قیراط) لە پاداشتیان کەم دەبێتەوە».

## بَابُ صَيْدِ الْكَلْبِ

## باسی ڕاوی سەگ

٦٣١. عَنْ عَدِيِّ ابْنِ حَاتِمٍ ﵁ قَالَ: سَأَلْتُ رَسُولَ اللَّه ﷺ فَقُلْتُ: إِنَّا قَوْمٌ نَصِيدُ، بِهذِهِ الْكِلَابِ قَالَ: «إِذَا أَرْسَلْتَ كِلَابَكَ الْمُعَلَّمَةَ، وَذَكَرْتَ اسْمَ اللهِ عَلَيْها، فَكُلْ مَا أَمْسَكْنَ عَلَيْكَ، إِنْ قَتَلْنَ، إِلَّا أَنْ يَأْكُلَ الْكَلْبُ، فَإِنْ أَكَلَ الْكَلْبُ، فَلَا تَأْكُلْ، فَإِنِّي أَخَافُ أَنْ يَكُونَ إِنَّمَا أَمْسَكَ، عَلَى نَفْسِهِ، وَإِنْ خَالَطَها كِلَابٌ أُخَرُ، فَلَا تَأْكُلْ».

عەدی کوڕی حاتیم ﵁ دەڵێت: پرسیارم لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد و گوتم: ئێمە خەڵکێکین بەو سەگانە ڕاو دەکەین، فەرمووی: «ئەگەر سەگە ڕاهێنراوەکانت بەرهەڵدا کرد، ناوی خوات لەسەر هێنا ئەوە ئەو شتەی بۆتی ڕاو کردووە لێی بخۆ ئەگەر بیشیکوژن، تەنها مەگەر سەگەکە لێی بخوات، جا ئەگەر سەگەکە لێی خوارد، ئەوە تۆ لێی مەخۆ، چونکە ترسی ئەوەم هەیە سەگەکە بۆخۆی گرتبێت نەک بۆ تۆ، وە ئەگەر سەگی دیکەشی لەگەڵدا تێکەڵ بوون بۆ ڕاوەکە ئەوە هەر لێی مەخۆ».

## بَابُ الصَّيْدِ يَغِيبُ لَيْلَةً

## باسی نێچیرێکی ڕاوکراو کە شەوێک دیار نامێنێت

٦٣٢. عَنْ عَدِيِّ بْنِ حَاتِمٍ ﵁ قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّه أَرْمِي الصَّيْدَ، فَيَغِيبُ عَنِّي

لَيْلَةً؟ قَالَ: «إِذَا وَجَدْتَ فِيه سَهمَكَ، وَلَمْ تَجِدْ فِيه شَيْئًا غَيْرَه، فَكُلْه».

عەدی کوڕی حاتیم ﷺ دەڵێت: گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ تیر دەگرمە نێچیر و جار هەیە شەوێک تیدەپەڕێت لێم ونە؟ فەرمووی: «ئەگەر بینیتەوە و تیری تۆی پێوە بوو هیچ شتێکی دیکەی پێوە نەبوو (هۆی کوشتنی بێ،ت) ئەوە بیخۆ».

## بَابُ مَا قُطِعَ مِنَ الْبَهِيمَةِ وَهِيَ حَيَّةٌ

### باسی لێکردنەوەی پارچەیەک لە ئاژەڵ بەزیندوویی

٦٣٣. عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «مَا قُطِعَ مِنَ الْبَهِيمَةِ وَهِيَ حَيَّةٌ، فَمَا قُطِعَ مِنْها، فَهوَ مَيْتَةٌ».

ئیبن عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: «هەر شتێک و پارچەیەک لە ئاژەڵ لێبکرێتەوە بەزیندوویی، ئەوە ئەو پارچەیە مردارەوەبوویە (خواردنی حەرامە)».

## بَابُ مَا يُنْهى عَنْ قَتْلِه

### باسی ئەو شتانەی کوشتنیان قەدەغە کراوە

٦٣٤. عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ قَالَ: نَهى رَسُولُ اللَّه ﷺ عَنْ قَتْلِ أَرْبَعٍ مِنَ الدَّوَابِّ، النَّمْلَةِ، وَالنَّحْلَةِ، وَالْهدْهدِ، وَالصُّرَدِ.

ئیبن عەبباس ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ نەهی کردووە لە کوشتنی چوار گیاندار: مێرووله، هەنگ، هودهود (پەپووسلێمانە)، ئەو باڵندەیەی کە جرِوجانەوەری ورد دەخوات.

٦٣٥. عَنْ أَبِي هرَيْرَةَ ﷺ: عَنْ نَبِيِّ اللَّه ﷺ قَالَ: «إِنَّ نَبِيًّا مِنَ الْأَنْبِيَاءِ قَرَصَتْه نَمْلَةٌ، فَأَمَرَ بِقَرْيَةِ النَّمْلِ، فَأُحْرِقَتْ، فَأَوْحَى اللَّه ﷻ إِلَيْه: أَفِي أَنْ قَرَصَتْكَ نَمْلَةٌ، أَهلَكْتَ

أُمَّةً مِنَ الْأُمَمِ، تُسَبِّحُ».

ئەبو هوڕەیرە ﵁ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «یەکێک لە پێغەمبەرەکانی خوا مێروولەیەک پێوەی دا (گەستی)، ئەویش فەرمانی کرد و شارە مێروولەکە سووتێنرا، ئینجا خوا ﷻ وەحی بۆ نارد بەوەی کە: مێروولەیەک تۆی گەست، کەچی ئوممەتێکت لەو ئوممەتانە لەناو برد کە تەسبیحات دەکەن (خوا بەپاک دەگرن)!».

## بَابُ قَتْلِ الْوَزَغِ

### باسی کوشتنی شەوگەرد (مارمێلکە)

٦٣٦. عَنْ أُمِّ شَرِيكٍ ﵂: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ أَمَرَها، بِقَتْلِ الْأَوْزَاغِ.

ئوم شەریک ﵂ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرمانی کردووە بە کوشتنی شەوگەردەکان.

٦٣٧. عَنْ سَائِبَةَ مَوْلَاةِ الْفَاكِهِ بْنِ الْمُغِيرَةِ: أَنَّها دَخَلَتْ عَلَى عَائِشَةَ ﵂ فَرَأَتْ فِي بَيْتِها رُمْحًا مَوْضُوعًا، فَقَالَتْ: يَا أُمَّ الْمُؤْمِنِينَ مَا تَصْنَعِينَ بِهذَا؟ قَالَتْ: نَقْتُلُ بِهِ هذِهِ الْأَوْزَاغَ، فَإِنَّ نَبِيَّ اللَّهِ ﷺ أَخْبَرَنَا: «أَنَّ إِبْرَاهِيمَ لَمَّا أُلْقِيَ فِي النَّارِ، لَمْ تَكُنْ فِي الْأَرْضِ دَابَّةٌ، إِلَّا أَطْفَأَتِ النَّارَ، غَيْرَ الْوَزَغِ، فَإِنَّها كَانَتْ تَنْفُخُ عَلَيْهِ، فَأَمَرَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِقَتْلِهِ».

سائیبە خزمەتکاری فاکیهەی کوڕی موغیرە دەگێڕێتەوە: چوو بۆ لای عائیشە ﵂ جا بینیی ڕمێک لە ماڵەکەیدا دانراوە، ئەویش گوتی: ئەی دایکی بڕواداران بەو ڕمە چی دەکەن؟ گوتی: ئەو شەوگەردانەی پێ دەکوژین، چونکە بێگومان پێغەمبەری خوا ﷺ پێی ڕاگەیاندووین: «کاتێک ئیبراهیم خرایە نێو ئاگر هەرچی جرۆجانەوەری زەوی هەیە خەریکی کوژاندنەوەی ئاگرەکە بووە جگە لە شەوگەرد، ئەو فووی لێ کردووە، بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی کردووە بە کوشتنی شەوگەرد».

## بَابُ أَكْلِ كُلِّ ذِي نَابٍ مِنَ السِّبَاعِ

## باسی خواردنی هەر دڕندەیەکی چڕنووکدار

٦٣٨. عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄ قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، يَوْمَ خَيْبَرَ: عَنْ أَكْلِ، كُلِّ ذِي نَابٍ، مِنَ السِّبَاعِ، وَعَنْ كُلِّ ذِي مِخْلَبٍ، مِنَ الطَّيْرِ.

ئیبن عەبباس ﵄ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕۆژی خەیبەردا نەهی کرد لە خواردنی هەموو دڕندەیەکی کەڵبەدار و هەموو باڵندەیەکی چڕنووکدار.

## بَابُ الْأَرْنَبِ

## باسی کەروێشک

٦٣٩. عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﵁ قَالَ: مَرَرْنَا بِمَرِّ الظَّهْرَانِ، فَأَنْفَجْنَا أَرْنَبًا، فَسَعَوْا عَلَيْهَا، فَلَغَبُوا، فَسَعَيْتُ، حَتَّى أَدْرَكْتُهَا، فَأَتَيْتُ بِهَا أَبَا طَلْحَةَ، فَذَبَحَهَا، فَبَعَثَ بِعَجُزِهَا، وَوَرِكِهَا إِلَى النَّبِيِّ ﷺ، فَقَبِلَهَا.

ئەنەسی کوڕی مالیک ﵁ دەڵێت: بە (مر الظهران)ـدا (کە شیوێکە لە نزیک مەککە) تێپەڕین، جا لەو کاتەدا کەروێشکێکمان ڕاونا، هەوڵیان دا بیگرن، ئیدی ماندوو بوون، منیش هەوڵم دا تا گرتم، جا هێنام بۆ لای ئەبو تەلحە و کوشتیەوە، ئینجا ڕان و پاشڵەکەی بۆ پێغەمبەر ﷺ نارد، ئەویش وەریگرت.

# كِتَابُ الْأَطْعِمَةِ

## پەرتووكی خواردەمەنییەكان

### بَابُ إِطْعَامِ الطَّعَامِ

### باسی خواردندان بە خەڵك

٦٤٠. عَنْ عَبْدِ اللَّه بْنِ سَلَامٍ ﵁ قَالَ: لَمَّا قَدِمَ النَّبِيُّ ﷺ الْمَدِينَةَ، انْجَفَلَ النَّاسُ قِبَلَه، وَقِيلَ: قَدْ قَدِمَ رَسُولُ اللَّه ﷺ، قَدْ قَدِمَ رَسُولُ اللَّه، قَدْ قَدِمَ رَسُولُ اللَّه ثَلَاثًا، فَجِئْتُ فِي النَّاسِ، لِأَنْظُرَ، فَلَمَّا تَبَيَّنْتُ وَجْهه، عَرَفْتُ أَنَّ وَجْهه لَيْسَ بِوَجْه كَذَّابٍ، فَكَانَ أَوَّلُ شَيْءٍ سَمِعْتُه تَكَلَّمَ بِه، أَنْ قَالَ: «يَا أَيُّها النَّاسُ أَفْشُوا السَّلَامَ، وَأَطْعِمُوا الطَّعَامَ، وَصِلُوا الْأَرْحَامَ، وَصَلُّوا بِاللَّيْلِ، وَالنَّاسُ نِيَامٌ، تَدْخُلُوا الْجَنَّةَ بِسَلَامٍ».

عەبدوڵڵای كوڕی سەلام ﵁ دەڵێت: كاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ تەشریفی هێنا بۆ مەدینە خەڵكی بەڕاكردن و خێرایی ڕۆیشتن بەپیریەوە، سێ جار گوترا: بەڕاستی پێغەمبەری خوا ﷺ هات، بەڕاستی پێغەمبەری خوا ﷺ هات، بەڕاستی پێغەمبەری خوا ﷺ هات، منیش هاتمە نێو خەڵكەكە تاكوو تەماشای بكەم، جا كاتێك ڕوخساری لێم دەركەوت، زانیم كە بێگومان ڕوخساری لە كەسی درۆزن ناچێت، جا یەكەم قسەیەك كە لێم بیست ئەوە بوو فەرمووی: «ئەی خەڵكینە سەلامكردن لەنێو یەكدیدا بڵاو بكەنەوە، وە خواردن

بەخشن، پەیوەندیی خزمایەتی بەجێ بگەیەنن، بە شەو کاتێک خەڵکی نوستووە ئێوە شەونوێژ بکەن، ئەوکات دەچنە بەهەشت بەسەلامەتی».

## بَابُ طَعَامِ الْوَاحِدِ يَكْفِي الِاثْنَيْنِ

### باسی خواردنی کەسێک بەشی دوو کەس دەکات

٦٤١. عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّه ﵄ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه ﷺ: «طَعَامُ الْوَاحِدِ، يَكْفِي الِاثْنَيْنِ، وَطَعَامُ الِاثْنَيْنِ، يَكْفِي الْأَرْبَعَةَ، وَطَعَامُ الْأَرْبَعَةِ، يَكْفِي الثَّمَانِيَةَ».

جابیری کوڕی عەبدوڵڵا ﵄ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «خواردنی یەکێک بەشی دوو کەس دەکات، وە خواردنێک بۆ دوو کەس ئامادە کرابێت بەشی چوار کەس دەکات، وە خواردنی چوار کەس بەشی هەشت کەس دەکات».

## بَابُ النَّهْيِ أَنْ يُعَابَ الطَّعَامُ

### باسی نەهیکردن لە عەیبگرتن لە خواردن

٦٤٢. عَنْ أَبِي هرَيْرَةَ ﵁ قَالَ: مَا عَابَ رَسُولُ اللَّه ﷺ طَعَامًا قَطُّ، إِنْ رَضِيَه، أَكَلَه، وَإِلَّا تَرَكَه.

ئەبو هورەیرە ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ هەرگیز عەیبی لە خواردن نەگرتووە، ئەگەر بەدڵی بووایە دەیخوارد، ئەگەرنا وازی لێ دەهێنا.

## بَابُ الْأَكْلِ مُتَّكِئًا

### باسی خواردن بەپاڵکەوتوویی

٦٤٣. عَنْ أَبِي جُحَيْفَةَ ﵁: أَنَّ رَسُولَ اللَّه ﷺ قَالَ: «لَا آكُلُ مُتَّكِئًا».

ئەبو جوحەیفە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «من خواردن بەپاڵکەوتوویی ناخۆم».

٦٤٤. عَنْ عَبْدِ اللَّه بْنِ بُسْرٍ ﷺ قَالَ: أَهدَيْتُ لِلنَّبِيِّ ﷺ شَاةً، فَجَثَا رَسُولُ اللَّه ﷺ عَلَى رُكْبَتَيْه، يَأْكُلُ، فَقَالَ أَعْرَابِيٌّ: مَا هذِه الْجِلْسَةُ؟ فَقَالَ: «إِنَّ اللَّه جَعَلَنِي عَبْدًا كَرِيمًا، وَلَمْ يَجْعَلْنِي جَبَّارًا عَنِيدًا».

عەبدوڵلای کوڕی بوسر ﷺ دەڵێت: مەڕێکم بەدیاری برد بۆ پێغەمبەر ﷺ، جا پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەر ئەژنۆکانی دانیشتبوو نانی دەخوارد، ئیدی دەشتەکییەک گوتی: ئەو دانیشتنە چییە؟ پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: «خوا منی کردۆتە بەندەیەکی ڕێزدار و بەڕێز و نەیکردووم بە پاشایەکی ملهوڕی سەرەڕۆی یاخی (دەشتەکییەکە مەبەستی ئەوە بووە کە دەبوو پێغەمبەر ﷺ، وەکوو پاشاکان دانیشتبا بەخۆبەزلزانینەوە، پێغەمبەریش ﷺ ئەوەی ڕەت کردۆتەوە)».

## بَابُ التَّسْمِيَةِ، عِنْدَ الطَّعَامِ

### باسی ناوی خوا هێنان لە کاتی نانخواردندا

٦٤٥. عَنْ عَائِشَةَ ﷺ قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّه ﷺ: يَأْكُلُ طَعَامًا فِي سِتَّةِ نَفَرٍ مِنْ أَصْحَابِه، فَجَاءَ أَعْرَابِيٌّ، فَأَكَلَه بِلُقْمَتَيْنِ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّه ﷺ: «أَمَا أَنَّه لَوْ كَانَ قَالَ: بِسْمِ اللَّه لَكَفَاكُمْ، فَإِذَا أَكَلَ أَحَدُكُمْ طَعَامًا، فَلْيَقُلْ: بِسْمِ اللَّه، فَإِنْ نَسِيَ أَنْ يَقُولَ: بِسْمِ اللَّه فِي أَوَّلِه، فَلْيَقُلْ: بِسْمِ اللَّه فِي أَوَّلِه وَآخِرِه».

عائیشە ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ شەش کەس لە هاوەڵانی نانی دەخوارد، جا لەو کاتەدا دەشتەکییەک هات هەموو خواردنەکەی بە دوو پاروو خوارد، بۆیە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: «خۆ ئەگەر ئەو بیگوتبایە: بە ناوی خوا (بسم الله) ئەوە خواردنەکەتان بەش دەبوو، جا ئەگەر یەکێکتان خواردنی خوارد با بڵێت: بە ناوی خوا، ئەگەر سەرەتا لەبیری چوو بڵێت: بە ناوی خوا، ئەوە با

بڵێت: بە ناوی خوا لە سەرەتا و لە کۆتاییەوە».

## بَابُ الْأَكْلِ بِالْيَمِينِ

### باسی خواردن بە دەستی ڕاست

٦٤٦. عَنْ عُمَر بْنِ أَبِي سَلَمَةَ ﵄ قَالَ: كُنْتُ غُلَامًا فِي حِجْرِ النَّبِيِّ ﷺ، وَكَانَتْ يَدِي تَطِيشُ فِي الصَّحْفَةِ، فَقَالَ لِي: «يَا غُلَامُ سَمِّ اللَّه، وَكُلْ بِيَمِينِكَ، وَكُلْ مِمَّا يَلِيكَ».

عومەری کوڕی ئەبو سەلەمە ﵄ دەڵێت: منداڵێک بووم لە باوەشی پێغەمبەر ﷺ، منیش (لە کاتی نانخواردندا) دەستم دەگێڕا بەنێو قاپەکەدا، ئینجا پێغەمبەر ﷺ پێمی فەرموو: «ڕۆڵە گیان ناوی خوا بێنە و بە دەستی ڕاست بخۆ، لەبەردەمی خۆشتەوە بخۆ».

## بَابُ اللُّقْمَةِ إِذَا سَقَطَتْ

### باسی ئەگەر پاروویەک کەوتە خوارەوە

٦٤٧. عَنْ جَابِرٍ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه ﷺ: «إِذَا وَقَعَتِ اللُّقْمَةُ مِنْ يَدِ أَحَدِكُمْ، فَلْيَمْسَحْ مَا عَلَيْها مِنَ الْأَذَى، وَلْيَأْكُلْها».

جابیر ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «هەرکات پارووی دەستی یەکێکتان بەربۆوە، با ئەو پیسییەی پێوەی لکاوە لێی بکاتەوە و بیخوات».

## بَابُ مَا يُقَالُ إِذَا فَرَغَ مِنَ الطَّعَامِ

### باسی دوعای دوای نانخواردن

٦٤٨. عَنْ أَبِي أُمَامَةَ الْبَاهِلِيِّ ﵁ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ يَقُولُ: إِذَا رُفِعَ طَعَامُه أَوْ مَا بَيْنَ يَدَيْه

قَالَ: «الْحَمْدُ لِلَّه حَمْدًا كَثِيرًا، طَيِّبًا مُبَارَكًا، غَيْرَ مَكْفِيٍّ، وَلَا مُوَدَّعٍ، وَلَا مُسْتَغْنًى عَنْه رَبَّنَا».

ئەبو ئومامەی باهیلی ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، دەڵێت: کاتێک پێغەمبەر ﷺ لە خواردن دەبووەوە یان خواردنی بەردەستی هەڵدەگیرایەوە دەیفەرموو: «الْحَمْدُ لِلَّه حَمْدًا كَثِيرًا، طَيِّبًا مُبَارَكًا، غَيْرَ مَكْفِيٍّ، وَلَا مُوَدَّعٍ، وَلَا مُسْتَغْنًى عَنْه رَبَّنَا، واتە: سوپاس بۆ خوا سوپاسێکی زۆر و بەردەوام و پاک و پیرۆز، کە هەرگیز تەواو نابێت، لەسەریشی بەردەوام دەبین و لێشی بێنیاز نین ئەی پەروەردگارمان».

## بَابُ الْأَكْلِ قَائِمًا

### باسی خواردن بەپێوە

٦٤٩. عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ قَالَ: كُنَّا عَلَى عَهدِ رَسُولِ اللَّه ﷺ: نَأْكُلُ وَنَحْنُ نَمْشِي، وَنَشْرَبُ، وَنَحْنُ قِيَامٌ.

ئیبن عومەر ﷺ دەڵێت: ئێمە لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا ﷺ خواردنمان بەدەم ڕێگا ڕۆیشتنەوە دەخوارد و خواردنەوەمان بەپێوە دەخواردەوە.

## بَابُ الدُّبَّاءِ

### باسی کولەکە

٦٥٠. عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ: يُحِبُّ الْقَرْعَ.

ئەنەس ﷺ دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ کولەکەی پێخۆش بوو.

## بَابُ الْقَدِيدِ

## باسی گۆشتی وشککراوە

٦٥١. عَنْ أَبِي مَسْعُودٍ ﵁ قَالَ: أَتَى النَّبِيَّ ﷺ رَجُلٌ، فَكَلَّمَه، فَجَعَلَ تُرْعَدُ فَرَائِصُه، فَقَالَ لَه: «هوِّنْ عَلَيْكَ، فَإِنِّي لَسْتُ بِمَلِكٍ، إِنَّمَا أَنَا ابْنُ امْرَأَةٍ تَأْكُلُ الْقَدِيدَ».

ئەبو مەسعوود ﵁ دەڵێت: پیاوێک هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ قسەی لەگەڵ کرد، کابراش دەلەرزی و دەترسا، ئینجا پێی فەرموو: «لەسەرخۆ بە خۆ من پادشا نیم، من کوڕی ئافرەتێکم کە گۆشتی وشککراوەی دەخوارد».

## بَابُ الْكَبِدِ وَالطِّحَالِ

## باسی جگەرو سپڵ (سیپەلاک)

٦٥٢. عَنْ عَبْدِ اللَّه بْنِ عُمَرَ ﵁: أَنَّ رَسُولَ اللَّه ﷺ قَالَ: «أُحِلَّتْ لَكُمْ مَيْتَتَانِ وَدَمَانِ، فَأَمَّا الْمَيْتَتَانِ، فَالْحُوتُ وَالْجَرَادُ، وَأَمَّا الدَّمَانِ، فَالْكَبِدُ وَالطِّحَالُ».

عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﵁ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «دوو مردارەوەبوو و دوو خوێنتان بۆ حەڵاڵ کراوە، جا مردارەکان (ئەوانەی کە کوشتنەوەیان ناوێت): ماسی و کوللەن، دوو خوێنەکانیش: جگەر و سپڵن».

## بَابُ الزَّيْتِ

## باسی زەیت

٦٥٣. عَنْ عُمَرَ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه ﷺ: «ائْتَدِمُوا بِالزَّيْتِ، وَادَّهنُوا بِه، فَإِنَّه مِنْ شَجَرَةٍ مُبَارَكَةٍ».

عومەر ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «زەیت بکەنە پێخۆر و خۆتانی پێ چەور بکەن، چونکە زەیت لە دارێکی بەپیت و فەڕ بەرهەم هاتووە».

## بَابُ الْحَلْوَاءِ

### باسی شیرینی

٦٥٤. عَنْ عَائِشَةَ ﷺ قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّه ﷺ: يُحِبُّ الْحَلْوَاءَ، وَالْعَسَلَ.

عائیشە ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ حەزی بە شیرینی و هەنگوین دەکرد.

تێبینی:

(الحلواء): وەکوو هەڵوا و پەڵووی بە دۆشاو و شیرینییەکانی دیکەیە.

## بَابُ الْقِثَّاءِ وَالرُّطَبِ يُجْمَعَانِ

### باسی خواردنی ترۆزی و خورما بەیەکەوە

٦٥٥. عَنْ عَبْدِ اللَّه بْنِ جَعْفَرٍ ﷺ قَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّه ﷺ: يَأْكُلُ الْقِثَّاءَ، بِالرُّطَبِ.

عەبدوڵڵای کوڕی جەعفەر ﷺ دەڵێت: بینیومە کە پێغەمبەری خوا ﷺ ترۆزی و خورمای بەیەکەوە دەخوارد.

٦٥٦. عَنْ سَهلِ بْنِ سَعْدٍ ﷺ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّه ﷺ: يَأْكُلُ الرُّطَبَ، بِالْبِطِّيخِ.

سەهلی کوڕی سەعد ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ خورمای تازە و کاڵەکی بەیەکەوە دەخوارد.

## بَابٌ: إِذَا أُتِيَ بِأَوَّلِ الثَّمَرَةِ

باسێك: کاتێك نۆبەرەی بەروبووم دەهێنرێت

٦٥٧. عَنْ أَبِي هرَيْرَةَ ﵁: أَنَّ رَسُولَ اللَّه ﷺ كَانَ إِذَا أُتِيَ بِأَوَّلِ الثَّمَرَةِ قَالَ: «اللَّهمَّ بَارِكْ لَنَا فِي مَدِينَتِنَا، وَفِي ثِمَارِنَا، وَفِي مُدِّنَا، وَفِي صَاعِنَا، بَرَكَةً مَعَ بَرَكَةٍ، ثُمَّ يُنَاوِلُه أَصْغَرَ مَنْ بِحَضْرَتِه مِنَ الْوِلْدَانِ».

ئەبو هورەیرە ﵁ دەگێڕێتەوە: هەرکات نۆبەرەی بەروبوومیان بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ دەهێنا دەیفەرموو: «خودایە بەرەکەت بڕژێنە بەسەر شار و بەروبووم و مشت و پێوانەماندا، بەرەکەت لەگەڵ بەرەکەت (بڕژێنە بەسەرماندا)، پاشان دەیدا بە بچووکترین منداڵ لە ئامادەبووەکاندا».

## بَابُ خُبْزِ الْبُرِّ

باسی نانی گەنم

٦٥٨. عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: مَا شَبِعَ آلُ مُحَمَّدٍ ﷺ مُنْذُ قَدِمُوا الْمَدِينَةَ، ثَلَاثَ لَيَالٍ تِبَاعًا، مِنْ خُبْزِ بُرٍّ، حَتَّى تُوُفِّيَ ﷺ.

عائیشە ﵂ دەڵێت: ماڵ و خێزانی پێغەمبەر ﷺ لەو کاتەی کە هاتوونە مەدینە سێ شەو بەدوای یەکدا تێریان نەخواردووە لە نانی گەنم هەتاکوو کۆچی دوایشی کرد ﷺ.

## بَابُ الِاقْتِصَادِ فِي الْأَكْلِ وَكَرَاهةِ الشِّبَعِ

باسی لێگرتنەوە لە خواردن و ناپەسندی زۆرخۆری

٦٥٩. عَنِ الْمِقْدَامِ بْنِ مَعْدِ يكَرِبَ ﵁ يَقُولُ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّه ﷺ يَقُولُ: «مَا مَلَأَ

آدَمِيٌّ وِعَاءً شَرًّا مِنْ بَطْنٍ، حَسْبُ الْآدَمِيِّ، لُقَيْمَاتٌ يُقِمْنَ صُلْبَه، فَإِنْ غَلَبَتِ الْآدَمِيَّ نَفْسُه، فَثُلُثٌ لِلطَّعَامِ، وَثُلُثٌ لِلشَّرَابِ، وَثُلُثٌ لِلنَّفَسِ».

میقدامی کوڕی مەعدیکەریب ﵁ دەڵێت: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: «خراپترین دەفر کە ئادەمیزاد پڕی دەکات گەدەیەتی، چەند پارووەیەک بۆ ئادەمیزاد بەسە کە بتوانێت خۆی پێ ڕابگرێت، خۆ ئەگەر هەر نەفسی بەسەریدا زاڵ بوو (با گەدەی بکاتە سێ بەش)، با بەشێکی بۆ خواردن بێت و بەشێکی بۆ خواردنەوە و بەشێکیشی بۆ هەناسەدان».

## بَابُ مَنْ طَبَخَ فَلْيُكْثِرْ مَاءَه

### باسی ئەوەی کە کەسێك چێشتی کرد ئاوی زۆر تێبکات

٦٦٠. عَنْ أَبِي ذَرٍّ ﵁: عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «إِذَا عَمِلْتَ مَرَقَةً، فَأَكْثِرْ مَاءَها، وَاغْتَرِفْ لِجِيرَانِكَ مِنْها».

ئەبو زەڕ ﵁ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: «هەر کات چێشتی شلەت لێنا، ئەوە ئاوی زۆری تێبکە، بەشی هاوسێیەکەشتی لێ بدە».

## بَابُ أَكْلِ الثُّومِ وَالْبَصَلِ وَالْكُرَّاثِ

### باسی خواردنی سیر و پیاز و کەوەر

٦٦١. عَنْ جَابِرٍ ﵁: أَنَّ نَفَرًا أَتَوُا النَّبِيَّ ﷺ، فَوَجَدَ مِنْهُمْ رِيحَ الْكُرَّاثِ، فَقَالَ: «أَلَمْ أَكُنْ نَهَيْتُكُمْ عَنْ أَكْلِ هذِهِ الشَّجَرَةِ، إِنَّ الْمَلَائِكَةَ تَتَأَذَّى مِمَّا يَتَأَذَّى مِنْه الْإِنْسَانُ».

جابیر ﵁ دەگێڕێتەوە: چەند کەسێک هاتنە خزمەت پێغەمبەر ﷺ، ئەویش بۆنی کەوەری لێ کردن، بۆیە فەرمووی: «ئایا من خواردنی ئەو ڕووەکەم لێ قەدەغە

نەكردوون؟ بێگومان فریشتەكانیش بەو شتانە تووشی ئازار و ناڕەحەتی دەبن كە مرۆڤ پێی تووشی ئازار و ناڕەحەتی دەبێت».

# كِتَابُ الْأَشْرِبَةِ

## پەرتووكی خواردنەوەكان

### بَابُ الْخَمْرُ مِفْتَاحُ كُلِّ شَرٍّ

باسی ئەوەی كە عارەق كلیلی هەموو خراپەیەكە

٦٦٢. عَنْ أَبِي الدَّرْدَاءِ ﵁ قَالَ: أَوْصَانِي خَلِيلِي ﷺ: «لَا تَشْرَبِ الْخَمْرَ، فَإِنَّهَا مِفْتَاحُ كُلِّ شَرٍّ».

ئەبو دەرداء ﵁ دەڵێت: خۆشەویستەكەم ﷺ وەسییەتی بۆ كردم: «سەرخۆشكەرەكان مەخۆرەوە، چونكە ئەوانە كلیلی دەرگای هەموو خراپەیەكن».

### بَابُ مَنْ شَرِبَ الْخَمْرَ لَمْ تُقْبَلْ لَه صَلَاةٌ

باسی ئەوەی كە هەر كەسێك شەراب بخواتەوە نوێژی وەرناگیرێت

٦٦٣. عَنْ عَبْدِ اللَّه بْنِ عَمْرٍو ﵄ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه ﷺ: «مَنْ شَرِبَ الْخَمْرَ وَسَكِرَ، لَمْ تُقْبَلْ لَه صَلَاةٌ أَرْبَعِينَ صَبَاحًا، وَإِنْ مَاتَ دَخَلَ النَّارَ، فَإِنْ تَابَ تَابَ

اللَّه عَلَيْه، وَإِنْ عَادَ، فَشَرِبَ، فَسَكِرَ، لَمْ تُقْبَلْ لَه صَلَاةٌ أَرْبَعِينَ صَبَاحًا، فَإِنْ مَاتَ دَخَلَ النَّارَ، فَإِنْ تَابَ، تَابَ اللَّه عَلَيْه، وَإِنْ عَادَ، فَشَرِبَ، فَسَكِرَ، لَمْ تُقْبَلْ لَه صَلَاةٌ أَرْبَعِينَ صَبَاحًا، فَإِنْ مَاتَ دَخَلَ النَّارَ، فَإِنْ تَابَ تَابَ اللَّه عَلَيْه، وَإِنْ عَادَ، كَانَ حَقًّا عَلَى اللَّه، أَنْ يَسْقِيَه مِنْ رَدَغَةِ الْخَبَالِ، يَوْمَ الْقِيَامَةِ»، قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّه وَمَا رَدَغَةُ الْخَبَالِ؟ قَالَ: «عُصَارَةُ أَهلِ النَّارِ».

عەبدوڵڵای کوڕی عەمر ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «هەر کەسێک شەڕاب بخواتەوە و سەرخۆش بێ ئەوە چل ڕۆژ نوێژی گیرا نابێت، ئەگەر مردیش دەچێتە دۆزەخ، جا ئەگەر تەوبەی کرد خوا تەوبەی وەردەگرێت، ئەگەر گەڕایەوە سەر خواردنەوە و سەرخۆش بوو ئەوە چل ڕۆژ نوێژی وەرناگیرێت و ئەگەر بمرێت دەچێتە نێو ئاگر، جا ئەگەر تەوبەی کرد ئەوە خوا تەوبەی وەردەگرێت، ئەگەر گەڕایەوە و خواردیەوە و سەرخۆش بوو ئەوە چل ڕۆژ نوێژەکانی وەرناگیرێت و ئەگەر مرد ئەوە دەچێتە نێو ئاگر، خۆ ئەگەر تەوبەی کرد ئەوە خوا تەوبەکەی لێ وەردەگرێت، ئەگەر (بۆ جاری چوارەم) گەڕایەوە (خواردیەوە و سەرخۆش بوو) ئەوە هەقی خۆیەتی کە خوا لە قیامەتدا لە جۆگەلەی کێم و زوخاوی خەڵکی دۆزەخ خواردنەوەی بداتێ»، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ (ردغة الخبال) چییە؟ فەرمووی: «کێم و زوخاوی خەڵکی نێو ئاگرە».

## بَابُ مَا يَكُونُ مِنْه الْخَمْرُ

### باسی ئەو شتەی شەڕابی لێ دروست دەکرێت

٦٦٤. عَنْ أَبِي هرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه ﷺ: «الْخَمْرُ مِنْ هاتَيْنِ الشَّجَرَتَيْنِ: النَّخْلَةِ، وَالْعِنَبَةِ».

ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «شەڕاب لە (بەرهەمی) ئەو دوو دارە دروست دەکرێت: خورما و ترێ».

## بَابُ لُعِنَتِ الْخَمْرُ عَلَى عَشَرَةِ أَوْجُه

### باسی شەڕاب دەبێتە هۆکار بۆ نەفرەتکردن لە دە ڕووەوە

٦٦٥. عَنْ ابْنِ عُمَرَ ﵄ يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللَّه ﷺ: «لُعِنَتِ الْخَمْرُ عَلَى عَشَرَةِ أَوْجُه: بِعَيْنِها، وَعَاصِرِها، وَمُعْتَصِرِها، وَبَائِعِها، وَمُبْتَاعِها، وَحَامِلِها، وَالْمَحْمُولَةِ إِلَيْه، وَآكِلِ ثَمَنِها، وَشَارِبِها، وَسَاقِيها».

ئیبن عومەر ﵄ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «نەفرەت لە شەڕاب کراوە لە دە ڕووەوە: لە خودی خۆی، لە ئەو کەسەی دەیگوشێت، ئەوەشی داوای دەکات بۆ خۆی یان غەیری خۆی تا بۆی دروست بکرێت، ئەوەی دەیفرۆشێت، ئەوەی دەیکڕێت، ئەوەی دەیگوازێتەوە، ئەوەی بۆی دەگوازرێتەوە، ئەوەی پارەکەی دەخوات، ئەوەی دەیخواتەوە، ئەوەشی دەیگێڕێت».

## بَابُ الْخَمْرِ يُسَمُّونَها بِغَيْرِ اسْمِها

### باسی ئەوەی کە ناوی عارەق دەگۆڕن تاکوو حوکمەکەی بگۆڕن

٦٦٦. عَنْ أَبِي أُمَامَةَ الْبَاهِلِيِّ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه ﷺ: «لَا تَذْهَبُ اللَّيَالِي وَالْأَيَّامُ، حَتَّى تَشْرَبَ فِيها، طَائِفَةٌ مِنْ أُمَّتِي الْخَمْرَ، يُسَمُّونَها بِغَيْرِ اسْمِها»

ئەبو ئومامەی باهیلی ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «شەو و ڕۆژ کۆتاییان پێ نایەت هەتاکوو کۆمەڵێک لە ئوممەتی من شەڕاب دەخۆنەوە و ناوێکی دیکەی لێ دەنێن».

## بَابُ كُلُّ مُسْكِرٍ حَرَامٌ

### باسی هەموو سەرخۆشکەرێک حەرامە

٦٦٧. عَنْ عَائِشَةَ ﵂ تَبْلُغُ بِهِ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «كُلُّ شَرَابٍ أَسْكَرَ، فَهوَ حَرَامٌ».

عائیشە ﵂ پێی گەیشتوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ فەرموویەتی: «هەر خواردنەوەیەک کە مرۆڤ سەرخۆش بکات حەرام و قەدەغەیە».

## بَابُ مَا أَسْكَرَ كَثِيرُه فَقَلِيلُه حَرَامٌ

### باسی ئەوەی هەر شتێك زۆرەکەی سەرخۆشکەر بێت کەمەکەشی حەرامە

٦٦٨. عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّه ﵄: أَنَّ رَسُولَ اللَّه ﷺ قَالَ: «مَا أَسْكَرَ كَثِيرُه، فَقَلِيلُه حَرَامٌ».

جابیری کوڕی عەبدوڵڵا ﵄ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «ئەوەی کە زۆرەکەی مرۆڤ سەرخۆش بکات کەمەکەشی حەرامە».

## بَابُ تَخْمِيرِ الْإِنَاءِ

### باسی داپۆشینی دەفر و قاپەکان

٦٦٩. عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّه ﵄: عَنْ رَسُولِ اللَّه ﷺ أَنَّه قَالَ: «غَطُّوا الْإِنَاءَ، وَأَوْكُوا السِّقَاءَ، وَأَطْفِئُوا السِّرَاجَ، وَأَغْلِقُوا الْبَابَ، فَإِنَّ الشَّيْطَانَ لَا يَحُلُّ سِقَاءً، وَلَا يَفْتَحُ بَابًا، وَلَا يَكْشِفُ إِنَاءً، فَإِنْ لَمْ يَجِدْ أَحَدُكُمْ، إِلَّا أَنْ يَعْرُضَ عَلَى إِنَائِه عُودًا، وَيَذْكُرَ اسْمَ اللَّه، فَلْيَفْعَلْ، فَإِنَّ الْفُوَيْسِقَةَ تُضْرِمُ، عَلَى أَهلِ الْبَيْتِ بَيْتَهمْ».

جابیری کوڕی عەبدوڵڵا ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «دەفر و قاپەکان داپۆشن، کوندە و مەشکەکانتان سەر ببەستن، چراکان بکوژێننەوە، دەرگاکان دابخەن، چونکە بەڕاستی شەیتان سەری کوندە و مەشکە ناکاتەوە، وە دەرگا ناکاتەوە (کە داخراو بێت)، وە سەری دەفر و قاپ لانادات، جا ئەگەر تەنها دارێکت دەست کەوت کە بەسەر قاپەکەت یان دەفرەکەتی ڕابێڵی بۆ سەرداپۆشین، ئەوە وا بکە و ناوی خوای بەسەردا بخوێنە، چونکە بێگومان ئەو جڕوجانەوەرانەی لە کونەکانیان دێنە دەرەوە (وەکوو مشک و جرج) ئەوانە ئاگر بەردەدەنە ماڵ و خانووی خەڵک (بۆیە شەوانە کاتی خەوتن چرا بکوژێنرێتەوە باشترە)».

## بَابُ الشُّرْبِ فِي آنِيَةِ الْفِضَّةِ

### باسی خواردنەوە بە دەفری زیو

٦٧٠. عَنْ حُذَيْفَةَ ﷺ قَالَ: نَهى رَسُولُ اللَّه ﷺ عَنِ الشُّرْبِ، فِي آنِيَةِ الذَّهبِ، وَالْفِضَّةِ، وَقَالَ: «هيَ لَهمْ فِي الدُّنْيَا، وَهيَ لَكُمْ فِي الْآخِرَةِ».

حوزەیفە ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ نەهی کردووە لەوەی کە بە دەفری زێڕ و زیو بخورێتەوە، فەرموویەتی: «خواردنەوە بە زێڕ و زیو لە دونیادا بۆ کافرەکانە و لە قیامەتیشدا بۆ ئێوەیە».

٦٧١. عَنْ عَائِشَةَ ﷺ: عَنْ رَسُولِ اللَّه ﷺ قَالَ: «مَنْ شَرِبَ فِي إِنَاءِ فِضَّةٍ، فَكَأَنَّمَا يُجَرْجِرُ فِي بَطْنِه، نَارَ جَهنَّمَ».

عائیشە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «هەر کەسێک بە دەفری زیو بخواتەوە، ئەوە وەکوو ئەوە وایە خوڕەخوڕی ئاگری دۆزەخ بچێتە نێو گەدەیەوە».

## بَابُ الشُّرْبِ مِنْ فِي السِّقَاءِ

### باسی خواردنەوە لە دەمی کوندەوە

٦٧٢. عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ: نَهى أَنْ يُشْرَبَ، مِنْ فَمِ السِّقَاءِ.

ئیبن عەبباس ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ نەهی کردووە لە دەمی کوندەوە ڕاستەوخۆ ئاو بخورێتەوە.

## بَابٌ: إِذَا شَرِبَ أَعْطَى الْأَيْمَنَ فَالْأَيْمَنَ

### باسێك: ئەگەر ئاو خورایەوە لە دەستی ڕاستەوە دەست پێ دەکرێت

٦٧٣. عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ أُتِيَ بِلَبَنٍ قَدْ شِيبَ بِمَاءٍ، وَعَنْ يَمِينِهِ أَعْرَابِيٌّ، وَعَنْ يَسَارِهِ أَبُو بَكْرٍ، فَشَرِبَ ثُمَّ أَعْطَى الْأَعْرَابِيَّ، وَقَالَ: «الْأَيْمَنُ فَالْأَيْمَنُ».

ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەگێڕێتەوە: شیر هێنرا بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ کە ئاوی لەگەڵ تێکەڵ کرابوو، وە لای ڕاستی پێغەمبەر ﷺ دەشتەکییەک بوو لای چەپیشی ئەبو بەکر بوو، (پێغەمبەر ﷺ) لە شیرەکەی خواردەوە، پاشان دای بە دەشتەکییەکە و فەرمووی: «لە ڕاستەوە بۆ ڕاست (واتە: لەلای ڕاستەوە دەستی پێ کرد)».

## بَابُ التَّنَفُّسِ فِي الْإِنَاءِ

### باسی هەناسەدان لەنێو دەفردا

٦٧٤. عَنْ أَبِي هرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا شَرِبَ أَحَدُكُمْ، فَلَا يَتَنَفَّسْ فِي الْإِنَاءِ، فَإِذَا أَرَادَ أَنْ يَعُودَ، فَلْيُنَحِّ الْإِنَاءَ، ثُمَّ لِيَعُدْ إِنْ كَانَ يُرِيدُ».

ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «ئەگەر یەکێکتان شتێکی خواردەوە، ئەوە با لەنێو قاپەکەدا هەناسە نەدات، ئەگەر ویستی دوای هەناسەدان زیاتر بخواتەوە، با قاپەکە لابدات و هەناسە بدات، ئینجا ئەگەر ویستی با بگەڕێتەوە سەر خواردنەوەی نێو قاپەکە».

## بَابُ سَاقِي الْقَوْمِ آخِرُهمْ شُرْبًا

### باسی ئاوگێڕی کۆمەڵێک دوایین کەس ئاو دەخواتەوە

٦٧٥. عَنْ أَبِي قَتَادَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه ﷺ: «سَاقِي الْقَوْمِ، آخِرُهمْ شُرْبًا».

ئەبو قەتادە ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «ئەو کەسەی ئاو دەدات بە خەڵک و ئاو دەگێڕێت، کۆتا کەسە ئاو دەخواتەوە».

# كِتَابُ الطِّبِّ

## پەرتووکی پزیشکی

### بَابُ مَا أَنْزَلَ اللَّه دَاءً إِلَّا أَنْزَلَ لَه شِفَاءً

### باسی خوا هەر نەخۆشییەکی دابەزاندبێت، مسۆگەر چارەسەریشی بۆ دابەزاندووە

٦٧٦. عَنْ أُسَامَةَ بْنِ شَرِيكٍ رضي الله عنه قَالَ: شَهِدْتُ الْأَعْرَابَ يَسْأَلُونَ النَّبِيَّ ﷺ: أَعَلَيْنَا حَرَجٌ فِي كَذَا؟ أَعَلَيْنَا حَرَجٌ فِي كَذَا؟ فَقَالَ لَهمْ: «عِبَادَ اللَّه، وَضَعَ اللَّه الْحَرَجَ، إِلَّا مَنِ اقْتَرَضَ، مِنْ عِرْضِ أَخِيه شَيْئًا، فَذَاكَ الَّذِي حَرِجَ»، فَقَالُوا يَا رَسُولَ اللَّه: هلْ عَلَيْنَا جُنَاحٌ أَنْ لَا نَتَدَاوَى؟ قَالَ: «تَدَاوَوْا عِبَادَ اللَّه، فَإِنَّ اللَّه، سُبْحَانَه، لَمْ يَضَعْ دَاءً، إِلَّا وَضَعَ مَعَه شِفَاءً، إِلَّا الْهرَمَ»، قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّه مَا خَيْرُ مَا أُعْطِيَ الْعَبْدُ قَالَ: «خُلُقٌ حَسَنٌ».

ئوسامەی کوڕی شەریک رضي الله عنه دەڵێت: ئاگام لێ بوو هەندێك دەشتەکی پرسیاریان لە پێغەمبەر ﷺ دەکرد ئایا لەوە و لەوەدا گوناهبار دەبین؟ ئەویش پێیانی فەرموو: «ئەی بەندەکانی خوا، خوا تاوانی ئەوانەی لەسەرتان هەڵگرتووە مەگەر کەسێک بە شتێک قەرزداری براکەی بێت (کە لە پاشەملە باسی کردبێت، یان جنێوی پێ

دابێت، یان لەڕووی دەروونییەوە ئازاری دابێت)، ئا بەمە گوناهبار دەبن»، ئینجا گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئایا تاوانبار دەبین ئەگەر چارەسەری خۆمان نەکەین؟ فەرمووی: «ئەی بەندەکانی خوا خۆتان چارەسەر بکەن، چونکە خوای پاک و بێگەرد هەر دەردێکی دانابێت شیفا و دەرمانیشی بۆ داناوە جگە لە پیری»، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ باشترین شت چییە کە بەندە پێی بەخشراوە؟ فەرمووی: «ڕەوشتی باش».

٦٧٧. عَنْ أَبِي هرَيْرَةَ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه ﷺ: «مَا أَنْزَلَ اللَّه دَاءً، إِلَّا أَنْزَلَ لَه شِفَاءً».

ئەبو هوڕەیڕە رضي الله عنه دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «خوا هەر دەرد و نەخۆشییەکی دابەزاندبێت، مسۆگەر دەرمان و چارەسەریشی بۆ دابەزاندووە».

## بَابُ الْحَبَّةُ السَّوْدَاءُ

## باسی ڕەشکە

٦٧٨. عَنْ أَبِي هرَيْرَةَ رضي الله عنه أَنَّه سَمِعَ رَسُولَ اللَّه ﷺ يَقُولُ: «إِنَّ فِي الْحَبَّةِ السَّوْدَاءِ شِفَاءً مِنْ كُلِّ دَاءٍ، إِلَّا السَّامَ، وَالسَّامُ الْمَوْتُ، وَالْحَبَّةُ السَّوْدَاءُ، الشُّونِيزُ».

ئەبو هوڕەیڕە رضي الله عنه گوێی لە پێغەمبەری خوا ﷺ بووە دەیفەرموو: «بەڕاستی لە ڕەشکەدا شیفا و چارەسەر هەیە بۆ هەموو نەخۆشی و دەردێک جگە لە (السام)، (السام)ـیش مردنە، (الحبة السوداء) شونیزە (ڕەشکەیە)».

٦٧٩. عَنْ خَالِدِ بْنِ سَعْدٍ رضي الله عنه قَالَ: خَرَجْنَا، وَمَعَنَا غَالِبُ بْنُ أَبْجَرَ، فَمَرِضَ فِي الطَّرِيقِ، فَقَدِمْنَا الْمَدِينَةَ، وَهوَ مَرِيضٌ، فَعَادَه ابْنُ أَبِي عَتِيقٍ، وَقَالَ: لَنَا عَلَيْكُمْ بِهذِه الْحَبَّةِ السَّوْدَاءِ، فَخُذُوا مِنْها خَمْسًا، أَوْ سَبْعًا، فَاسْحَقُوها، ثُمَّ اقْطُرُوها فِي أَنْفِه، بِقَطَرَاتِ زَيْتٍ، فِي هذَا الْجَانِبِ وَفِي هذَا الْجَانِبِ، فَإِنَّ عَائِشَةَ حَدَّثَتْهمْ، أَنَّها سَمِعَتْ رَسُولَ اللَّه ﷺ يَقُولُ: «إِنَّ هذِه الْحَبَّةَ السَّوْدَاءَ شِفَاءٌ مِنْ كُلِّ دَاءٍ، إِلَّا أَنْ يَكُونَ السَّامُ»،

قُلْتُ: وَمَا السَّامُ؟ قَالَ: «الْمَوْتُ».

خالیدی کوڕی سەعد ﷺ دەڵێت: دەرچووین و غالیبی کوڕی ئەبجەڕیشمان لەگەڵ بوو، جا لە ڕێگادا نەخۆش کەوت، هاتینەوە مەدینەش هەر نەخۆش بوو، جا کوڕی ئەبو عەتیق سەردانی کرد و پێی گوتین: گرنگی بەو ڕەشکەیە بدەن، پێنج یان حەوت دانەی بێنن و بیهاڕن، پاشان ئاردەکەی بە ڕۆنی زەیت بدڵۆپێننە نێو هەردوو کونە لووتەکانی، چونکە عائیشە بۆی گێڕاونەوە کە گوێی لە پێغەمبەری خوا ﷺ بووە فەرموویەتی: «بەڕاستی ئەو ڕەشکەیە شیفا و چارەسەرە بۆ هەموو نەخۆشییەک جگە لە (السام)»، گوتم: (السام) چییە؟ فەرمووی: «مردنە».

## بَابُ الْكَمْأَةِ وَالْعَجْوَةِ

### باسی دوومەڵان و خورمای عەجوە

٦٨٠. عَنْ سَعِيدِ بْنِ زَيْدِ بْنِ عَمْرِو بْنِ نُفَيْلٍ، يُحَدِّثُ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ: «أَنَّ الْكَمْأَةَ مِنَ الْمَنِّ، الَّذِي أَنْزَلَ اللَّه عَلَى بَنِي إِسْرَائِيلَ وَمَاؤُها شِفَاءٌ لِلْعَيْنِ».

سەعیدی کوڕی زەیدی کوڕی عەمری کوڕی نوفەیل ﷺ لە پێغەمبەر ﷺ گێڕاویەتەوە کە (فەرموویەتی): «دوومەڵان بەشێکە لەو مەننە (جۆرە خواردنێکە) کە خوا بۆ بەنو ئیسرائیلی دابەزاند، وە ئاوەکەی دەرمانە بۆ نەخۆشی چاو».

## بَابُ النَّهيِ عَنِ الدَّوَاءِ الْخَبِيثِ

### باسی ڕێگریکردن لە چارەسەرکردن بە دەرمانی پیس و خراپ

٦٨١. عَنْ أَبِي هرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه ﷺ: «مَنْ شَرِبَ سُمًّا، فَقَتَلَ نَفْسَه، فَهوَ يَتَحَسَّاه فِي نَارِ جهنَّمَ، خَالِدًا مُخَلَّدًا فِيها أَبَدًا».

ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «هەر کەسێک ژەهر

بخواتەوە و بە ژەهر خۆی بکوژێت، ئەوە لە ڕۆژی دواییدا ژەهرەکەی بەدەستەوەیە و پەیتا پەیتا دەیخواتەوە، ئیدی هەتاهەتایە لە ئاگری دۆزەخدا دەمێنێتەوە».

## بَابُ دَوَاءِ عِرْقِ النَّسَا

## باسی چارەسەری نەخۆشی باداری یان لاقهێشە

٦٨٢. عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ يَقُولُ: سَمِعْتُ رَسُول اللَّه ﷺ يَقُولُ: «شِفَاءُ عِرْقِ النَّسَا، أَلْيَةُ شَاةٍ أَعْرَابِيَّةٍ تُذَابُ، ثُمَّ تُجَزَّأُ ثَلَاثَةَ أَجْزَاءٍ، ثُمَّ يُشْرَبُ عَلَى الرِّيقِ، فِي كُلِّ يَوْمٍ جُزْءٌ».

ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێت: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: «چارەسەری باداری (لاقهێشە) بریتییە لە چەوری مەڕێک کە لە دەشت بلەوەڕێت، چەورییەکەی دەتوێنرێتەوە، پاشان دەکرێتە سێ بەش، پاشان لە خورێنی (پێش نان خواردن) دەخورێتەوە، هەر ڕۆژە و بەشێکی (دەخورێتەوە)».

## بَابُ دَوَاءِ الْجِرَاحَةِ

## باسی چارەسەری برینداری

٦٨٣. عَنْ سَهلِ بْنِ سَعْدٍ السَّاعِدِيِّ ﷺ قَالَ: جُرِحَ رَسُولُ اللَّه ﷺ، يَوْمَ أُحُدٍ، وَكُسِرَتْ رَبَاعِيَتُه، وَهشِمَتِ الْبَيْضَةُ عَلَى رَأْسِه، فَكَانَتْ فَاطِمَةُ تَغْسِلُ الدَّمَ عَنْه، وَعَلِيٌّ يَسْكِبُ عَلَيْه الْمَاءَ، بِالْمِجَنِّ، فَلَمَّا رَأَتْ فَاطِمَةُ أَنَّ الْمَاءَ لَا يَزِيدُ الدَّمَ إِلَّا كَثْرَةً أَخَذَتْ قِطْعَةَ حَصِيرٍ، فَأَحْرَقَتْها، حَتَّى إِذَا صَارَ رَمَادًا، أَلْزَمَتْه الْجُرْحَ، فَاسْتَمْسَكَ الدَّمُ.

سەهلی کوڕی سەعدی ساعیدی ﷺ دەڵێت: لە جەنگی ئوحوددا پێغەمبەری خوا ﷺ بریندار بوو ددانە چوارینەکەی شکا و خوددەکەی (کڵاوە ئاسنینەکەی) لە سەریدا شکا، جا فاتیمە خوێنەکەی (لە ڕوخساری) دەشۆردەوە، پێشەوا عەلی بە

قەڵغانەکەی ئاوی دەهێنا و بەسەریدا دەکرد، کاتێك فاتیمە سەرنجی دا ئاوەکە تەنیا خوێنبەربوونەکە زیاتر دەکات، چوو پارچە حەسیرێکی هێنا و سوۆتاندی تاوەکوو بوو بە سووتوو (خۆڵەمێش)، وە لەسەر برینەکەی دانا، ئیدی خوێنبەربوونەکە وەستا.

## بَابُ دَوَاءِ ذَاتِ الْجَنْبِ

### باسی دەرمانی نەخۆشی هەوکردنی پەردەی سییەکان

٦٨٤. عَنْ أُمِّ قَيْسٍ بِنْتِ مِحْصَنٍ ﵂ قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّه ﷺ: «عَلَيْكُمْ بِالْعُودِ الْهِنْدِيِّ -يَعْنِي بِه الْكُسْتَ-، فَإِنَّ فِيه سَبْعَةَ أَشْفِيَةٍ، مِنْها ذَاتُ الْجَنْبِ». قَالَ ابْنُ سَمْعَانَ: فِي الْحَدِيثِ: فَإِنَّ فِيه شِفَاءً مِنْ سَبْعَةِ أَدْوَاءٍ، مِنْها ذَاتُ الْجَنْبِ.



ئوم قەیسی کچی میحصەن ﵂ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «گرنگی بدەن بە عودی هیندی -مەبەستی (الکست) بوو-، چونکە بەڕاستی چارەسەری حەوت نەخۆشییە، لەوانە نەخۆشی هەوکردنی پەردەی سییەکان». ئیبن سەمعان لەبارەی فەرمووده‌کەوە گوتی: بەڕاستی چارەسەری حەوت دەرد و نەخۆشییە، لەوانە نەخۆشی هەوکردنی پەردەی سییەکان.

## بَابُ الْحُمَّى

### باسی تا

٦٨٥. عَنْ أَبِي هرَيْرَةَ ﵁: عَنِ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّه عَادَ مَرِيضًا، وَمَعَه أَبُو هرَيْرَةَ مِنْ وَعْكٍ كَانَ بِه، فَقَالَ رَسُولُ اللَّه ﷺ: «أَبْشِرْ فَإِنَّ اللَّه يَقُولُ: هيَ نَارِي أُسَلِّطُها عَلَى عَبْدِي الْمُؤْمِنِ فِي الدُّنْيَا، لِتَكُونَ حَظَّه مِنَ النَّارِ، فِي الْآخِرَةِ».

ئەبو هورەیرە ﵁ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ سەردانی نەخۆشێکی کرد کە تووشی تا

ببوو و ئەبو هورەیرەشی لەگەڵ بوو، ئینجا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: «موژدەت لێ بێت، چونکە بەڕاستی خوا دەفەرموێت: ئەو ئاگرە لە منەوەیە کە لە دونیادا بەسەر بەندە ئیماندارەکەمیدا زاڵ دەکەم بۆئەوەی بەبری ئاگری دۆزەخ بکەوێت (واتە: گوناهی پێ دەسڕێتەوە)».

## بَابُ الْحِجَامَةُ

### باسی کەڵەشاخ

٦٨٦. عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما: أَنَّ رَسُولَ اللَّه ﷺ قَالَ: «مَا مَرَرْتُ لَيْلَةَ أُسْرِيَ بِي، بِمَلَإٍ مِنَ الْمَلَائِكَةِ، إِلَّا كُلُّهمْ يَقُولُ لِي: عَلَيْكَ، يَا مُحَمَّدُ بِالْحِجَامَةِ».

ئیبن عەبباس رضي الله عنهما دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «ئەو شەوەی کە شەوڕەویم پێ کرا، بەلای هەر کۆمەڵە فریشتەیەکدا ڕۆیشتبام، پێیمیان دەفەرموو: ئەی موحەممەد، گرینگی بە کەڵەشاخ بدە».

## بَابُ الْكُحْلِ بِالْإِثْمِدِ

### باسی چاوڕشتن بە کل

٦٨٧. عَنْ جَابِرٍ رضي الله عنه قَالَ: سَمِعْتُ رَسُول اللَّه ﷺ، يَقُولُ: «عَلَيْكُمْ بِالْإِثْمِدِ عِنْدَ النَّوْمِ، فَإِنَّه يَجْلُو الْبَصَرَ، وَيُنْبِتُ الشَّعَرَ».

جابیر رضي الله عنه دەڵێت: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: «لە کاتی نوستندا گرینگی بە کلی ڕەش بدەن، چونکە بەڕاستی چاو پاک دەکاتەوە و بەهێزی دەکات، برژانگیش دەڕوێنێتەوە».

## بَابُ يَقَعُ الذُّبَابُ فِي الْإِنَاءِ

## باسی کاتێک مێش دەکەوێتە نێو دەفری خواردن

٦٨٨. عَنْ أَبِي سَعِيدٍ ﵁: أَنَّ رَسُولَ اللَّه ﷺ قَالَ: «فِي أَحَدِ جَنَاحَيِ الذُّبَابِ سُمٌّ، وَفِي الْآخَرِ شِفَاءٌ، فَإِذَا وَقَعَ فِي الطَّعَامِ، فَامْقُلُوه فِيه، فَإِنَّه يُقَدِّمُ السُّمَّ، وَيُؤَخِّرُ الشِّفَاءَ».

ئەبو سەعید ﵁ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «باڵێکی مێش دەرد و ژەهری پێوەیە و باڵەکەی دیکەی چارەسەر و شیفابەخشە، جا ئەگەر کەوتە نێو دەفر و قاپی یەکێکتانەوە کە خواردنی تێدا بوو، ئەوە مێشەکە بەتەواوی نقووم بکەن تێیدا، چونکە مێش سەرەتا باڵە ژەهراوییەکەی پێش دەخات (دەخاتە نێو خواردنەکە)، باڵە شیفابەخشەکەی دوا دەخات».

## بَابُ الْعَيْنُ

## باسی چاوەزار

٦٨٩. عَنْ أَبِي أُمَامَةَ بْنِ سَهلِ بْنِ حُنَيْفٍ ﵁ قَالَ: مَرَّ عَامِرُ بْنُ رَبِيعَةَ بِسَهلِ بْنِ حُنَيْفٍ، وَهوَ يَغْتَسِلُ فَقَالَ: لَمْ أَرَ كَالْيَوْمِ، وَلَا جِلْدَ مُخَبَّأَةٍ فَمَا لَبِثَ أَنْ لُبِطَ بِه، فَأُتِيَ بِه النَّبِيَّ ﷺ فَقِيلَ لَه: أَدْرِكْ سَهلاً صَرِيعًا، قَالَ: «مَنْ تَتَّهمُونَ بِه»، قَالُوا عَامِرَ بْنَ رَبِيعَةَ، قَالَ: «عَلَامَ يَقْتُلُ أَحَدُكُمْ أَخَاه، إِذَا رَأَى أَحَدُكُمْ مِنْ أَخِيه مَا يُعْجِبُه، فَلْيَدْعُ لَه بِالْبَرَكَةِ»، ثُمَّ دَعَا بِمَاءٍ، فَأَمَرَ عَامِرًا أَنْ يَتَوَضَّأَ، فَغَسَلَ وَجْهه وَيَدَيْه إِلَى الْمِرْفَقَيْنِ، وَرُكْبَتَيْه وَدَاخِلَةَ إِزَارِه، وَأَمَرَه أَنْ يَصُبَّ عَلَيْه. قَالَ سُفْيَانُ: قَالَ مَعْمَرٌ، عَنِ الزُّهرِيِّ: وَأَمَرَه أَنْ يَكْفَأَ الْإِنَاءَ مِنْ خَلْفِه.

ئەبو ئومامەی کوڕی سەهلی کوڕی حونەیف ﵁ دەڵێت: عامیری کوڕی ڕەبیعە

بەلای سەهلی کوڕی حونەیفدا ڕۆیشت کە خەریکی خۆشۆردن بوو، جا گوتی: تا ئەوڕۆ هیچ پێستێکی ئاوا سپی و ناسکم نەبینیوە، هێندە پێ نەچوو کەوت و بریندار بوو، جا سەهلیان هێنایە خزمەت پێغەمبەر ﷺ و پێیان گوت: تەماشای سەهل بکە چی لێ هاتووە، ئەویش فەرمووی: «کێ تۆمەتبار دەکەن (بەوەی کە چاوی لێ دابێت)؟»، گوتیان: عامیری کوڕی ڕەبیعە، فەرمووی: «بۆچی یەکێک لە ئێوە براکەی بەکوشت دەدات، ئەگەر یەکێک شتێکی لە براکەی بینی کە پێی سەرسام بوو، ئەوە با دوعای بەرەکەتی بۆ بکات»، پاشان داوای ئاوی کرد، وە فەرمانی بە عامیر کرد کە دەستنوێژ بگرێت و دەموچاوی و دەستەکانی تا ئانیشک و قاچەکانی تا ئەژنۆ بشوات و ژێر جلەکانیشی بشوات، وە فەرمانی پێ کرد کە ئاوەکە بەسەر سەهلدا بڕێژێت. سوفیان گوتی: موعمەر لە زوهرییەوە گوتی: وە فەرمانی پێ کرد کە ئاوەکە لە پشتیەوە (پشتی سەهلەوە) بڕێژێت.

## بَابُ مَنِ اسْتَرْقَى مِنَ الْعَيْنِ

### باسی ئەو کەسەی نزا و پاڕانەوە دەکات بۆ چاوەزار

٦٩٠. عَنْ عُبَيْدِ بْنِ رِفَاعَةَ الزُّرَقِيِّ رضي الله عنه قَالَ: قَالَتْ أَسْمَاءُ يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّ بَنِي جَعْفَرٍ تُصِيبُهُمُ الْعَيْنُ، فَأَسْتَرْقِي لَهُمْ قَالَ: «نَعَمْ، فَلَوْ كَانَ شَيْءٌ سَابَقَ الْقَدَرَ، سَبَقَتْهُ الْعَيْنُ».

عوبەیدی کوڕی ڕیفاعەی زوڕەقی رضي الله عنه دەڵێت: ئەسماء رضي الله عنها گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ منداڵەکانی جەعفەر زوو زوو دەبن بەچاوەوە، ئایا دوعایان بۆ بکەم؟ فەرمووی: «بەڵێ، ئەگەر شتێك پێش قەدەر بکەوتایە ئەوە چاوی پیس پێشی دەکەوت».

٦٩١. عَنْ أَبِي سَعِيدٍ رضي الله عنه قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَتَعَوَّذُ مِنْ عَيْنِ الْجَانِّ، ثُمَّ أَعْيُنِ الْإِنْسِ، فَلَمَّا نَزَلَتِ الْمُعَوِّذَتَانِ، أَخَذَهُمَا وَتَرَكَ مَا سِوَى ذَلِكَ.

ئەبو سەعید رضي الله عنه دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ پەنای دەگرت بە خوا لە چاوپیسیی

جنۆکەکان، پاشان لە چاوپیسیی مرۆڤ، جا کاتێك ئەم دوو سوورەتە: (الفلق) و (الناس) دابەزین، ئیدی هەر ئەو دوو سوورەتەی دەخوێند و وازی لە دوعاکانی دیکە هێنا لەو بارەیەوە.

## بَابُ رُقْيَةِ الْحَيَّةِ وَالْعَقْرَبِ

### باسی دوعاکردن بۆ (پارێزران لە) مار و دووپشک

٦٩٢. عَنْ أَبِي هرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: لَدَغَتْ عَقْرَبٌ رَجُلًا، فَلَمْ يَنَمْ لَيْلَتَه، فَقِيلَ لِلنَّبِيِّ ﷺ، إِنَّ فُلَانًا لَدَغَتْه عَقْرَبٌ، فَلَمْ يَنَمْ لَيْلَتَه، فَقَالَ: «أَمَا إِنَّه لَوْ قَالَ، حِينَ أَمْسَى: أَعُوذُ بِكَلِمَاتِ اللَّه التَّامَّاتِ مِنْ شَرِّ مَا خَلَقَ، مَا ضَرَّه لَدْغُ عَقْرَبٍ حَتَّى يُصْبِحَ».

ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێت: دووپشکەیەک بە کابرایەکی وەدا، جا شەوەکە خەوی لێ نەکەوت، ئینجا بە پێغەمبەر ﷺ گوترا: فڵان کەس دووپشک پێوەی داوە و شەوەکەی خەوی لێ نەکەوتووە، ئەویش فەرمووی: «بەڕاستی خۆ ئەگەر هاتبا و ئێوارە بیگوتبا: (أَعُوذُ بِكَلِمَاتِ اللَّه التَّامَّاتِ مِنْ شَرِّ مَا خَلَقَ)، واتە: پەنا دەگرم بە هەموو کەلیماتە تەواوەکانی خوا لە شەڕ و خراپەی دروستکراوەکانی، ئەوە تاوەکوو بەیانی تووشی پێوەدانی دووپشکە نەدەبوو».

## بَابُ مَا عَوَّذَ بِه النَّبِيُّ ﷺ، وَمَا عُوِّذَ بِه

### باسی ئەو شتانەی کە پێغەمبەر ﷺ پەنای بە خوا گرتووە لێیان و ئەوەشی کە پێغەمبەر ﷺ پێی پەنا گیراوە بە خودا

٦٩٣. عَنْ عَائِشَةَ ﷺ قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّه ﷺ إِذَا أَتَى الْمَرِيضَ فَدَعَا لَه قَالَ: «أَذْهِبِ الْبَاسْ رَبَّ النَّاسْ، وَاشْفِ أَنْتَ الشَّافِي، لَا شِفَاءَ إِلَّا شِفَاؤُكَ، شِفَاءً لَا يُغَادِرُ سَقَمًا»

عائیشه ﵂ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێک دەهات بۆ لای نەخۆشێك دوعای بۆ دەکرد، دەیفەرموو: «أَذْهِبِ الْبَاسْ رَبَّ النَّاسْ، وَاشْفِ أَنْتَ الشَّافِي، لَا شِفَاءَ إِلَّا شِفَاؤُكَ، شِفَاءً لَا يُغَادِرُ سَقَمًا، واتە: پەروەردگاری خەڵکی ئەو ئێش و ئازارە لابەرە، وە شیفای بدە تۆ شیفابەخشی، جگە لە تۆ شیفابەخشی دیکە نییە، شیفایەکی وەها کە هیچ دەرد و نەخۆشییەك بەجێ نەهێڵێت».

٦٩٤. عَنْ عَائِشَةَ ﵂: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ مِمَّا يَقُولُ لِلْمَرِيضِ بِبُزَاقِهِ بِإِصْبَعِهِ: «بِسْمِ اللَّهِ، تُرْبَةُ أَرْضِنَا، بِرِيقَةِ بَعْضِنَا، لِيُشْفَى سَقِيمُنَا بِإِذْنِ رَبِّنَا».

عائیشه ﵂ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ لەو دوعایانەی کە بۆ نەخۆشی دەکرد ئەوە بوو کە پەنجەی شایەتمانی بە تف دەکرد و دەیخستە سەر زەوی، وە ئەو خۆڵەی کە بە دەستیەوە دەنووسا دەیخستە سەر شوێنی ئازارەکە و دەیفەرموو: «بِسْمِ اللَّه، تُرْبَةُ أَرْضِنَا، بريقَة بَعْضِنَا، لِيُشْفَى سَقِيمُنَا بِإِذْنِ رَبِّنَا، واتە: بە ناوی خوا دوعات بۆ دەکەم، ئەوە خۆڵی خاکی خۆمانە بە لیکی دەمی موسوڵمانێك لە خۆمان، بە ویستی خوا دەبێتە شیفا بۆ نەخۆشمان».

٦٩٥. عَنْ أَبِي سَعِيدٍ ﵁: أَنَّ جِبْرَائِيلَ أَتَى النَّبِيَّ ﷺ، فَقَالَ: يَا مُحَمَّدُ اشْتَكَيْتَ؟ قَالَ: «نَعَمْ»، قَالَ: «بِسْمِ اللَّهِ أَرْقِيكَ، مِنْ كُلِّ شَيْءٍ يُؤْذِيكَ، مِنْ شَرِّ كُلِّ نَفْسٍ أَوْ عَيْنٍ، أَوْ حَاسِدٍ اللَّهُ يَشْفِيكَ، بِسْمِ اللَّهِ أَرْقِيكَ».

ئەبو سەعید ﵁ دەگێڕێتەوە: جیبریل هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ و فەرمووی: ئەی موحەممەد ﷺ نەخۆشیت؟ فەرمووی: «بەڵێ»، (جیبریل) فەرمووی: «بە ناوی خواوە دوعات بۆ دەکەم لە زیانی هەموو شتێك کە ئازارت بدات، لە شەڕ و خراپەی هەموو نەفسێک، یان لە چاوی پیس، یان لە کەسی حەسوود، خوا شیفات بدات، بە ناوی خواوە دوعات بۆ دەکەم».

## بَابُ الْجُذَامِ

### باسی گولی (گەڕی)

٦٩٦. عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «لَا تُدِيمُوا النَّظَرَ إِلَى الْمَجْذُومِينَ».

ئیبن عەبباس رضي الله عنهما دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: «بەردەوام سەیری ئەوانە مەکەن کەوا گەڕ و گولن».

# كِتَابُ اللِّبَاسِ

## پەرتووکی بەرگ و پۆشاك

### بَابُ لِبَاسِ رَسُولِ اللَّه ﷺ

### باسی پۆشاکی پێغەمبەری خوا ﷺ

٦٩٧. عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: صَلَّى رَسُولُ اللَّه ﷺ فِي خَمِيصَةٍ لَها أَعْلَامٌ، فَقَالَ: «شَغَلَنِي أَعْلَامُ هذِه، اذْهبُوا بِها إِلَى أَبِي جَهمٍ، وَأْتُونِي بِأَنْبِجَانِيَّتِه».

عائیشه رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ لە پۆشاکێکدا نوێژی کرد کە ڕەنگاوڕەنگ و نەخشدار بوو، جا فەرمووی: «ئەو پۆشاکە سەرقاڵی کردم، بۆ ئەبو جەهمی بەرنەوە (چونکە ئەو بۆی هێنابوو)، وە پۆشاکێکی سادەم بۆ بێنن».

### بَابُ مَا يَقُولُ الرَّجُلُ إِذَا لَبِسَ ثَوْبًا جَدِيدًا

### باسی کەسێک کە پۆشاکی نوێ لەبەر دەکات چی دەڵێت

٦٩٨. عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا: أَنَّ رَسُولَ اللَّه ﷺ رَأَى عَلَى عُمَرَ قَمِيصًا أَبْيَضَ فَقَالَ:

«ثَوْبُكَ هذَا غَسِيلٌ أَمْ جَدِيدٌ؟»، قَالَ: لَا، بَلْ غَسِيلٌ. قَالَ: «الْبَسْ جَدِيدًا، وَعِشْ حَمِيدًا، وَمُتْ شَهِيدًا».

ئیبن عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ عومەری بینی کراسێکی سپی لەبەردا بوو، بۆیە فەرمووی: «ئەو پۆشاکەت شۆردووە یان نوێ و تازەیە؟»، گوتی: بەڵکوو شۆردراوە، فەرمووی: «هەردەم نوێ لەبەر بکەیت و بەخۆشی و سوپاسگوزاری بژیت و بەشەهیدی بمریت».

## بَابُ لُبْسِ الصُّوفِ

### باسی پۆشینی پۆشاکی خوری

٦٩٩. عَنْ أَبِي بُرْدَةَ، عَنْ أَبِيه ﷺ قَالَ: قَالَ لِي: يَا بُنَيَّ لَوْ شَهِدْتَنَا وَنَحْنُ مَعَ رَسُولِ اللَّه ﷺ إِذَا أَصَابَتْنَا السَّمَاءُ، لَحَسِبْتَ أَنَّ رِيحَنَا رِيحُ الضَّأْنِ.

ئەبو بوڕدە لە باوکیەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، گوتوویەتی: باوکم پێی گوتم: ڕۆڵەکەم ئەگەر کاتی خۆی ئێمە و پێغەمبەری خوات ﷺ بدیتبایە کاتێك بارانمان لێ دەباری، وات دەزانی بۆنی مەڕمان لێ دێت (چونکە پۆشاکەکەیان خوری بوو).

## بَابُ الْبَيَاضِ مِنَ الثِّيَابِ

### باسی پۆشاکی سپی

٧٠٠. عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه ﷺ: «خَيْرُ ثِيَابِكُمُ الْبَيَاضُ فَالْبَسُوها، وَكَفِّنُوا فِيها مَوْتَاكُمْ».

ئیبن عەبباس ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «باشترینی پۆشاکەکانتان پۆشاکی سپییە، بۆیە لەبەری بکەن و مردووەکانیشتانی پێ کفن بکەن».

## بَابُ مَنْ جَرَّ ثَوْبَه مِنَ الْخُيَلَاءِ

باسی ئەو کەسەی پۆشاکەکەی لەدوا دەخشێت بەهۆی خۆبەگەورەزانینەوە

٧٠١. عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷻ: أَنَّ رَسُولَ اللَّه ﷺ قَالَ: «إِنَّ الَّذِي يَجُرُّ ثَوْبَه مِنَ الْخُيَلَاءِ، لَا يَنْظُرُ اللَّه إِلَيْه يَوْمَ الْقِيَامَةِ».

ئیبن عومەر ﷻ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «ئەو کەسەی پۆشاکەکەی لەدوا بخشێت لەبەر خۆبەگەورەزانین، لە ڕۆژی قیامەتدا خوا تەماشای ناکات».

## بَابُ لُبْسِ الْقَمِيصِ

باسی پۆشینی کراس

٧٠٢. عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ ﷻ قَالَتْ: لَمْ يَكُنْ ثَوْبٌ أَحَبَّ إِلَى رَسُولِ اللَّه ﷺ مِنَ الْقَمِيصِ.

ئوم سەلەمە ﷻ دەڵێت: هیچ پۆشاکێک لەلای پێغەمبەری خوا ﷺ لە کراس خۆشەویستتر نەبوو.

## بَابُ لُبْسِ السَّرَاوِيلِ

باسی لەبەرکردنی شەرواڵ

٧٠٣. عَنْ سُوَيْدِ بْنِ قَيْسٍ ﷺ قَالَ: أَتَانَا النَّبِيُّ ﷺ فَسَاوَمَنَا سَرَاوِيلَ.

سوەیدی کوڕی قەیس ﷺ دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ تەشریفی هێنا بۆلامان مامەڵەی شەرواڵی لێ کردین.

## بَابُ الْعِمَامَةِ السَّوْدَاءِ

### باسی مێزەری ڕەش

٧٠٤. عَنْ جَعْفَرِ بْنِ عَمْرِو بْنِ حُرَيْثٍ، عَنْ أَبِيه ﷺ قَالَ: رَأَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَخْطُبُ عَلَى الْمِنْبَرِ، وَعَلَيْه عِمَامَةٌ سَوْدَاءُ.

جەعفەری کوڕی عەمری کوڕی حوڕەیس لە باوکیەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، گوتوویەتی: بینیومە کە پێغەمبەر ﷺ لەسەر دوانگە وتاری فەرمووە و مێزەری ڕەشی لەسەر بووە.

## بَابُ إِرْخَاءِ الْعِمَامَةِ بَيْنَ الْكَتِفَيْنِ

### باسی بەردانەوەی لکی مێزەر بەنێوان شانەکاندا

٧٠٥. عَنْ جَعْفَرِ بْنِ عَمْرِو بْنِ حُرَيْثٍ، عَنْ أَبِيه ﷺ قَالَ: كَأَنِّي أَنْظُرُ إِلَى رَسُولِ اللَّه ﷺ وَعَلَيْه عِمَامَةٌ سَوْدَاءُ قَدْ أَرْخَى طَرَفَيْها بَيْنَ كَتِفَيْه.

جەعفەری کوڕی عەمری کوڕی حوڕەیس لە باوکیەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، گوتوویەتی: وەکوو ئێستا چاوم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بێت وایە کە مێزەرێکی ڕەشی لەسەر بوو لکەکانی بەنێوان شانیدا شۆڕ کردبوونەوە.

## بَابُ كَرَاهِيَةِ لُبْسِ الْحَرِيرِ

### باسی ناپەسندی لەبەرکردنی ئاوریشم (حەریر)

٧٠٦. عَنِ الْبَرَاءِ ﷺ قَالَ: نَهى رَسُولُ اللَّه ﷺ عَنِ الدِّيبَاجِ، وَالْحَرِيرِ، وَالْإِسْتَبْرَقِ.

بەڕاء ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ نەهی کردووە لە پۆشینی ئاوریشم و ئەوەشی

که لێی دروست دەکرێت (جا بە هەر ناوێکەوە بێت).

## بَابُ مَنْ رُخِّصَ لَه فِي لُبْسِ الْحَرِيرِ

### باسی ئەوانەی ڕێیان پێ دراوە ئاوریشم بپۆشن

٧٠٧. عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ: أَنَّ رَسُولَ اللَّه ﷺ رَخَّصَ لِلزُّبَيْرِ بْنِ الْعَوَّامِ، وَلِعَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَوْفٍ، فِي قَمِيصَيْنِ مِنْ حَرِيرٍ مِنْ وَجَعٍ كَانَ بِهمَا حِكَّةٍ.

ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ مۆڵەتی بە زوبەیری کوڕی عەوام و عەبدوڕڕەحمانی کوڕی عەوف دا بۆ دوو کراسی ئاوریشم (کە لەبەری بکەن)، لەبەر ئەو ئازارەی کە هەیانبوو، کە بریتی بوو لە خروو (واتە: خروویان لە جەستەدا بوو).

## بَابُ لُبْسِ الْحَرِيرِ وَالذَّهبِ لِلنِّسَاءِ

### باسی لەبەرکردنی ئاوریشم و زێڕ بۆ ئافرەتان

٧٠٨. عَنْ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ ﷺ يَقُولُ: أَخَذَ رَسُولُ اللَّه ﷺ حَرِيرًا بِشِمَالِه، وَذَهبًا بِيَمِينِه، ثُمَّ رَفَعَ بِهمَا يَدَيْه، فَقَالَ: «إِنَّ هذَيْنِ حَرَامٌ عَلَى ذُكُورِ أُمَّتِي، حِلٌّ لِإِنَاثِهِمْ».

عەلی کوڕی ئەبو تالیب ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ پارچە ئاوریشمێکی بە دەستی چەپەوە گرتبوو زێڕیشی بە دەستی ڕاست، پاشان بەرزی کردن و فەرمووی: «ئەو دوو شتە (ئاوریشم و زێڕ) بۆ نێرینەی ئوممەتەکەم حەرامن و بۆ ڕەگەزی مێیینە حەڵاڵن».

## بَابُ لُبْسِ الْأَحْمَرِ لِلرِّجَالِ

### باسی پۆشینی ڕەنگی سوور بۆ پیاوان

٧٠٩. عَنِ الْبَرَاءِ ﵁ قَالَ: مَا رَأَيْتُ أَجْمَلَ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ مُتَرَجِّلاً فِي حُلَّةٍ حَمْرَاءَ.

بەڕاء ﵁ دەڵێت: هیچ کەسێکم نەبینیوە جوانتر بێت لە پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێک پۆشاکی سوور و ڕەشی لەبەر دەکرد و سەری شانە دەکرد.

## بَابُ لُبْسِ النِّعَالِ وَخَلْعِها

### باسی لەپێکردنی نەعل و لەپێکردنەوەیان

٧١٠. عَنْ أَبِي هرَيْرَةَ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه ﷺ: «إِذَا انْتَعَلَ أَحَدُكُمْ فَلْيَبْدَأْ بِالْيُمْنَى، وَإِذَا خَلَعَ فَلْيَبْدَأْ بِالْيُسْرَى».

ئەبو هوڕەیرە ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «ئەگەر هەر یەکێکتان نەعلی لەبەر کرد با بە لای ڕاست دەست پێ بکات، وە ئەگەر داشیکەند با بەلای چەپ دەست پێ بکات».

## بَابُ الْخِضَابِ بِالْحِنَّاءِ

### باسی ڕەنگکردن بە خەنە

٧١١. عَنْ أَبِي ذَرٍّ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه ﷺ: «إِنَّ أَحْسَنَ مَا غَيَّرْتُمْ بِه الشَّيْبَ الْحِنَّاءُ وَالْكَتَمُ».

ئەبو زەڕ ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «باشترین و جوانترین شتێک کە ڕەنگی (مووی سپی) پیریتانی پێ بگۆڕن، ڕەنگی خەنە و وسمەیە».

تێبینی:

(الكتم): جۆره ڕووه‌كێكه له‌گه‌ڵ خه‌نه تێكه‌ڵ ده‌كرێت و مووی پێ ڕه‌نگ ده‌كرێت و پێی ده‌ڵێن: وسمه.

بَابُ مَنْ تَرَكَ الْخِضَابَ

باسی ئه‌و كه‌سه‌ی كه سه‌ر و ڕیشی ڕه‌نگ ناكات

٧١٢. عَنْ أَبِي جُحَيْفَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ قَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ هذِهِ مِنْهُ بَيْضَاءُ. يَعْنِي عَنْفَقَتَه

ئه‌بو جوحه‌یفه رَضِيَ اللهُ عَنْهُ ده‌ڵێت: بینیومه كه پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ ژێر لێوی خواره‌وه‌ی ڕه‌نگی سپی بوو.

بَابُ كَرَاهِيَةِ كَثْرَةِ الشَّعَرِ

باسی ناپه‌سندی پرچی زۆر درێژ

٧١٣. عَنْ وَائِلِ بْنِ حُجْرٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ قَالَ: رَآنِي النَّبِيُّ ﷺ وَلِي شَعَرٌ طَوِيلٌ فَقَالَ: «ذُبَابٌ، ذُبَابٌ»، فَانْطَلَقْتُ فَأَخَذْتُه، فَرَآنِي النَّبِيُّ ﷺ فَقَالَ: «إِنِّي لَمْ أَعْنِكَ، وَهذَا أَحْسَنُ».

وائیلی كوڕی حوجر رَضِيَ اللهُ عَنْهُ ده‌ڵێت: كه پرچم زۆر درێژ بوو پێغه‌مبه‌ر ﷺ منی بینی و فه‌رمووی: «شوومه، شوومه»، منیش چووم كورتم كرده‌وه، ئینجا پێغه‌مبه‌ر ﷺ منی بینیه‌وه و فه‌رمووی: «بێگومان من مه‌به‌ستم تۆ نه‌بوو، به‌ڵام ئه‌وه‌یان جوانتر و چاكتره».

بَابُ النَّهْيِ عَنِ الْقَزَعِ

باسی نه‌هیكردن له تاشینی هه‌ندێكی پرچ و هێشتنه‌وه‌ی ئه‌وی دیكه

٧١٤. عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا قَالَ: نَهى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنِ الْقَزَعِ، قَالَ: وَمَا الْقَزَعُ؟

قَالَ: أَنْ يُحْلَقَ مِنْ رَأْسِ الصَّبِيِّ مَكَانٌ وَيُتْرَكَ مَكَانٌ.

ئیبن عومەر ﵄ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ نەهی کردووە لە قەزەع، ڕاوی لێی پرسی و گوتی: قەزەع چییە؟ گوتی: قەزەع ئەوەیە کە بەشێکی پرچی سەری منداڵ بتاشیت و بەشێکی بهێڵیتەوە.

## بَابُ التَّخَتُّمِ بِالْيَمِينِ

### باسی ئەنگوستیلە کردنە دەستی ڕاست

٧١٥. عَنْ عَبْدِ اللَّه بْنِ جَعْفَرٍ ﵄: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يَتَخَتَّمُ فِي يَمِينِهِ.

عەبدوڵڵای کوڕی جەعفەر ﵄ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ ئەنگوستیلەی دەکردە دەستی ڕاستی.



## بَابُ التَّخَتُّمِ فِي الْإِبْهَامِ

### باسی ئەنگوستیلە کردنە پەنجە گەورە

٧١٦. عَنْ عَلِيٍّ ﵁ قَالَ: نَهَانِي رَسُولُ اللَّه ﷺ أَنْ أَتَخَتَّمَ فِي هذِه وَفِي هذِه، يَعْنِي الْخِنْصَرَ وَالْإِبْهَامَ.

عەلی ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ نەهی لێ کردووم کە ئەنگوستیلە بکەمە ئەو پەنجە و ئەو پەنجەیان، واتە: پەنجە تووتە و پەنجە گەورە.

# كِتَابُ الْأَدَبِ

# پەرتووكی ئاداب و ئاكار

## بَابُ بِرِّ الْوَالِدَيْنِ

### باسی چاكبوون لەگەڵ دایک و باوک

٧١٧. عَنْ أَبِي هرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّه، مَنْ أَبَرُّ؟ قَالَ: «أُمَّكَ»، قَالَ: ثُمَّ مَنْ؟ قَالَ: «أُمَّكَ»، قَالَ: ثُمَّ مَنْ؟ قَالَ: «أَبَاكَ»، قَالَ: ثُمَّ مَنْ؟ قَالَ: «الْأَدْنَى فَالْأَدْنَى».

ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێت: گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ كێدا زۆر چاكەكار بم؟ فەرمووی: «دایكت»، گوتی: پاشان كێ؟ فەرمووی: «دایكت»، گوتی: پاشان كێ؟ فەرمووی: «باوكت»، گوتی: پاشان كێ؟ فەرمووی: «ئەوجار نزیكتر و نزیک (واتە: كێ لێت نزیكترە ئەویان زیاتر هەقی بەسەرتەوە هەیە، لەوەی كە لێت دوورترە)».

٧١٨. عَنْ أَبِي هرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه ﷺ: «لَا يَجْزِي وَلَدٌ وَالِدَه، إِلَّا أَنْ يَجِدَه مَمْلُوكًا فَيَشْتَرِيَه فَيُعْتِقَه».

ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «هیچ منداڵێک ناتوانێت

چاکەی باوکی بداتەوە، مەگەر باوکی کۆیلە بێت و ئەویش بیکڕێتەوە و ئازادی بکات».

٧١٩. عَنْ أَبِي الدَّرْدَاءِ ﵁: سَمِعَ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ: «الْوَالِدُ أَوْسَطُ أَبْوَابِ الْجَنَّةِ، فَأَضِعْ ذَلِكَ الْبَابَ أَوِ احْفَظْه».

ئەبو دەرداء ﵁ دەگێڕێتەوە: گوێی لە پێغەمبەر ﷺ بووە دەیفەرموو: «باوک دەرگای نێوەڕاستی بەهەشتە، جا (خۆت سەرپشکی)، یان ئەو دەرگایە دابخە و وازی لێ بێنە، یان پارێزگاری لێ بکە و دەستی پێوە بگرە».

## بَابُ بِرِّ الْوَالِدِ وَالْإِحْسَانِ إِلَى الْبَنَاتِ

### باسی چاکەی باوک و چاکەکردن لەگەڵ کچەکاندا

٧٢٠. عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: قَدِمَ نَاسٌ مِنَ الْأَعْرَابِ عَلَى النَّبِيِّ ﷺ فَقَالُوا: أَتُقَبِّلُونَ صِبْيَانَكُمْ؟ قَالُوا: نَعَمْ، فَقَالُوا: لَكِنَّا وَاللَّه مَا نُقَبِّلُ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «وَأَمْلِكُ أَنْ كَانَ اللَّه قَدْ نَزَعَ مِنْكُمُ الرَّحْمَةَ؟».

عائیشە ﵂ دەڵێت: کۆمەڵێک لە دەشتەکییەکان هاتن بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ، گوتیان: ئایا ئێوە منداڵەکانتان ماچ دەکەن؟ گوتیان: بەڵێ، ئەوانیش گوتیان: بەڵام سوێند بە خوا ئێمە ماچیان ناکەین، بۆیە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: «جا من دەسەڵاتی چیم هەیە کە خوا سۆز و بەزەیی لە دڵتاندا نەهێشتووە؟!».

٧٢١. عَنْ يَعْلَى الْعَامِرِيِّ ﵁ أَنَّه قَالَ: جَاءَ الْحَسَنُ وَالْحُسَيْنُ يَسْعَيَانِ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ، فَضَمَّهمَا إِلَيْه وَقَالَ: «إِنَّ الْوَلَدَ مَبْخَلَةٌ مَجْبَنَةٌ».

یەعلای عامیری ﵁ دەڵێت: حەسەن و حوسەین ﵄ هاتن و بەڕاکردن چوونە خزمەت پێغەمبەر ﷺ، پێغەمبەریش ﷺ لەباوەشی کردن و بەخۆیەوە گوشینی و فەرمووی: «بەڕاستی منداڵ هۆکاری ڕەزیلی و چروکی و ترسنۆکی باوک و

دایکیەتی (بەهۆی منداڵەوە باوک دەست بە ماڵەکەیەوە دەگرێت و نابەخشێت تا بۆ منداڵەکەی کۆ بکاتەوە، هەر بەهۆی منداڵەکەوە لە مردن دەترسێت و ناچێتە غەزا و ترسنۆک دەبێت)».

٧٢٢. عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ ﵁ يَقُولُ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «مَنْ كَانَ لَهُ ثَلَاثُ بَنَاتٍ فَصَبَرَ عَلَيْهِنَّ، وَأَطْعَمَهُنَّ، وَسَقَاهُنَّ، وَكَسَاهُنَّ مِنْ جِدَتِهِ كُنَّ لَهُ حِجَابًا مِنَ النَّارِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ».

عوقبەی کوڕی عامیر ﵁ دەڵێت: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: «هەر کەسێک سێ کچی هەبێت و لەسەریان ئارام بگرێت و خواردن و خواردنەوە و پۆشاکیان پێ بدات لە ماڵ و سامانی خۆی (بەپێی پێویست)، ئەوە لە ڕۆژی قیامەتدا بۆی دەبن بە پەردە و ڕێگر لە ئاگر».

## بَابُ حَقِّ الْجِوَارِ

### باسی مافی دراوسێ

٧٢٣. عَنْ عَائِشَةَ ﵂: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «مَا زَالَ جِبْرِيلُ يُوصِينِي بِالْجَارِ، حَتَّى ظَنَنْتُ أَنَّهُ سَيُوَرِّثُهُ».

عائیشە ﵂ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «بەردەوام جیبریل باسی مافی دراوسێی بۆ دەکردم، هەتا وای لێ هات گومان بکەم کە (دراوسێ) میرات لەیەکدی دەگرن».

## بَابُ إِمَاطَةِ الْأَذَى عَنِ الطَّرِيقِ

### باسی لابردنی دڕک و داڵ و ناڕەحەتی لەسەر ڕێگا

٧٢٤. عَنْ أَبِي بَرْزَةَ الْأَسْلَمِيِّ ﵁ قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، دُلَّنِي عَلَى عَمَلٍ أَنْتَفِعُ بِهِ،

قَالَ: «اعْزِلِ الْأَذَى عَنْ طَرِيقِ الْمُسْلِمِينَ».

ئەبو بەرزەی ئەسلەمی ﵁ دەڵێت: گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ کارێک ڕێنوێنیم بکە کە سوودی هەبێت بۆم، فەرمووی: «دڕک و داڵ و ناڕەحەتی لەسەر ڕێگای موسوڵمانان لابدە».

## بَابُ الرِّفْقِ

## باسی نەرمونیانی

٧٢٥. عَنْ جَرِيرِ بْنِ عَبْدِ اللَّه الْبَجَلِيِّ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه ﷺ: «مَنْ يُحْرَمِ الرِّفْقَ يُحْرَمِ الْخَيْرَ».

جەریری کوڕی عەبدوڵڵای بەجەلی ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «هەر کەسێك لە نەرمونیانی بێبەش بێت، ئەوە خێر و چاکەیەکی زۆری لەدەست داوە».

٧٢٦. عَنْ أَبِي هرَيْرَةَ ﵁ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «إِنَّ اللَّه رَفِيقٌ يُحِبُّ الرِّفْقَ، وَيُعْطِي عَلَيْه مَا لَا يُعْطِي عَلَى الْعُنْفِ».

ئەبو هوڕەیرە ﵁ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: «خوا نەرمونیانە و نەرمونیانیشی خۆش دەوێت، ئەوەی بە کەسی نەرمونیانی دەبەخشێت بەهۆی نەرمونیانییەکەیەوە، بە کەسی توند و دڵڕەقی نابەخشێت».

## بَابُ الْإِحْسَانِ إِلَى الْمَمَالِيكِ

## باسی چاکەکردن لەگەڵ ژێردەستەکان

٧٢٧. عَنْ أَبِي ذَرٍّ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه ﷺ: «إِخْوَانُكُمْ جَعَلَهمُ اللَّه تَحْتَ

أَيْدِيكُمْ، فَأَطْعِمُوهمْ مِمَّا تَأْكُلُونَ، وَأَلْبِسُوهمْ مِمَّا تَلْبَسُونَ، وَلَا تُكَلِّفُوهمْ مَا يَغْلِبُهمْ، فَإِنْ كَلَّفْتُمُوهمْ فَأَعِينُوهمْ».

ئەبو زەڕ ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «(بەندە و کۆیلەکان) برای ئێوەن و خوا ئەوانی خستۆتە ژێر دەستی ئێوە، جا خۆتان چی دەخۆن ئەوەیان بدەنێ بیخۆن، چی دەپۆشن لەو پۆشاکەش بیاندەنێ بیپۆشن، هەرگیز کارێک کە لە توانایاندا نییە مەیخەنە سەر شانیان، خۆ ئەگەر کاری قورستان خستە سەر شانیان ئەوە خۆشتان یارمەتییان بدەن».

## بَابُ إِفْشَاءِ السَّلَامِ

### باسی سڵاوکردن



٧٢٨. عَنْ أَبِي هرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه ﷺ: «وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِه، لَا تَدْخُلُوا الْجَنَّةَ حَتَّى تُؤْمِنُوا، وَلَا تُؤْمِنُوا حَتَّى تَحَابُّوا، أَوَلَا أَدُلُّكُمْ عَلَى شَيْءٍ إِذَا فَعَلْتُمُوه تَحَابَبْتُمْ، أَفْشُوا السَّلَامَ بَيْنَكُمْ».

ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «سوێند بەو زاتەی گیانی منی بەدەستە تاکوو بڕوا نەهێنن ناچنە نێو بەهەشتەوە، بڕواشتان دانامەزرێت هەتا یەکدیتان خۆش دەوێت، ئایا شتێکتان پێ نەڵێم کە ئەگەر بیکەن بەهۆیەوە یەکدیتان خۆش دەوێت؟ زۆر سڵاو لەیەکدی بکەن و بڵاوی بکەنەوە لە نێوانتاندا».

## بَابُ رَدِّ السَّلَامِ

### باسی وەڵامدانەوەی سڵاو

٧٢٩. عَنْ عَائِشَةَ ﷺ: أَنَّ رَسُولَ اللَّه ﷺ قَالَ لَها: «إِنَّ جِبْرَائِيلَ يَقْرَأُ عَلَيْكِ السَّلَامَ»، قَالَتْ، وَعَلَيْه السَّلَامُ وَرَحْمَةُ اللَّه.

عائیشه ﵂ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرمووە: «جیبریل سڵاوت لێ دەکات»، ئەویش گوتی: سڵاو و سۆز و بەزەیی خوا لەسەر ئەویش بێت.

## بَابُ رَدِّ السَّلَامِ عَلَى أَهلِ الذِّمَّةِ

### باسی وەڵامدانەوەی سڵاوی (أهل الذمة)

٧٣٠. عَنْ عَائِشَةَ ﵂: أَنَّه أَتَى النَّبِيَّ ﷺ نَاسٌ مِنَ الْيَهودِ فَقَالُوا: السَّامُ عَلَيْكَ يَا أَبَا الْقَاسِمِ، فَقَالَ ﷺ: «وَعَلَيْكُمْ».

عائیشه ﵂ دەگێڕێتەوە: خەڵکانێک لە جوولەکە هاتن بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ، جا گوتیان: (السام عليك يا أبا القاسم)، واتە: مردن لەسەر تۆ بێت ئەی ئەبولقاسیم، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: «لەسەر ئێوەش».

## بَابُ السَّلَامِ عَلَى الصِّبْيَانِ وَالنِّسَاءِ

### باسی سڵاوکردن لە منداڵان و لە ژنان

٧٣١. عَنْ أَنَسٍ ﵁ قَالَ: أَتَانَا رَسُولُ اللَّه ﷺ وَنَحْنُ صِبْيَانٌ، فَسَلَّمَ عَلَيْنَا.

ئەنەس ﵁ دەڵێت: ئێمە منداڵ بووین پێغەمبەری خوا ﷺ تەشریفی هات بۆ لامان و سڵاوی لێ کردین.

## بَابُ الْمُصَافَحَةِ

### باسی تەوقەکردن

٧٣٢. عَنِ الْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه ﷺ: «مَا مِنْ مُسْلِمَيْنِ يَلْتَقِيَانِ

فَيَتَصَافَحَانِ، إِلَّا غُفِرَ لَهمَا قَبْلَ أَنْ يَتَفَرَّقَا».

بەڕائی کوڕی عازیب ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «هەرکات دوو موسوڵمان بەیەکدی دەگەن و تەوقە دەکەن، ئەوە بێگومان لە گوناهەکانیان دەبووردرێن، پێش ئەوەی لەیەکدی جیا ببنەوە».

## بَابُ تَشْمِيتِ الْعَاطِسِ

### باسی وەڵامدانەوەی کەسێک کە دەپژمێت

٧٣٣. عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: عَطَسَ رَجُلَانِ عِنْدَ النَّبِيِّ ﷺ، فَشَمَّتَ أَحَدَهمَا، وَلَمْ يُشَمِّتِ الْآخَرَ، فَقِيلَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، عَطَسَ عِنْدَكَ رَجُلَانِ فَشَمَّتَّ أَحَدَهمَا وَلَمْ تُشَمِّتِ الْآخَرَ، فَقَالَ: «إِنَّ هذَا حَمِدَ اللَّهَ، وَإِنَّ هذَا لَمْ يَحْمَدِ اللَّهَ».

ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێت: دوو پیاو لە خزمەت پێغەمبەردا ﷺ پژمین، جا پێغەمبەر ﷺ وەڵامی یەکێکیانی دایەوە و وەڵامی ئەوی دیکەی نەدایەوە، گوترا: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ دوو کەس لە خزمەت جەنابتدا پژمین و وەڵامی یەکێکیانت دایەوە و وەڵامی ئەوی دیکەت نەدایەوە؟ فەرمووی: «ئەوەیان (کە وەڵامم دایەوە دوای پژمین) سوپاسی خوای کرد و گوتی: (الْحَمْدُ لِلَّه)، بەڵام ئەوی دیکە (الْحَمْدُ لِلَّه)ـی نەگوت».

## بَابُ النَّهيِ عَنْ سَبِّ الرِّيحِ

### باسی ڕێگریکردن لە جنێودان بە با

٧٣٤. عَنْ أَبِي هرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه ﷺ: «لَا تَسُبُّوا الرِّيحَ فَإِنَّها مِنْ رَوْحِ اللَّه تَأْتِي بِالرَّحْمَةِ وَالْعَذَابِ، وَلَكِنْ سَلُوا اللَّهَ مِنْ خَيْرِها وَتَعَوَّذُوا بِاللَّهِ مِنْ شَرِّها».

ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «جنێو بە با مەدەن،

چونکە لەلایەن خواوە دێت، هەم بە ڕەحمەتەوە دێت و هەمیش بە سزا، بەڵکوو داوای خێروبێری بایەکە لە خوا بکەن و لە شەڕ و خراپەکانی پەنا بە خوا بگرن».

## بَابُ مَا يُسْتَحَبُّ مِنَ الْأَسْمَاءِ

باسی ئەو ناوانەی خۆشەویستن و سوننەتن بۆ ناونان

٧٣٥. عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «أَحَبُّ الْأَسْمَاءِ إِلَى اللَّه ﷻ: عَبْدُ اللَّه، وَعَبْدُ الرَّحْمَنِ».

ئیبن عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: «خۆشەویسترین ناو لەلای خوا ﷻ بریتییە لە: عەبدوڵڵا و عەبدوڕڕەحمان».

## بَابُ مَا يُكْرَه مِنَ الْأَسْمَاءِ

باسی ئەو ناوانەی کە ناپەسندن

٧٣٦. عَنْ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه ﷺ: «لَئِنْ عِشْتُ إِنْ شَاءَ اللَّه، لَأَنْهَيَنَّ أَنْ يُسَمَّى: رَبَاحٌ، وَنَجِيحٌ، وَأَفْلَحُ، وَنَافِعٌ، وَيَسَارٌ».

عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «ئەگەر خوا پێی خۆش بێت و بژیم، ئەوە ناونانی: (رباح) و (نجیح) و (أفلح) و (نافع) و (یسار)تان لێ قەدەغە دەکەم».

## بَابُ الْجَمْعِ بَيْنَ اسْمِ النَّبِيِّ ﷺ وَكُنْيَتِه

باسی ناونان بە نازناو و ناوی پێغەمبەر ﷺ

٧٣٧. عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّه ﷺ، بِالْبَقِيعِ فَنَادَى رَجُلٌ رَجُلاً يَا أَبَا

الْقَاسِمِ فَالْتَفَتَ إِلَيْه رَسُولُ اللَّه ﷺ، فَقَالَ: إِنِّي لَمْ أَعْنِكَ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّه ﷺ: «تَسَمَّوْا بِاسْمِي، وَلَا تَكَنَّوْا بِكُنْيَتِي».

ئەنەس ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ له بەقیع بوو، جا پیاوێک بانگی پیاوێکی کرد (و گوتی): ئەی ئەبولقاسیم، پێغەمبەری خوا ﷺ ئاوڕی لێ دایەوە، پیاوەکەش گوتی: مەبەستم جەنابت نەبوو، بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: «بە ناوی من ناوی منداڵەکانتان بنێن، بەڵام نازناوم مەکەن بە نازناو بۆخۆتان».

## بَابُ الْمَدْحِ

### باسی پیاهەڵدان

٧٣٨. عَنِ الْمِقْدَادِ بْنِ عَمْرٍو ﷺ قَالَ: أَمَرَنَا رَسُولُ اللَّه ﷺ أَنْ نَحْثُوَ فِي وُجُوه الْمَدَّاحِينَ التُّرَابَ.

میقدادی کوڕی عەمرِ ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێ کردووین کەوا خۆڵ و گڵ بپرژێنینە دەموچاوی ئەو کەسەی کە پیاهەڵدان دەکات.

٧٣٩. عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي بَكْرَةَ، عَنْ أَبِيه ﷺ قَالَ: مَدَحَ رَجُلٌ رَجُلًا عِنْدَ رَسُولِ اللَّه ﷺ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّه ﷺ: «وَيْحَكَ قَطَعْتَ عُنُقَ صَاحِبِكَ» مِرَارًا، ثُمَّ قَالَ: «إِنْ كَانَ أَحَدُكُمْ مَادِحًا أَخَاه فَلْيَقُلْ: أَحْسِبُه وَلَا أُزَكِّي عَلَى اللَّه أَحَداً».

عەبدوڕڕەحمانی کوڕی ئەبو بەکرە لە باوکیەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، گوتوویەتی: پیاوێک لە خزمەتی پێغەمبەری خوادا ﷺ بە پیاوێکی دیکەیدا هەڵدا (مەدحی کرد)، بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: «هاوار بۆ تۆ! گەردنی هاوڕێکەت بڕی»، چەند جار وای فەرموو، پاشان فەرمووی: «ئەگەر یەکێکتان ویستی مەدحی براکەی بکات، با بڵێت: وا دەزانم (ئاوا و ئاوا باشە)، بە هیچ جۆرێک لە جێگای خوا پاکانەی بۆ ناکەم (واتە: بەگومانەوە باسی بکات و مەدحی بکات، چونکە پاکانەکردن بۆ بەندەکان تەنها مافی خوایە)».

## بَابُ الْمُسْتَشَارُ مُؤْتَمَنٌ

### باسی ڕاوێژکار جێی متمانەیە

٧٤٠. عَنْ أَبِي هرَيْرَةَ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه ﷺ: «الْمُسْتَشَارُ مُؤْتَمَنٌ».

ئەبو هوڕەیرە ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «ڕاوێژکار جێگای متمانەیە و پێویستە بەمتمانە و ڕاستییەوە وەڵام بداتەوە».

## بَابُ الشِّعْرِ

### باسی شیعر (هۆنراوە)

٧٤١. عَنْ أُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ ﵁: أَنَّ رَسُولَ اللَّه ﷺ قَالَ: «إِنَّ مِنَ الشِّعْرِ حِكْمَةً».

ئوبەی کوڕی کەعب ﵁ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «بەڕاستی هۆنراوەی وا هەیە دانایی و لێزانی تێدایە».

## بَابُ مَا كُرِه مِنَ الشِّعْرِ

### باسی ئەو شتانەی ناپەسندن لە شیعردا

٧٤٢. عَنْ سَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ ﵁: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «لَأَنْ يَمْتَلِئَ جَوْفُ أَحَدِكُمْ قَيْحًا حَتَّى يَرِيَه، خَيْرٌ لَه مِنْ أَنْ يَمْتَلِئَ شِعْرًا».

سەعدی کوڕی ئەبو وەققاص ﵁ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: «لەڕاستیدا ئەگەر یەکێکتان نێوسکی پڕ بێت لە کێم و زوخاو و تاکوو نێوسکی وێران بکات بۆی باشترە لەوەی کە پڕی بکات لە شیعر».

## بَابُ كَرَاهِيَةِ الْوَحْدَةِ

باسی ناپەسندی تەنیابوون

٧٤٣. عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَوْ يَعْلَمُ أَحَدُكُمْ مَا فِي الْوَحْدَةِ، مَا سَارَ أَحَدٌ بِلَيْلٍ وَحْدَه».

ئیبن عومەر ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «ئەگەر یەکێکتان بزانن تەنیایی چۆنە و چی تێدایە، ئەوە هەرگیز هیچ کەس شەوانە بەتەنیا نەدەڕۆیشت بە ڕێگادا».

## بَابُ إِطْفَاءِ النَّارِ عِنْدَ الْمَبِيتِ

باسی کوژاندنەوەی ئاگر لە کاتی نوستندا

٧٤٤. عَنْ سَالِمٍ، عَنْ أَبِيه ﷺ: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «لَا تَتْرُكُوا النَّارَ فِي بُيُوتِكُمْ حِينَ تَنَامُونَ».

سالیم لە باوکیەوە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: «کاتێک کە دەخەون ئاگر لە ماڵەکانتان بەجێ مەهێڵن (بیکوژێننەوە)».

## بَابُ لَا يَتَنَاجَى اثْنَانِ دُونَ الثَّالِثِ

باسی بەنهێنی قسەکردنی دوو کەس جیا لە کەسی سێیەم

٧٤٥. عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا كُنْتُمْ ثَلَاثَةً فَلَا يَتَنَاجَى اثْنَانِ دُونَ صَاحِبِهِمَا، فَإِنَّ ذَلِكَ يَحْزُنُه».

عەبدوڵلا ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «هەرکاتێک بوون بە سێ

کەس، ئەوە با دووانیان بەبێ هاوڕێکەیان چپەچپ نەکەن، چونکە ئەو کارە دڵتەنگی دەکات».

## بَابُ ثَوَابِ الْقُرْآنِ

### باسی پاداشتی قورئان

٧٤٦. عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «يُقَالُ لِصَاحِبِ الْقُرْآنِ إِذَا دَخَلَ الْجَنَّةَ اقْرَأْ وَاصْعَدْ، فَيَقْرَأُ وَيَصْعَدُ بِكُلِّ آيَةٍ دَرَجَةً حَتَّى يَقْرَأَ آخِرَ شَيْءٍ مَعَه».

ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «هەرکات قورئانخوێن چووە نێو بەهەشت پێی دەگوترێت: بخوێنە و بەسەر پلەکانی بەهەشتدا سەر بکەوە، ئەویش قورئان دەخوێنێت و لەگەڵ هەر ئایەتێک پلەیەک سەر دەکەوێت، هەتاکوو کۆتا ئایەت کە لەبەریەتی دەیخوێنێت».

٧٤٧. عَنْ أَبِي هرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «{قُلْ هوَ اللَّه أَحَدٌ}، تَعْدِلُ ثُلُثَ الْقُرْآنِ».

ئەبو هوڕەیرە ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «{قُلْ هوَ اللَّه أَحَدٌ} (سووڕەتی: الإخلاص)، بەرانبەرە بە سێیەکی قورئان».

## بَابُ فَضْلِ الذِّكْرِ

### باسی پێگە و گەورەیی زیکر کردن

٧٤٨. عَنْ أَبِي الدَّرْدَاءِ ﷺ: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «أَلَا أُنَبِّئُكُمْ بِخَيْرِ أَعْمَالِكُمْ وَأَرْضَاها عِنْدَ مَلِيكِكُمْ، وَأَرْفَعِها فِي دَرَجَاتِكُمْ، وَخَيْرٍ لَكُمْ مِنْ إِعْطَاءِ الذَّهبِ وَالْوَرِقِ، وَمِنْ

أَنْ تَلْقَوْا عَدُوَّكُمْ فَتَضْرِبُوا أَعْنَاقَهِمْ، وَيَضْرِبُوا أَعْنَاقَكُمْ؟» قَالُوا: وَمَا ذَاكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: «ذِكْرُ اللَّهِ»، وَقَالَ مُعَاذُ بْنُ جَبَلٍ: مَا عَمِلَ امْرُؤٌ بِعَمَلٍ أَنْجَى لَه مِنْ عَذَابِ اللَّهِ ﷻ مِنْ ذِكْرِ اللَّهِ.

ئەبو دەرداء ﵁ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: «ئایا باشترینی کردەوەکانتان پێ بڵێم، کە زیاتر لە هەموویان جێگای ڕەزامەندی خوای خاوەن و پەروەردگارتانە و هۆی بەرزترین پلەتانە و لە بەخشینی زێڕ و زیو بۆتان باشترە، چاکترە بۆتان لەوەی کە بە دوژمنتان بگەن و لە گەردنیان بدەن و لە گەردنتان بدەن؟»، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ جا ئەوە چییە (ئاوا پاداشتی هەیە)؟ فەرمووی: «یادی خوا»، وە موعازی کوڕی جەبەل ﵁ گوتی: هیچ کردەوەیەکی مرۆڤ بۆ ڕزگاربوون لە سزای خوا ﷻ ناگاتە یادی خوا.

٧٤٩. عَنْ أَبِي هرَيْرَةَ وَأَبِي سَعِيدٍ ﵄ يَشْهَدَانِ بِه عَلَى النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «مَا جَلَسَ قَوْمٌ مَجْلِسًا يَذْكُرُونَ اللَّهَ فِيه إِلَّا حَفَّتْهمُ الْمَلَائِكَةُ، وَتَغَشَّتْهمُ الرَّحْمَةُ، وَتَنَزَّلَتْ عَلَيْهِمُ السَّكِينَةُ، وَذَكَرَهمُ اللَّهُ فِيمَنْ عِنْدَه».

ئەبو هوڕەیرە و ئەبو سەعید ﵄ شاهیدی دەدەن کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: «بێگومان هەر کۆڕ و مەجلیسێک کە دادەنیشن و یادی خوای تێدا دەکەن ئەوە فریشتەکان دەوریان دەدەن و ڕەحمەت و میهرەبانی خوا دایاندەپۆشێت و ئارامی و دڵنەوایی دادەبەزێتە سەریان، خوا لەلای ئەوانەی کە لەلای زاتی خوان باسیان دەکات».

٧٥٠. عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ بُسْرٍ ﵁: أَنَّ أَعْرَابِيًّا قَالَ لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ: إِنَّ شَرَائِعَ الْإِسْلَامِ قَدْ كَثُرَتْ عَلَيَّ، فَأَنْبِئْنِي مِنْها بِشَيْءٍ أَتَشَبَّثُ بِه قَالَ: «لَا يَزَالُ لِسَانُكَ رَطْبًا مِنْ ذِكْرِ اللَّهِ ﷻ».

عەبدوڵڵای کوڕی بوسر ﵁ دەگێڕێتەوە: دەشتەکییەک بە پێغەمبەری خوای ﷺ گوت: بەڕاستی دروشم و شیعارەکانی ئیسلام لەسەر من زۆر بوون، جا ئەگەر شتێکم پێ بفەرموویت کە بەبەردەوامی دەستی پێوە بگرم، فەرمووی: «با هەمیشە

زمانت پاراو بێت بە یادی خوا ﷻ».

## بَابُ فَضْلِ لَا إِلَه إِلَّا اللَّه

### باسی پێگە و گەورەیی: لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ

٧٥١. عَنْ مُعَاذِ بْنِ جَبَلٍ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه ﷺ: «مَا مِنْ نَفْسٍ تَمُوتُ تَشْهدُ أَنْ لَا إِلَه إِلَّا اللَّه وَأَنِّي رَسُولُ اللَّه ﷺ، يَرْجِعُ ذَلِكَ إِلَى قَلْبِ مُوقِنٍ إِلَّا غَفَرَ اللَّه لَها».

موعازی کوڕی جەبەل ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «هیچ کەسێک نییە کە بمرێت و شایەتی بدات کە هیچ پەرستراوێکی بەهەق نییە جگە لە زاتی خوا، شایەتی بدات کە من پێغەمبەری خوام ﷺ، ئەوەش لە دڵێکی پڕ لە یەقینەوە بڵێت، حەتمەن خوا لێی خۆش دەبێت».

## بَابُ فَضْلِ التَّسْبِيحِ

### باسی پێگە و گەورەیی تەسبیحات

٧٥٢. عَنْ أَبِي هرَيْرَةَ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه ﷺ: «مَنْ قَالَ: سُبْحَانَ اللَّه وَبِحَمْدِه مِائَةَ مَرَّةٍ، غُفِرَتْ لَه ذُنُوبُه، وَلَوْ كَانَتْ مِثْلَ زَبَدِ الْبَحْرِ».

ئەبو هوڕەیرە ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «هەر کەسێک سەد جار بڵێت: (سُبْحَانَ اللَّه وَبِحَمْدِه)، ئەوە لە گوناهەکانی دەبووردرێت ئەگەر بەئەندازەی کەفی دەریاش بن».

## بَابُ الِاسْتِغْفَارِ

### باسی داواکردنی لێخۆشبوون

٧٥٣. عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﵄ قَالَ: إِنْ كُنَّا لَنَعُدُّ لِرَسُولِ اللَّه ﷺ فِي الْمَجْلِسِ يَقُولُ: «رَبِّ اغْفِرْ لِي وَتُبْ عَلَيَّ إِنَّكَ أَنْتَ التَّوَّابُ الرَّحِيمُ»، مِائَةَ مَرَّةٍ.

ئیبن عومەر ﵄ دەڵێت: ئێمە لە مەجلیس و کۆڕی پێغەمبەری خوادا ﷺ حیسابمان دەکرد کە سەد جار دەیفەرموو: «رَبِّ اغْفِرْ لِي وَتُبْ عَلَيَّ إِنَّكَ أَنْتَ التَّوَّابُ الرَّحِيمُ».

# كِتَابُ الدُّعَاءِ

## پەرتووکی دوعا و پاڕانەوە

### بَابُ فَضْلِ الدُّعَاءِ

#### باسی پێگە و گەورەیی پاڕانەوە

٧٥٤. عَنِ النُّعْمَانِ بْنِ بَشِيرٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ الدُّعَاءَ هوَ الْعِبَادَةُ»، ثُمَّ قَرَأَ: «{وَقَالَ رَبُّكُمُ ادْعُونِي أَسْتَجِبْ لَكُمْ} غافر: ٦٠».

نوعمانی کوڕی بەشیر ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «بێگومان پاڕانەوە پەرستشە»، پاشان (ئەم ئایەتەی) خوێندەوە: «**{وَقَالَ رَبُّكُمُ ادْعُونِي أَسْتَجِبْ لَكُمْ}**، واتە: وە پەروەردگارتان فەرموویەتی: لێم بپاڕێنەوە وەڵامتان دەدەمەوە».

### بَابُ دُعَاءِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ

#### باسی پاڕانەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ

٧٥٥. عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ: عَنِ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّه كَانَ يَقُولُ: «اللَّهمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ الْهدَى،

وَالتُّقَى، وَالْعَفَافَ، وَالْغِنَى».

عەبدوڵڵا ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ دەیفەرموو: «خوایە داوای ڕێنمویی و پارێزگاری و دەست و دەم و داوێنپاکی و بێنیازیت لێ دەکەم».

٧٥٦. عَنْ أَبِي بَكْرٍ الصِّدِّيقِ ﷺ أَنَّه قَالَ لِرَسُولِ اللَّه ﷺ: عَلِّمْنِي دُعَاءً أَدْعُو بِه فِي صَلَاتِي، قَالَ: «قُلْ: اللَّهمَّ إِنِّي ظَلَمْتُ نَفْسِي ظُلْمًا كَثِيرًا، وَلَا يَغْفِرُ الذُّنُوبَ إِلَّا أَنْتَ، فَاغْفِرْ لِي مَغْفِرَةً مِنْ عِنْدِكَ، وَارْحَمْنِي إِنَّكَ أَنْتَ الْغَفُورُ الرَّحِيمُ».

ئەبو بەکری صیدیق ﷺ دەگێڕێتەوە: بە پێغەمبەری خوای ﷺ گوتووە: پاڕانەوەیەکم فێر بکە کە لەنێو نوێژەکانمدا پێی بپاڕێمەوە، فەرمووی: «بڵێ: خوایە من زوڵم و ستەمی زۆرم لە خۆم کردووە، جگە لە تۆ کەسیش لە گوناهـ و تاوان خۆش نابێت، لێخۆشبوونی خۆتم پێ ببەخشە لەلایەن خۆتەوە، وە بەزەییت پێمدا بێتەوە، هەر خۆت خاوەنی لێخۆشبوون و بەزەیی و میهرەبانیت».

٧٥٧. عَنْ أَبِي هرَيْرَةَ ﷺ يَقُولُ: كَانَ رَسُولُ اللَّه ﷺ يَقُولُ: «اللَّهمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْأَرْبَعِ: مِنْ عِلْمٍ لَا يَنْفَعُ، وَمِنْ قَلْبٍ لَا يَخْشَعُ، وَمِنْ نَفْسٍ لَا تَشْبَعُ، وَمِنْ دُعَاءٍ لَا يُسْمَعُ».

ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: «خوایە گیان پەنا بە تۆ دەگرم لە چوار شت: لە زانستێک کە سوودی نەبێت، لە دڵێک کە تەقوا و خواپەرستی تێدا نەبێت، لەسەر سووربوون و تێرنەبوون لە هەوا و ئارەزووەکانی دونیا، لە پاڕانەوەیەک کە وەڵام نەدرێتەوە».

## بَابُ مَا تَعَوَّذَ مِنْه رَسُولُ اللَّه ﷺ

### باسی ئەوەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ پەنای بە خوا گرتووە لێی

٧٥٨. عَنْ فَرْوَةَ بْنِ نَوْفَلٍ ﷺ قَالَ: سَأَلْتُ عَائِشَةَ ﷺ: عَنْ دُعَاءٍ كَانَ يَدْعُو بِه

رَسُولُ اللّه ﷺ، فَقَالَتْ: كَانَ يَقُولُ: «اللَّهمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّ مَا عَمِلْتُ، وَمِنْ شَرِّ مَا لَمْ أَعْمَلْ».

فەڕوەی کوڕی نەوفەل رضي الله عنه دەڵێت: پرسیارم لە عائیشە رضي الله عنها کرد دەربارەی پاڕانەوەیەک کە پێغەمبەری خوا ﷺ پێی دەپاڕایەوە، ئەویش گوتی: دەیفەرموو: «خوایە من پەنات پێ دەگرم لە خراپەی ئەوەی کە کردوومە و لە خراپەی ئەوەی نەمکردووە».

## بَابُ الدُّعَاءِ بِالْعَفْوِ وَالْعَافِيَةِ

## باسی پاڕانەوەی لێخۆشبوون و لەشساغی

٧٥٩. عَنْ أَوْسَطَ بْنِ إِسْمَاعِيلَ الْبَجَلِيِّ: أَنَّه سَمِعَ أَبَا بَكْرٍ رضي الله عنه حِينَ قُبِضَ النَّبِيُّ ﷺ يَقُولُ: قَامَ رَسُولُ اللَّه ﷺ فِي مَقَامِي هذَا عَامَ الْأَوَّلِ، ثُمَّ بَكَى أَبُو بَكْرٍ، ثُمَّ قَالَ: «عَلَيْكُمْ بِالصِّدْقِ، فَإِنَّه مَعَ الْبِرِّ وَهمَا فِي الْجَنَّةِ، وَإِيَّاكُمْ وَالْكَذِبَ، فَإِنَّه مَعَ الْفُجُورِ وَهمَا فِي النَّارِ، وَسَلُوا اللّه الْمُعَافَاةَ، فَإِنَّه لَمْ يُؤْتَ أَحَدٌ بَعْدَ الْيَقِينِ خَيْرًا مِنَ الْمُعَافَاةِ، وَلَا تَحَاسَدُوا، وَلَا تَبَاغَضُوا، وَلَا تَقَاطَعُوا، وَلَا تَدَابَرُوا، وَكُونُوا عِبَادَ اللّه إِخْوَانًا».

ئەوسەتی کوڕی ئیسماعیلی بەجەلی رضي الله عنه دەگێڕێتەوە: گوێی لە ئەبو بەکر رضي الله عنه بوو کاتێك پێغەمبەر ﷺ وەفاتی کرد دەیگوت: پێغەمبەری خوا ﷺ لە ساڵی یەکەمی کۆچی لەو شوێنەی من بەپێوە وەستا، پاشان ئەبو بەکر گریا، دواتر (ئەبو بەکر رضي الله عنه گوتی: پێغەمبەر ﷺ) فەرمووی: «پابەندی ڕاستگۆیی بن، چونکە بەڕاستی لەگەڵ چاکەکاریدایە و هەردووکیان لە بەهەشتدان، خۆتان بەدوور بگرن لە درۆ، چونکە بەڕاستی لەگەڵ خراپەکاریدایە و هەردووکیان لە ئاگردان، داوای لەشساغی و بێوەیی لە خوا بکەن، چونکە بێگومان هیچ کەسێك لەدوای بڕوا شتێکی پێ نەبەخشراوە کە خێرتر و چاکتر بێت لە لەشساغی، وە بەرانبەر یەکدی چاوچنۆک

مەبن و ڕق و قینەتان نەبێت بەرانبەر یەکدی و سیلەی خزمایەتی مەپچڕێنن و پشت لەیەکدی مەکەن، هەمووتان بەندەی خوا بن و برای یەکدی بن».

٧٦٠. عَنْ عَائِشَةَ ﵂ أَنَّهَا قَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّه، أَرَأَيْتَ إِنْ وَافَقْتُ لَيْلَةَ الْقَدْرِ مَا أَدْعُو؟ قَالَ: «تَقُولِينَ: اللَّهمَّ إِنَّكَ عَفُوٌّ تُحِبُّ الْعَفْوَ فَاعْفُ عَنِّي».

لە عائیشەوە ﵂ کە گوتوویەتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئەگەر وا ڕێک کەوت زانیم کە شەوەکە شەوی (ليلة القدر)ـە، ئایا چ دوعایەک بکەم؟ فەرمووی: «بڵێ: خوایە تۆ بەخشەری و بەخشینت پێخۆشە، سا خوایە لێم خۆش بە».

## بَابُ لَا يَقُولُ الرَّجُلُ: اللَّهمَّ اغْفِرْ لِي إِنْ شِئْتَ

### باسی ئەوە کە پیاو نابێت بڵێت: خوایە ئەگەر ویستت لێم خۆش بە

٧٦١. عَنْ أَبِي هرَيْرَةَ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه ﷺ: «لَا يَقُولَنَّ أَحَدُكُمْ: اللَّهمَّ اغْفِرْ لِي إِنْ شِئْتَ، وَلْيَعْزِمْ فِي الْمَسْأَلَةِ، فَإِنَّ اللَّه لَا مُكْرِه لَه».

ئەبو هورەیرە ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «با کەس لە ئێوە نەڵێت: ئەی خوایە ئەگەر ویستت لێم خۆش بە، بەڵکوو با بە بڕوابەخۆبوون و سووربوونەوە بپاڕێتەوە، چونکە کەس زۆری لەسەر خوا نییە».

## بَابُ اسْمِ اللَّه الْأَعْظَمِ

### باسی گەورەترین و بەرزترین ناوی خوا

٧٦٢. عَنْ عَبْدِ اللَّه بْنِ بُرَيْدَةَ، عَنْ أَبِيه ﵁ قَالَ: سَمِعَ النَّبِيُّ ﷺ رَجُلًا يَقُولُ: اللَّهمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ بِأَنَّكَ أَنْتَ اللَّه الْأَحَدُ الصَّمَدُ، الَّذِي لَمْ يَلِدْ وَلَمْ يُولَدْ، وَلَمْ يَكُنْ لَه كُفُوًا أَحَدٌ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّه ﷺ: «لَقَدْ سَأَلَ اللَّه بِاسْمِه الْأَعْظَمِ، الَّذِي إِذَا سُئِلَ بِه

أَعْطَى، وَإِذَا دُعِيَ بِهِ أَجَابَ».

عەبدوڵڵای كوڕی بوڕەیدە لە باوكیەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، گوتوویەتی: پێغەمبەر ﷺ گوێی لە پیاوێک بوو دەیگوت: خوایە من داوات لێ دەكەم بەوەی كە تۆ تاک و تەنیای و جێی نیازی، ئەو خوایەی كە نە كەسی لێ بووە و نە لە كەسیش بووە، كەس هاووێنە و هاوتای نییە، جا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: «بەڕاستی بە ناوە شكۆمەند و گەورەكەی خوا پاڕایەوە كە هەر كەسێك بەو ناوە داوای لێ بكات وەڵامی دەداتەوە، هەر كەسێك پێی بپاڕێتەوە نائومێدی ناكات و پاڕانەوەكەی گیرا دەكات».

## بَابُ كَرَاهِيَةِ الِاعْتِدَاءِ فِي الدُّعَاءِ

### باسی ناپەسندی تێپەڕاندن لە پاڕانەوەدا

٧٦٣. عَنْ أَبِي نَعَامَةَ ﷺ: أَنَّ عَبْدَ اللهِ بْنَ مُغَفَّلٍ، سَمِعَ ابْنَه يَقُولُ: اللَّهمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ الْقَصْرَ الْأَبْيَضَ عَنْ يَمِينِ الْجَنَّةِ، إِذَا دَخَلْتُها، فَقَالَ: أَيْ بُنَيَّ سَلِ اللهَ الْجَنَّةَ، وَعُذْ بِه مِنَ النَّارِ، فَإِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ يَقُولُ: «سَيَكُونُ قَوْمٌ يَعْتَدُونَ فِي الدُّعَاءِ».

ئەبو نەعامە ﷺ دەگێڕێتەوە: عەبدوڵڵای كوڕی موغەففەل گوێی لە كوڕەكەی بوو دەیگوت: خوایە گیان داوات لێ دەكەم ئەگەر چوومە نێو بەهەشت ئەو كۆشكە سپییەی لای ڕاستی بەهەشتم (پێ بدەی)، ئەویش گوتی: ئەی ڕۆڵەكەم داوای بەهەشت لە خوا بكە و پەنای پێ بگرە لە ئاگر، چونكە من گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: «لێرە بەدواوە خەڵكانێک پەیدا دەبن كە لە پاڕانەوەدا سنوور دەبەزێنن».

## بَابُ مَا يَدْعُو بِه الرَّجُلُ إِذَا أَصْبَحَ وَإِذَا أَمْسَى

### باسی ئەو زیكر و پاڕانەوەیەی مرۆڤ دەیكات لە بەیانی و ئێواران

٧٦٤. عَنْ أَبِي عَيَّاشٍ الزُّرَقِيِّ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: «مَنْ قَالَ حِينَ يُصْبِحُ

لَا إِلَه إِلَّا اللَّه وَحْدَه لَا شَرِيكَ لَه، لَه الْمُلْكُ، وَلَه الْحَمْدُ، وَهوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ، كَانَ لَه عَدْلَ رَقَبَةٍ مِنْ وَلَدِ إِسْمَاعِيلَ، وَحُطَّ عَنْه عَشْرُ خَطِيئَاتٍ، وَرُفِعَ لَه عَشْرُ دَرَجَاتٍ، وَكَانَ فِي حِرْزٍ مِنَ الشَّيْطَانِ حَتَّى يُمْسِيَ، وَإِذَا أَمْسَى فَمِثْلُ ذَلِكَ حَتَّى يُصْبِحَ»، قَالَ: فَرَأَى رَجُلٌ رَسُولَ اللَّه ﷺ فِيمَا يَرَى النَّائِمُ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّه، إِنَّ أَبَا عَيَّاشٍ يَرْوِي عَنْكَ كَذَا وَكَذَا، فَقَالَ: «صَدَقَ أَبُو عَيَّاشٍ».

ئەبو عەییاشی زوڕەقی ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «هەر کەسێك بەیانییان بڵێت: (لَا إِلَه إِلَّا اللَّه وَحْدَه لَا شَرِيكَ لَه، لَه الْمُلْكُ، وَلَه الْحَمْدُ، وَهوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ)، واتە: هیچ پەرستراوێکی بەهەق نییە جگە لە زاتی الله، تاکی بێ هاوبەشە، موڵک و ستاییش هەر بۆ ئەوە و شایستەی ئەوە، بەسەر هەموو شتێکدا بەتوانایە، وەک ئەوە وایە کۆیلەیەکی لە نەوەی ئیسماعیل ڕزگار کردبێت، دە خراپەی لەسەر دەسڕدرێتەوە و دە پلە بەرز دەکرێتەوە، لە شەیتان دەپارێزرێت تاکوو ئێوارە، ئەگەر ئێوارەش بیڵێت هەر وەک ئەوەی بۆ هەیە تاکوو بەیانی». (ڕاوی) دەڵێت: جا پیاوێک پێغەمبەری ﷺ لە خەودا بینی و گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئەبو عەییاش ئاوا و ئاوا لە تۆوە دەگێڕێتەوە، ئەویش فەرمووی: «ئەبو عەییاش ڕاستی گوتووە».

٧٦٥. عَنْ عُثْمَانَ بْنِ عَفَّانَ ﷺ يَقُولُ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّه ﷺ يَقُولُ: «مَا مِنْ عَبْدٍ يَقُولُ فِي صَبَاحِ كُلِّ يَوْمٍ، وَمَسَاءِ كُلِّ لَيْلَةٍ: بِسْمِ اللَّه الَّذِي لَا يَضُرُّ مَعَ اسْمِه شَيْءٌ فِي الْأَرْضِ وَلَا فِي السَّمَاءِ، وَهوَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ، ثَلَاثَ مَرَّاتٍ، فَيَضُرَّه شَيْءٌ»، قَالَ: وَكَانَ أَبَانُ قَدْ أَصَابَه طَرَفٌ مِنَ الْفَالِجِ، فَجَعَلَ الرَّجُلُ يَنْظُرُ إِلَيْه، فَقَالَ لَه أَبَانُ: مَا تَنْظُرُ إِلَيَّ؟ أَمَا إِنَّ الْحَدِيثَ كَمَا قَدْ حَدَّثْتُكَ، وَلَكِنِّي لَمْ أَقُلْه يَوْمَئِذٍ، لِيُمْضِيَ اللَّه عَلَيَّ قَدَرَه.

عوسمانی کوڕی عەففان ﷺ دەڵێت: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: «هەر کەسێک بەیانییان و ئێوارانی هەموو ڕۆژ و شەوێك سێ جار بڵێت: (بِسْمِ اللَّه الَّذِي لَا يَضُرُّ مَعَ اسْمِه شَيْءٌ فِي الْأَرْضِ وَلَا فِي السَّمَاءِ، وَهوَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ)، واتە: بە ناوی ئەو خوایەی کە لەگەڵ ناوی ئەودا هیچ شتێك زەرەر و زیان ناگەیەنێت

نە لە زەوی و نە لە ئاسماندا، ئەو خوایەی کە بیسەر و بینایە، ئەوە بێگومان هیچ شتێك زیانی پێ ناگەیەنێت». (ڕاوی) گوتی: ئەبان (کوڕی پێشەوا عوسمان) ئیفلیج بوو لایەکی جەستەی شەلەل لێی دا، جا ئەو پیاوە (کە فەرموودەکەی لێ بیستبوو) سەیری دەکرد (وەک ئەوەی بڵێت: خۆ تۆ ئەو ویردەت خوێندووە، ئەی بۆچی ئیفلیج بووی؟!)، ئەبان پێی گوت: ئەوە بۆچی بەو شێوەیە سەیرم دەکەی، سوێند بە خوا ئەو فەرموودەیە هەر وەکوو ئەوەیە کە بۆم گێڕاویەوە، بەڵام ئەو ڕۆژەی کە تووشی ئەو نەخۆشییە بووم نەمگوتبوو، تا ئەو قەدەرەی کە خوا بۆمی دانابوو بەسەرم بێت.

٧٦٦. عَنِ ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما يَقُولُ: لَمْ يَكُنْ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَدَعُ هؤُلَاءِ الدَّعَوَاتِ حِينَ يُمْسِي، وَحِينَ يُصْبِحُ: «اللَّهمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ الْعَفْوَ وَالْعَافِيَةَ فِي الدُّنْيَا وَالْآخِرَةِ، اللَّهمَّ أَسْأَلُكَ الْعَفْوَ وَالْعَافِيَةَ فِي دِينِي وَدُنْيَايَ وَأَهلِي وَمَالِي، اللَّهمَّ اسْتُرْ عَوْرَاتِي، وَآمِنْ رَوْعَاتِي، وَاحْفَظْنِي مِنْ بَيْنِ يَدَيَّ، وَمِنْ خَلْفِي، وَعَنْ يَمِينِي، وَعَنْ شِمَالِي، وَمِنْ فَوْقِي، وَأَعُوذُ بِكَ أَنْ أُغْتَالَ مِنْ تَحْتِي». قَالَ وَكِيعٌ: يَعْنِي الْخَسْفَ.



ئیبن عومەر رضي الله عنهما دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ هیچ ئێوارە و بەیانییەک وازی لەم پاڕانەوانە نەهێناوە: «اللَّهمَّ إني أَسْأَلُكَ الْعَفْوَ وَالْعَافيَةَ في الدُّنْيَا وَالْآخِرَةِ، اللَّهمَّ أَسْأَلُكَ الْعَفْوَ وَالْعَافيَةَ في دِينِي وَدُنْيَايَ وَأَهلِي وَمَالِي، اللَّهمَّ اسْتُرْ عَوْرَاتي، وَآمنْ رَوْعَاتي، وَاحْفَظْني منْ بَيْنِ يَدَيَّ، وَمنْ خَلْفِي، وَعَنْ يَمِينِي، وَعَنْ شِمَالِي، وَمنْ فَوْقِي، وَأَعُوذُ بِكَ أَنْ أُغْتَالَ منْ تَحْتِي، واتە: خوایە داوای لێخۆشبوون و پارێزگاریت لێ دەکەم لە دونیا و دواڕۆژدا، خوایە داوای لێخۆشبوون و پارێزگاریت لێ دەکەم لە دین و دونیا و خانەوادە و ماڵ و سامانمدا، خودایە عەیب و ناتەواوی و کەموکورتییەکانم دابپۆشە، خوایە ترسەکانم هێور بکەرەوە و دڵەڕاوکێکانم مەهێڵە، خوایە لە پێشەوە و لە دواوە و لای ڕاست و لای چەپ و لای سەروومەوە پارێزگاریم لێ بکە (واتە: لە هەموو ڕوویەکەوە بمپارێزە لە دەرد و بەڵای خەراپ)، خودایە پەنات پێ دەگرم کە لە ژێرمەوە سزا بدرێم بە ڕۆچوون بە زەویدا و لەناو بچم». وەکیع گوتی: واتە ڕۆچوون بە زەویدا.

٧٦٧. عَنْ عَبْدِ اللَّه بْنِ بُرَيْدَةَ، عَنْ أَبِيه رضي الله عنه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه ﷺ: «اللَّهمَّ أَنْتَ

رَبِّي لَا إِلَه إِلَّا أَنْتَ، خَلَقْتَنِي وَأَنَا عَبْدُكَ، وَأَنَا عَلَى عَهدِكَ وَوَعْدِكَ مَا اسْتَطَعْتُ، أَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّ مَا صَنَعْتُ، أَبُوءُ بِنِعْمَتِكَ، وَأَبُوءُ بِذَنْبِي فَاغْفِرْ لِي، فَإِنَّه لَا يَغْفِرُ الذُّنُوبَ إِلَّا أَنْتَ»، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه ﷺ: «مَنْ قَالَها فِي يَوْمِه وَلَيْلَتِه، فَمَاتَ فِي ذَلِكَ الْيَوْمِ، أَوْ تِلْكَ اللَّيْلَةِ، دَخَلَ الْجَنَّةَ، إِنْ شَاءَ اللَّه تَعَالَى».

عەبدوڵڵای کوڕی بوڕەیدە لە باوکیەوە ﵁ دەگێڕێتەوە، گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «خوایە تۆ پەروەردگاری منیت، هیچ پەرستراوێکی بەهەق نییە جگە لە زاتی تۆ، تۆ دروستت کردووم، منیش بەندەی تۆم، خوایە من لەسەر بەڵێن و پەیانەکەی خۆمم کە بە تۆم داوە ئەوەندەی لە توانامدا هەبێت، خودایە پەنات پێ دەگرم لە خراپەی ئەوەی ئەنجامم داوە، خوایە دان بەوەدا دەنێم کە تۆ بەخشش و نیعمەتت بەسەردا ڕشتووم، دانیش بە تاوانەکانمدا دەنێم و داوای لێخۆشبوونت لێ دەکەم، بێگومان جگە لە تۆ هیچ کەسێک لە تاوانەکان خۆش نابێت». (ڕاوی) گوتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: «هەر کەسێك بە ڕۆژ و بە شەو ئەم نزایە بخوێنێت و ئەو ڕۆژە یان ئەو شەوە بمرێت، ئەوە دەچێتە بەهەشتەوە ئەگەر خوا پێیخۆش بێت».



## بَابُ مَا يَدْعُو بِه إِذَا أَوَى إِلَى فِرَاشِه

### باسی زیکر و پاڕانەوەی کاتی چوونە سەر جێگای خەوتن

٧٦٨. عَنْ عَبْدِ اللَّه ﵁: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ إِذَا أَوَى إِلَى فِرَاشِه وَضَعَ يَدَه -يَعْنِي: الْيُمْنَى- تَحْتَ خَدِّه، ثُمَّ قَالَ: «قِنِي عَذَابَكَ يَوْمَ تَبْعَثُ -أَوْ تَجْمَعُ عِبَادَكَ-».

عەبدوڵڵا ﵁ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ کاتێ دەچووە سەر جێگای خەوەکەی دەستی -واتە: دەستی ڕاستی- دەخستە ژێر ڕوومەتی، پاشان دەیفەرموو: «خوایە بمپارێزە لە سزای خۆت ئەو ڕۆژەی کە بەندەکانت زیندوو دەکەیتەوە -یان کۆیان دەکەیتەوە-».

## بَابُ مَا يَدْعُو بِهِ إِذَا انْتَبَهَ مِنَ اللَّيْلِ

## باسی پاڕانەوە لە کاتی بەئاگاهاتن لە شەودا

٧٦٩. عَنْ رَبِيعَةَ بْنِ كَعْبٍ الْأَسْلَمِيِّ ﷺ: أَنَّه كَانَ يَبِيتُ عِنْدَ بَابِ رَسُولِ اللَّه ﷺ، وَكَانَ يَسْمَعُ رَسُولَ اللَّه ﷺ يَقُولُ مِنَ اللَّيْلِ: «سُبْحَانَ اللَّه رَبِّ الْعَالَمِينَ الْهوِيَّ، ثُمَّ يَقُولُ: سُبْحَانَ اللَّه وَبِحَمْدِه».

ڕەبیعەی کوڕی کەعبی ئەسلەمی ﷺ دەگێڕێتەوە: شەوانە لەبەردەم دەرگای ژوورەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ دەخەوت، گوێی لە پێغەمبەری خوا ﷺ دەبوو ماوەیەکی زۆر لە شەودا دەیفەرموو: «پاک و بێگەردی بۆ خوای پەروەردگاری جیهانییان»، پاشان دەیفەرموو: «پاک و بێگەردی و سوپاس و ستاییش هەر بۆ خوایە».



## بَابُ الدُّعَاءِ عِنْدَ الْكَرْبِ

## باسی پاڕانەوەی کاتی بەڵا و ناخۆشی

٧٧٠. عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يَقُولُ عِنْدَ الْكَرْبِ: «لَا إِلَه إِلَّا اللَّه الْحَلِيمُ الْكَرِيمُ، سُبْحَانَ اللَّه رَبِّ الْعَرْشِ الْعَظِيمِ، سُبْحَانَ اللَّه رَبِّ السَّمَوَاتِ السَّبْعِ، وَرَبِّ الْعَرْشِ الْكَرِيمِ». قَالَ وَكِيعٌ مَرَّةً: «لَا إِلَه إِلَّا اللَّه»، فِيها كُلِّها.

ئیبن عەبباس ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ لە کاتی بەڵا و ناخۆشیدا دەیفەرموو: «لَا إِلَه إِلَّا اللَّه الْحَلِيمُ الْكَرِيمُ، سُبْحَانَ اللَّه رَبِّ الْعَرْشِ الْعَظِيمِ، سُبْحَانَ اللَّه رَبِّ السَّمَوَاتِ السَّبْعِ، وَرَبِّ الْعَرْشِ الْكَرِيمِ، واتە: هیچ پەرستراوێکی بەهەق نییە جگە لە زاتی خوا، لێبووردەیە و بەخشندەیە، پاک و بێگەردی بۆ پەروەردگاری عەرشی گەورە و مەزن، پاک و بێگەردی بۆ پەروەردگاری حەوت ئاسمانەکان و پەروەردگاری عەرشی پیرۆز». وەکیع گوتی: لە هەر یەکێکیاندا جارێک (دەیفەرموو): «لَا إِلَه إِلَّا اللَّه». (واتە: بەم شێوەیە دەیفەرموو: «لَا إِلَه إِلَّا اللَّه الْحَلِيمُ الْكَرِيمُ، لَا إِلَه إِلَّا اللَّه

رَبُّ الْعَرْشِ الْعَظِيمِ، لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّه رَبُّ السَّمَوَاتِ السَّبْعِ، وَرَبُّ الْعَرْشِ الْكَرِيمِ»).

## بَابُ مَا يَدْعُو بِه الرَّجُلُ إِذَا خَرَجَ مِنْ بَيْتِه

### باسی ئەو زیکر و پاڕانەوەیەی مرۆڤ دەیکات کاتی چوونەدەر لە ماڵ

٧٧١. عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ ﵂: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ إِذَا خَرَجَ مِنْ مَنْزِلِه قَالَ: «اللَّهمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ أَنْ أَضِلَّ، أَوْ أَزِلَّ، أَوْ أَظْلِمَ أَوْ أُظْلَمَ، أَوْ أَجْهلَ أَوْ يُجْهلَ عَلَيَّ».

ئوم سەلەمە ﵂ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ کاتێك لە ماڵەکەی دەردەچوو دەیفەرموو: «خوایە پەنات پێ دەگرم لەوەی گومڕا ببم، یان لەخشتە ببرێم (پێم بخلیسکێت)، یان ستەم بکەم یان ستەمم لێ بکرێت یان نەفامی بکەم یان نەفامیم بەرانبەر بکرێت».

## بَابُ مَا يَدْعُو بِه الرَّجُلُ إِذَا سَافَرَ

### باسی ئەو زیکرەی مرۆڤ دەیکات لە کاتی گەشتکردن

٧٧٢. عَنْ عَبْدِ اللَّه بْنِ سَرْجِسَ ﵁ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّه ﷺ يَقُولُ -وَقَالَ: عَبْدُ الرَّحِيمِ: يَتَعَوَّذُ- إِذَا سَافَرَ: «اللَّهمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ وَعْثَاءِ السَّفَرِ، وَكَآبَةِ الْمُنْقَلَبِ، وَالْحَوْرِ بَعْدَ الْكَوْرِ، وَدَعْوَةِ الْمَظْلُومِ، وَسُوءِ الْمَنْظَرِ فِي الْأَهلِ وَالْمَالِ». وَزَادَ أَبُو مُعَاوِيَةَ: فَإِذَا رَجَعَ قَالَ: مِثْلَها.

عەبدوڵڵای کوڕی سەرجیس ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێك سەفەری دەکرد -وە عەبدوڕڕەحیم گوتی: پەنای بە خوا دەگرت- دەیفەرموو: «خوایە پەنا دەگرم بە تۆ لە ناڕەحەتی و ناسۆریی سەفەر و غەم و پەژارەی گەڕانەوە، وە پەنا دەگرم بە تۆ لە سەرلێشێوان دوای ڕێنمایی و گەڕانەوە لە بڕواوە بۆ بێبڕوایی، وە پەنا دەگرم بە تۆ لە پاڕانەوەی ستەملێکراو و لە بینینی شتێکی ناخۆش و نامۆ لەنێو ماڵ و منداڵم». ئەبو موعاویە لە گێڕانەوەکەیدا ئەوەی زیاد کردووە: کاتێك دەگەڕایەوە

(له گەشتەکەی) بە هەمان شێوەی دەفەرموو.

## بَابُ مَا يَدْعُو بِهِ الرَّجُلُ إِذَا رَأَى السَّحَابَ وَالْمَطَرَ

### باسی ئەو زیکر و پاڕانەوەیەی مرۆڤ دەیکات کاتی بینینی هەور و باران

٧٧٣. عَنْ عَائِشَةَ ﵂: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ إِذَا رَأَى الْمَطَرَ قَالَ: «اللَّهُمَّ اجْعَلْهُ صَيِّبًا هَنِيئًا».

عائیشه ﵂ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێك بارانی دەبینی دەیفەرموو: «خوایە گیان بیکە بە بارانێکی بەلێزمە و بەسوود».

# كِتَابُ تَعْبِيرِ الرُّؤْيَا

## پەرتووکی لێکدانەوەی خەون

### بَابُ الرُّؤْيَا الصَّالِحَةُ يَرَاهَا الْمُسْلِمُ أَوْ تُرَى لَه

باسی خەونی چاک و باش کە موسوڵمان دەیبینێ یان پێی دەبینرێ

٧٧٤. عَنْ أُمِّ كُرْزٍ الْكَعْبِيَّةِ ﵂ قَالَتْ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، يَقُولُ: «ذَهَبَتِ النُّبُوَّةُ، وَبَقِيَتِ الْمُبَشِّرَاتُ».

ئوم کوڕزی کەعبییە ﵂ دەڵێت: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: «پێغەمبەرایەتی نەما و تەواو بوو، بەڵام موژدەدەرەکان (ئەو شتانەی کە لە خەوندا دەبینرێن و دڵخۆشکەرن) هەر دەمێنن».

٧٧٥. عَنْ عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ ﵁ قَالَ: سَأَلْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، عَنْ قَوْلِ اللَّهِ سُبْحَانَه: {لَهُمُ الْبُشْرَى فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَفِي الْآخِرَةِ} يونس: ٦٤، قَالَ: «هِيَ الرُّؤْيَا الصَّالِحَةُ، يَرَاهَا الْمُسْلِمُ، أَوْ تُرَى لَه».

عوبادەی کوڕی صامیت ﵁ دەڵێت: پرسیارم لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد دەربارەی ئەم ئایەتەی خوا کە دەفەرموێت: {لَهُمُ الْبُشْرَى فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَفِي الْآخِرَةِ}، واتە: هەر بۆ ئەوانە مزگێنی و مووژدە لە ژیانی دونیادا و لە دوارۆژیشدا، ئەویش

فەرمووی: «ئەوە خەونی چاک و باشە کە موسوڵمان دەیبینێت یان پێوەی دەبینرێت».

٧٧٦. عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ قَالَ: كَشَفَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ السِّتَارَةَ فِي مَرَضِهِ، وَالنَّاسُ صُفُوفٌ خَلْفَ أَبِي بَكْرٍ، فَقَالَ: «أَيُّها النَّاسُ إِنَّه لَمْ يَبْقَ مِنْ مُبَشِّرَاتِ النُّبُوَّةِ إِلَّا الرُّؤْيَا الصَّالِحَةُ، يَرَاها الْمُسْلِمُ، أَوْ تُرَى لَه».

ئیبن عەبباس ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ لە کاتی نەخۆشییەکەیدا (کە لەماڵەوە بوو) پەردەی لادا و تەماشای کرد خەڵکی لەپشت ئەبو بەکرەوە ڕیزیان بەستووە (بۆ نوێژ)، جا فەرمووی: «ئەی خەڵکینە نیشانەی موژدەدەرانی پێغەمبەرایەتی نەماون بێجگە لە خەونی چاک کە موسوڵمان دەیبینێت یان پێوەی دەبینرێت».

## بَابُ رُؤْيَةِ النَّبِيِّ ﷺ فِي الْمَنَامِ

### باسی بینینی پێغەمبەر ﷺ لە خەودا

٧٧٧. عَنْ جَابِرٍ ﷺ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ أَنَّه قَالَ: «مَنْ رَآنِي فِي الْمَنَامِ، فَقَدْ رَآنِي، إِنَّه لَا يَنْبَغِي لِلشَّيْطَانِ أَنْ يَتَمَثَّلَ فِي صُورَتِي».

جابیر ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «هەر کەسێك لە خەودا بمبینێت ئەوە بەڕاستی منی بینیوە، چونکە بێگومان شەیتان ناتوانێت و بۆی نییە خۆی بخاتە سەر شێوەی من».

## بَابُ مَنْ رَأَى رُؤْيَا يَكْرَهها

### باسی کەسێك کە خەونێك دەبینێت و پێیناخۆشە

٧٧٨. عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ: عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ أَنَّه قَالَ: «إِذَا رَأَى أَحَدُكُمُ الرُّؤْيَا يَكْرَهها، فَلْيَبْصُقْ عَنْ يَسَارِه ثَلَاثًا، وَلْيَسْتَعِذْ بِاللَّهِ مِنَ الشَّيْطَانِ ثَلَاثًا،

وَلْيَتَحَوَّلْ عَنْ جَنْبِهِ الَّذِي كَانَ عَلَيْه».

جابیری کوڕی عەبدوڵلا ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «کاتێك یەکێك لە ئێوە خەونێکی بینی کە پێیناخۆش بوو و بێزاری کرد، ئەوە با لەلای چەپیەوە سێ جار تف بکات، سێ جار پەنا بە خوا بگرێت لە شەیتان، با باری نوستنەکەی بگۆڕێت و بە لاکەی دیکەدا بخەوێت».

## بَابُ الرُّؤْيَا إِذَا عُبِرَتْ وَقَعَتْ، فَلَا يَقُصُّها إِلَّا عَلَى وَادٍّ

باسی ئەوە کە خەون مانا کرا دێتە دی،
بۆیە با نەیگێڕێتەوە تەنها لای کەسی خۆشەویست نەبێت

٧٧٩. عَنْ أَبِي رَزِينٍ ﷺ: أَنَّه سَمِعَ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ: «الرُّؤْيَا عَلَى رِجْلِ طَائِرٍ، مَا لَمْ تُعْبَرْ، فَإِذَا عُبِرَتْ وَقَعَتْ»، قَالَ: «وَالرُّؤْيَا جُزْءٌ مِنْ سِتَّةٍ وَأَرْبَعِينَ جُزْءًا مِنَ النُّبُوَّةِ» -قَالَ: وَأَحْسِبُه قَالَ:- «لَا يَقُصُّها إِلَّا عَلَى وَادٍّ أَوْ ذِي رَأْيٍ».

ئەبو ڕەزین ﷺ دەگێڕێتەوە: گوێی لە پێغەمبەر ﷺ بوو دەیفەرموو: «خەون قەرار ناگرێت و نایەتە دی ئەگەر پیاو باسی نەکات و لێکدانەوەی بۆ نەکات، بەڵام ئەگەر باسی بکات و لێکدانەوەی بۆ بکات دێتە دی»، فەرمووی: «خەون بەشێکە لە چل و شەش بەشی پێغەمبەرایەتی» -(ڕاوی) گوتی: وا بزانم فەرمووی:- «با خەوەکەی نەگێڕێتەوە تەنها بۆ کەسی خۆشەویست و نزیکی نەبێت یان بۆ کەسێك کە شارەزا بێت لە لێکدانەوەی خەون».

## بَابُ مَنْ تَحَلَّمَ حُلُمًا كَاذِبًا

باسی کەسێك کە بەدرۆ بڵێت: خەونێکی ئاوا و ئاوم دیوە

٧٨٠. عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه ﷺ: «مَنْ تَحَلَّمَ حُلُمًا كَاذِبًا، كُلِّفَ أَنْ يَعْقِدَ بَيْنَ شَعِيرَتَيْنِ، وَيُعَذَّبُ عَلَى ذَلِكَ».

ئیبن عەبباس ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «هەر کەسێك بەدرۆ بڵێت: خەونێکی ئاوا و ئاوام دیوە، ئەوە لە ڕۆژی دواییدا ڕادەسپێردرێت کە نێوانی دوو دەنکە جۆ پێکەوە گرێ بدات، لەسەر ئەوەش سزا دەدرێت».

## بَابُ أَصْدَقُ النَّاسِ رُؤْيَا أَصْدَقُهمْ حَدِيثًا

### باسی ئەوەی کە ڕاستترین خەون خەونی ئەو کەسانەیە کەوا ڕاستگۆن

٧٨١. عَنْ أَبِي هرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه ﷺ: «إِذَا قَرُبَ الزَّمَانُ لَمْ تَكَدْ رُؤْيَا الْمُؤْمِنِ تَكْذِبُ، وَأَصْدَقُهم رُؤْيَا أَصْدَقُهمْ حَدِيثًا، وَرُؤْيَا الْمُؤْمِنِ جُزْءٌ مِنْ سِتَّةٍ وَأَرْبَعِينَ جُزْءًا مِنَ النُّبُوَّةِ».

ئەبو هوڕەیرە ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «کاتێ ڕۆژگار نزیک بۆوە (واتە: کۆتایی هاتنی دونیا) زۆر نزیکە خەونی ئیماندار ڕاست دەربچێت و کەمجار درۆ دەربچێت، ڕاسترین خەون خەونی ئەو کەسانەیە کە ڕاستگۆترینن، خەونی ئیماندار بەشێکە لە چل و شەش بەشی پێغەمبەرایەتی».

## بَابُ تَعْبِيرِ الرُّؤْيَا

### باسی لێکدانەوەی خەون

٧٨٢. عَنْ أَبِي هرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه ﷺ: «رَأَيْتُ فِي يَدِي سِوَارَيْنِ مِنْ ذَهبٍ، فَنَفَخْتُهمَا، فَأَوَّلْتُهمَا هذَيْنِ الْكَذَّابَيْنِ: مُسَيْلِمَةَ، وَالْعَنْسِيَّ».

ئەبو هوڕەیرە ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «لە خەومدا بینیم دوو بازنەی زێڕم لەدەستدا بوو، منیش فووم لێ کردن، ئەو دوو بازنەم بە دوو درۆزن لێک دایەوە کە موسەیلەمە و عەنسی بوون».

٧٨٣. عَنْ عَبْدِ اللَّه بْنِ عُمَرَ ﷺ عَنْ رُؤْيَا النَّبِيِّ ﷺ، قَالَ: «رَأَيْتُ امْرَأَةً سَوْدَاءَ

ثَائِرَةَ الرَّأْسِ، خَرَجَتْ مِنَ الْمَدِينَةِ حَتَّى قَامَتْ بِالْمَهيَعَةِ، وَهِيَ الْجُحْفَةُ، فَأَوَّلْتُها وَبَاءَ بِالْمَدِينَةِ، فَنُقِلَ إِلَى الْجُحْفَةِ».

عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ لەبارەی خەوەکەی پێغەمبەرەوە ﷺ (لە پێغەمبەرەوە ﷺ) گێڕاویەتەوە، فەرموویەتی: «لە خەومدا ئافرەتێکی ڕەشتاڵەم بینی کە قژی پەرشوبڵاو بوو، لە مەدینە دەرچوو تاکوو گەیشتە مەهیەعە، کە جوحفەیە (شوێنێکە)، وە منیش خەوەکەم بەوە لێک دایەوە کە پەتایەکە لە مەدینەوە دەگوازرێتەوە بۆ جوحفە».

# كِتَابُ الْفِتَنِ

## پەرتووکی ئاشووب و ئاژاوە

### بَابُ حُرْمَةِ دَمِ الْمُؤْمِنِ وَمَالِهِ

### باسی پارێزراویی خوێن و ماڵی بڕوادار

٧٨٤. عَنْ أَبِي سَعِيدٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه ﷺ، فِي حَجَّةِ الْوَدَاعِ: «أَلَا إِنَّ أَحْرَمَ الْأَيَّامِ يَوْمُكُمْ هذَا، أَلَا وَإِنَّ أَحْرَمَ الشُّهورِ شَهرُكُمْ هذَا، أَلَا وَإِنَّ أَحْرَمَ الْبَلَدِ بَلَدُكُمْ هذَا، أَلَا وَإِنَّ دِمَاءَكُمْ وَأَمْوَالَكُمْ عَلَيْكُمْ حَرَامٌ، كَحُرْمَةِ يَوْمِكُمْ هذَا، فِي شَهرِكُمْ هذَا، فِي بَلَدِكُمْ هذَا، أَلَا هلْ بَلَّغْتُ؟»، قَالُوا: نَعَمْ، قَالَ: «اللَّهمَّ اشْهدْ».

ئەبو سەعید ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ لە حەجی ماڵئاواییدا فەرمووی: «ئاگادار بن لە حەرامترین ڕۆژەکان ئەمڕۆتانە، وریا بن لە حەرامترین مانگەکانتان ئەم مانگەتانە، ئاگادار بن لە حەرامترین شارەکانتان ئەم شارەیە، وریا بن کە خوێن و ماڵتان بۆ یەکدی حەرامە، وەکوو حەرامی ئەو ڕۆژەتان لەو مانگەتاندا و لەو شارەتاندا، (پاشان فەرمووی:) ئایا گەیاندم؟»، گوتیان: بەڵێ، فەرمووی: «خوایە شایەت بە».

٧٨٥. عَنْ فَضَالَةَ بْنِ عُبَيْدٍ ﷺ: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «الْمُؤْمِنُ مَنْ أَمِنَه النَّاسُ عَلَى

أَمْوَالِهِمْ وَأَنْفُسِهِمْ، وَالْمُهاجِرُ مَنْ هجَرَ الْخَطَايَا وَالذُّنُوبَ».

فەزالەی کوڕی عوبەید ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: «بڕوادار ئەو کەسەیە خەڵکی بۆ ماڵ و نەفسی خۆیان لێی دڵنیا بن، کۆچکەر ئەو کەسەیە کە وازی هێناوە لە گوناهـ و تاوانکردن».

## بَابُ النَّهيِ عَنِ النُّهبَةِ

### باسی ڕێگریکردن لە شتفڕاندن

٧٨٦. عَنْ أَبِي هرَيْرَةَ ﷺ: أَنَّ رَسُولَ اللَّه ﷺ قَالَ: «لَا يَزْنِي الزَّانِي حِينَ يَزْنِي وَهوَ مُؤْمِنٌ، وَلَا يَشْرَبُ الْخَمْرَ حِينَ يَشْرَبُها وَهوَ مُؤْمِنٌ، وَلَا يَسْرِقُ السَّارِقُ حِينَ يَسْرِقُ وَهوَ مُؤْمِنٌ، وَلَا يَنْتَهِبُ نُهبَةً يَرْفَعُ النَّاسُ إِلَيْه أَبْصَارَهمْ حِينَ يَنْتَهبُها وَهوَ مُؤْمِنٌ».

ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «زیناکار لەکاتی زیناکردندا ئیمانی نییە، شەڕابخۆر لە کاتی شەڕابخواردنەوەدا ئیمانی نییە، وە دز لە کاتی دزیکردندا ئیمانی نییە، ئەو کەسەشی کە بەئاشکرا شت دەفڕێنێ و لە کاتی شت فڕاندنەکەیدا خەڵکی چاویان لێیەتی و دەیبینن ئیمانی نییە».

## بَابُ سِبَابُ الْمُسْلِمِ فُسُوقٌ، وَقِتَالُه كُفْرٌ

### باسی جنێودان بە موسوڵمان دەرچوونە لە فەرمانی خوا و شەڕ لەگەڵکردنیشی کوفرە

٧٨٧. عَنِ ابْنِ مَسْعُودٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه ﷺ: «سِبَابُ الْمُسْلِمِ فُسُوقٌ، وَقِتَالُه كُفْرٌ».

ئیبن مەسعود ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «جنێودان بە موسوڵمان دەرچوونە لە فەرمانی خوا و شەڕ لەگەڵکردنیشی کوفرە».

## بَابُ التَّثَبُّتِ فِي الْفِتْنَةِ

### باسی دامەزراوی لە کاتی بەڵا و فیتنەدا

٧٨٨. عَنْ أَبِي مُوسَى الْأَشْعَرِيِّ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ بَيْنَ يَدَيِ السَّاعَةِ فِتَنًا كَقِطَعِ اللَّيْلِ الْمُظْلِمِ، يُصْبِحُ الرَّجُلُ فِيها مُؤْمِنًا، وَيُمْسِي كَافِرًا، وَيُمْسِي مُؤْمِنًا، وَيُصْبِحُ كَافِرًا، الْقَاعِدُ فِيها خَيْرٌ مِنَ الْقَائِمِ، وَالْقَائِمُ فِيها خَيْرٌ مِنَ الْمَاشِي، وَالْمَاشِي فِيها خَيْرٌ مِنَ السَّاعِي، فَكَسِّرُوا قِسِيَّكُمْ، وَقَطِّعُوا أَوْتَارَكُمْ، وَاضْرِبُوا بِسُيُوفِكُمُ الْحِجَارَةَ، فَإِنْ دُخِلَ عَلَى أَحَدِكُمْ، فَلْيَكُنْ كَخَيْرِ ابْنَيْ آدَمَ».

ئەبو مووسای ئەشعەری ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «بەڕاستی بەر لە هاتنی قیامەت بە ماوەیەکی کەم فیتنە و ئاژاوەیەك بەرپا دەبێت وەک شەوەزەنگ دونیا تاریک دەبێت، پیاو هەیە بەیانی موسوڵمانە و ئێوارە کافرە، وە هەیە ئێوارە موسوڵمانە و بەیانی کافرە، ئەو کەسەی لەو کاتەدا دانیشتووە چاکترە لەوەی کە بەپێوەیە، وە ئەو کەسەی کە لەو کاتەدا بەپێوەیە چاکترە لەوەی کە ڕێ دەکات، وە ئەو کەسەی کە لەو کاتەدا ڕێ دەکات چاکترە لەوەی کە هەوڵ دەدات (بۆ هەڵگیرساندنی و دەستی تێدا هەیە)، جا تیروکەوانەکانتان بشکێنن و ژێی کەوانەکانتان بپسێنن و بە شمشێرەکانتان لە بەرد بدەن (بۆئەوەی کوول ببن یان بشکێن)، جا ئەگەر کەسێ هاتە نێو ماڵی یەکێکتانەوە و هێرشی بۆ هێنا و ویستی بیکوژێت، ئەوە با وەک چاکترینی هەردوو کوڕەکەی ئادەم بێت»».

## بَابُ إِذَا الْتَقَى الْمُسْلِمَانِ بِسَيْفَيْهِمَا

### باسی ئەوەی کە دوو موسوڵمان بە شمشێرەکانیان بەرەوڕووی یەکدی ببنەوە

٧٨٩. عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «مَا مِنْ مُسْلِمَيْنِ الْتَقَيَا بِأَسْيَافِهِمَا،

إِلَّا كَانَ الْقَاتِلُ وَالْمَقْتُولُ فِي النَّارِ».

ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: «هەر دوو موسوڵمانێک کە بە شمشێرەکانیان ڕووبەڕووی یەکدی دەبنەوە ئەوە بکوژ و کوژراوەکە هەردووکیان لە ئاگردان».

## بَابُ كَفِّ اللِّسَانِ فِي الْفِتْنَةِ

### باسی پاراستنی زمان لە کاتی فیتنە و ئاژاوەدا

٧٩٠. عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «تَكُونُ فِتْنَةٌ تَسْتَنْظِفُ الْعَرَبَ قَتْلَاهَا فِي النَّارِ، اللِّسَانُ فِيهَا أَشَدُّ مِنْ وَقْعِ السَّيْفِ».

عەبدوڵڵای کوڕی عەمرٍ ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «فیتنە و ئاژاوەیەک بەرپا دەبێت عەرەب دەفەوتێن، کوژراوەکانی ئەو فیتنە و ئاژاوەیە لە ئاگردان، زمان تێیدا لە شمشێروەشاندن کاریگەرترە».

٧٩١. عَنْ أَبِي الشَّعْثَاءِ ﷺ قَالَ: قِيلَ لِابْنِ عُمَرَ ﷺ: إِنَّا نَدْخُلُ عَلَى أُمَرَائِنَا فَنَقُولُ الْقَوْلَ: فَإِذَا خَرَجْنَا قُلْنَا غَيْرَه، قَالَ: كُنَّا نَعُدُّ ذَلِكَ عَلَى عَهدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، النِّفَاقَ.

ئەبو شەعساء ﷺ دەڵێت: بە ئیبن عومەر ﷺ گوترا: ئێمە کاتێك دەچینە لای کاربەدەستەکانمان قسەیەک دەکەین و کاتێك دێینە دەرەوە قسەیەکی دیکە دەکەین، (ئیبن عومەر ﷺ) گوتی: ئێمە لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا ﷺ ئەوەمان بە دووڕوویی هەژمار دەکرد.

## بَابُ الْعُزْلَةِ

### باسی دوورەپەرێزی

٧٩٢. عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ: أَنَّ رَجُلاً أَتَى النَّبِيَّ ﷺ، فَقَالَ: أَيُّ النَّاسِ أَفْضَلُ؟

فَقَالَتْ: يَا رَبِّ أَكَلَ بَعْضِي بَعْضًا، فَجَعَلَ لَها نَفَسَيْنِ: نَفَسٌ فِي الشِّتَاءِ، وَنَفَسٌ فِي الصَّيْفِ، فَشِدَّةُ مَا تَجِدُونَ مِنَ الْبَرْدِ مِنْ زَمْهرِيرِها، وَشِدَّةُ مَا تَجِدُونَ مِنَ الْحَرِّ مِنْ سَمُومِها».

ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «ئاگر لەلای پەروەردگاری سکاڵای کرد و گوتی: ئەی پەروەردگارا (لە گەرمی و بەتینیدا) بەشێکم بەشەکەی دیکەی خوارد، بۆیە (خوا) مۆڵەتی دوو نەفەسی پێ دەدات: نەفەس و هەناسەدانێک لە زستاندا و هەناسەدانێکیش لە هاویندا، جا ئەو ساردییە توندوتیژەی کە دەیبینن لە تەبەقە و بەشە هەرە ساردەکەی زەمهەریرە، وە ئەو گەرمییە توند و بەتینە کە (لە هاویندا) دەیبینن ئەوە لە بەشە گەرمەکەی سەمومە».

## بَابُ صِفَةِ الْجَنَّةِ



### باسی سیفەتەکانی بەهەشت

٨٦٦. عَنْ أَبِي هرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه ﷺ، يَقُولُ اللَّه ﷻ: «أَعْدَدْتُ لِعِبَادِيَ الصَّالِحِينَ، مَا لَا عَيْنٌ رَأَتْ، وَلَا أُذُنٌ سَمِعَتْ، وَلَا خَطَرَ عَلَى قَلْبِ بَشَرٍ»، قَالَ أَبُو هرَيْرَةَ: وَمِنْ بَلْه مَا قَدْ أَطْلَعَكُمُ اللَّه عَلَيْه، اقْرَءُوا إِنْ شِئْتُمْ: {فَلَا تَعْلَمُ نَفْسٌ مَا أُخْفِيَ لَهُم مِّن قُرَّةِ أَعْيُنٍ جَزَاءً بِمَا كَانُوا يَعْمَلُونَ} السجدة: ١٧، قَالَ: وَكَانَ أَبُو هرَيْرَةَ يَقْرَؤُها: مِنْ قُرَّاتِ أَعْيُنٍ.

ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «خوا ﷻ دەفەرموێت: بۆ بەندە چاکەکارەکانم شتگەلێکم ئامادە کردووە کە هیچ چاوێک نەیبینیوە و هیچ گوێیەک نەیبیستووە و بە خەیاڵ و دڵی هیچ کەسێکیشدا نەهاتووە»، ئەبو هورەیرە گوتی: واز لەوە بێنن کە خوا بۆی باس کردوون لە نیعمەتەکانی بەهەشت، ئەو ئایەتە بخوێننەوە ئەگەر ویستتان: {فَلَا تَعْلَمُ نَفْسٌ مَا أُخْفِيَ لَهُم مِّن قُرَّةِ أَعْيُنٍ جَزَاءً بِمَا كَانُوا يَعْمَلُونَ}، واتە: ئەمجا هیچ کەس نازانێت چی شاراوەتەوە

بۆیان لە (بەهەشتدا کە هۆی) گەشبوونی چاوەکانن، ئەم پاداشتە (دەدرێنەوە) بەهۆی ئەو کردەوانەی کە کردوویانە». ڕاوی گوتی: ئەبو هوڕەیرە بە (قُرَّاتِ أَعْيُنٍ) دەیخوێندەوە.

٨٦٧. عَنْ مُعَاذِ بْنِ جَبَلٍ ﷺ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، يَقُولُ: «الْجَنَّةُ مِائَةُ دَرَجَةٍ، كُلُّ دَرَجَةٍ مِنْها مَا بَيْنَ السَّمَاءِ وَالْأَرْضِ، وَإِنَّ أَعْلَاها الْفِرْدَوْسُ، وَإِنَّ أَوْسَطَها الْفِرْدَوْسُ، وَإِنَّ الْعَرْشَ عَلَى الْفِرْدَوْسِ، مِنْها تُفَجَّرُ أَنْهارُ الْجَنَّةِ، فَإِذَا مَا سَأَلْتُمُ اللَّهَ فَسَلُوه الْفِرْدَوْسَ».

موعازی کوڕی جەبەل ﷺ دەڵێت: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: «بەهەشت سەد پلەیە هەر پلەیەکی نێوانی ئاسمان و زەوییە، وە بەرزترینیان پلەی فیردەوسە، وە نێوەڕاستەکەیشیان فیردەوسە، وە عەرش لەسەرووی فیردەوسە، ڕووبارەکانی بەهەشت لەوێوە سەرچاوە دەگرن، جا هەر کات داواتان لە خوا کرد و لە خوا پاڕانەوە ئەوە داوای فیردەوسی لێ بکەن».



٨٦٨. عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «الْكَوْثَرُ نَهرٌ فِي الْجَنَّةِ، حَافَّتَاه مِنْ ذَهَبٍ، مَجْرَاه عَلَى الْيَاقُوتِ وَالدُّرِّ، تُرْبَتُه أَطْيَبُ مِنَ الْمِسْكِ، وَمَاؤُه أَحْلَى مِنَ الْعَسَلِ، وَأَشَدُّ بَيَاضًا مِنَ الثَّلْجِ».

ئیبن عومەر ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «کەوسەر ڕووبارێکە لەنێو بەهەشتدا، لێوار و قەراغەکانی لە زێڕن، ڕاڕەوەکەی لە یاقووت و دووڕ و گەوهەرە، خاکەکەی لە میسک بۆنخۆشترە، ئاوەکەی لە هەنگوین شیرینتر و لە بەفر سپیترە».

٨٦٩. عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «الْمُؤْمِنُ إِذَا اشْتَهى الْوَلَدَ فِي الْجَنَّةِ، كَانَ حَمْلُه وَوَضْعُه وَسِنُّه فِي سَاعَةٍ وَاحِدَةٍ، كَمَا يَشْتَهِي».

ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «ئەگەر بڕوادار لەنێو بەهەشتدا حەزی لە منداڵ بوو، ئەوە دووگیانبوون و منداڵبوون و تەمەنەکەی (بوون بە سی و سێ ساڵ) لە یەک ساتدا دەبێت، هەر چۆنێک کە

حەزی لێ بێت و پێـخۆش بێت».

٨٧٠. عَنْ أَبِي هرَيْرَةَ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه ﷺ: «مَا مِنْكُمْ مِنْ أَحَدٍ إِلَّا لَه مَنْزِلَانِ: مَنْزِلٌ فِي الْجَنَّةِ، وَمَنْزِلٌ فِي النَّارِ، فَإِذَا مَاتَ، فَدَخَلَ النَّارَ، وَرِثَ أَهلُ الْجَنَّةِ مَنْزِلَه، فَذَلِكَ قَوْلُه تَعَالَى: {أُولَئِكَ هـمُ الْوَارِثُونَ} المؤمنون: ١٠»».

ئەبو هورەیرە ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «بێگومان هەر کەسێک لە ئێوە لە قیامەت دوو شوێنی هەیە: شوێنێک لە بەهەشت و شوێنێکیش لە دۆزەخ، جا کاتێک ئەو کەسە مرد و ڕۆیشت بۆ دۆزەخ، ئەوە خەڵکی بەهەشت شوێنەکەی دیکەی لە بەهەشت بە میرات دەگرن، ئەوەیە مانای ئەو ئایەتەیە کە خوای بەرز و بڵند دەفەرموێت: {أُولَئِكَ هـمُ الْوَارِثُونَ}، واتە: هەر ئەوانەن میراتگران».



الحمدلله الذي بنعمته تتم الصالحات

# ناوەڕۆک

